يوسف الحاج أحمد

# قوربانیەکانی شەیتان





وەرگێڕانی

هێمن موحەممەد عەلی

نەوزاد ڕەزا ڕۆستەم

يوسف الحاج أحمد

# قوربانیەکانی شەیتان

- ئەم کتێبە بخوێنەرەوە پێش ئەوەی ببیت بە قوربانی شەیتان‌و پیلانەکانی
- بەختەوەر ئەو کەسەیە پەند لە کەسانی تر وەربگرێت

وەرگێڕانی

هێمن موحەمەد عەلی      نەوزاد ڕەزا ڕۆستەم

**چاپی دووەم – ٢٠٠٩**

**لەسەر ئەرکی کتێبخانەی (مەحوی) چاپکراوە**

## پێشەکی

### تەنها بەناوی خودا

﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا ﴾ .

بڕوا بوون بە جیهانی نادیارو پەنهان، ئەوەی بە (عالم الغیب) ناسراوە لە دیدی ئیسلامیدا لە گرێدراوی زۆرێك لە بیروباوەڕەکانی تری مرۆڤی موسڵمانە، هەر لە بڕوابوون بە خودای پەروەردگارەوە بیگرە تاوەکو ڕۆژی دوایی‌و قەزاو قەدەر، جیهانێك کە بەرهەست نیە، لەگەڵ ئەوەشدا بەڵگەو ڕێگەی سەلماندنی فرەو بێ ئەژمارەو ﴿ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴾ یش بە پێی دەقی قورئان یەکێکە لە سیماکانی مرۆڤی (متقي)..

پێشکەوتنە سەرسوڕهێنەرەکانی جیهانی هەنووکەش شتی وای بۆ بەدیهێناوین کە باوەڕبوون بە جیهانی پەنهان‌و ئەودیو ماددەی ئاسانتر کردووەو تواناکانی مرۆڤیش (وەك بەدیهێنراوێکی خودایی) ئەمڕۆ لە ڕادەیەکدایە، کە بۆ مرۆڤەکانی پێشوو گەر باسبکرایە!! وەکو موعجیزە بۆیان دەڕوانی‌و هیچ کات باوەڕیان پێی نەدەکرد، بەڵام ئەمڕۆ ئێمە لە سایەیدا دەژین‌و بە چاوی خۆمان دەیانبینین‌و هەستیان پێدەکەین.. تۆڕەکانی ئەنتەرنێت‌و مۆبایل‌و سەتەلایت‌و گەیاندن‌و ڕاگەیاندن‌و چاودێری کردن‌و ڕێکخستنیان بەو وردییە..... هتد، لە لایەن مرۆڤێکەوە کە خودای گەورە بە ﴿ وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ ناوی بردووە، بەڵگەی توانایی خوداو ڕەنگدانەوەی ناوو سیفەتەکانێتی.. مرۆڤێك کە دروستکراوی خودای گەورەیە لە توانایدایە چاودێری پەیوەندییەکانی مرۆڤ بکات‌و دەنگیان تۆمار بکات‌و بشزانێ لەگەڵ کێداو چەندێك قسەی کردووە.. سەرەڕای ئەوەی بە سەدان ملیۆن پەیوەندی لە ئارادایە، بۆچی گومان بکرێ لەوەی خودای گەورە بەتوانایە لە نووسین‌و تۆمارکردن‌و پیشاندانی هەموو کردارو ڕەفتارەکانی مرۆڤ؟!! بە پێی سەرنجدانم لە هەندێ ئایەتی قورئانی هاوێنەی ﴿ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ و ﴿ فَمَن يَعْمَلْ

مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ۝ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ ﴾ و.. هتد، تێدەگەم ئەم ئایەتانەو هاوشێوەکانی واتای ئەوە بگەیەنێت مرۆڤ بە وێنەی زیندوو ڕەفتارەکانی خۆی پیشان بدرێ، ئەمە سەرەڕای نووسینو تۆمارکردنو.. هتد، کە ئەوکات بوارێك نامێنێتەوە بۆ نکوڵیو ئینکاریکردن، هەر بۆیە وا باشە مرۆڤ لە خودا بپارێتەوە کە لە ڕۆژێکدا نهێنیەکان ئاشکرا دەبن ﴿ يَوْمَ تُبْلَى ٱلسَّرَآئِرُ ﴾ خودای گەورە ڕیسوای نەکاتو نهێنیەکانی بەدەرنەخات بۆ ئامادەبووانو بە لێبوردنی خۆی بیانپۆشێ..

★ جیهانی جنۆکەو شەیتانەکان، جیهانێکی تایبەتو سەرسوڕهێنەرەو گفتوگۆو تاوتوێکردنی زۆری دەوێتو بابەتێکیشە جێی یەك دەنگی هەموو ئاینەکانەو بە دەقو شێوازی جۆراوجۆر ئاماژەی پێکراوەو لە جیهانی ئەمڕۆشدا بابەتی قسەکردن لەگەڵ ڕۆحەکانو ئەوەی بە (تحضیر الأرواح) دەناسرێ، بە تایبەت لای ئەوروپییەکان، دوورنیە جۆرێکی پەیوەندی بێت لەگەڵ جیهانی جنۆکەو شەیتانەکانو ئەوان بە گیان (روح) دەریدەبڕن.. ئەمەش بەدواداچوونو توێژینەوەی قوڵو زانستی دەوێ، لە بیروبۆچوونو دیدی ئیسلامییشدا باوەڕبوون پێیانو بوونی کاریگەریی خراپی شەیتانو دارو دەستەکەی بەشێکە لە ئیمانو بە سەدان دەقی جۆراوجۆری قورئانو فەرمودەی لەسەر هاتووەو زۆرێك لەو بەڵگانەش لەم کتێبەدا بەرچاو دەکەون.. لە دیدو تێڕوانینی ئیسلامیدا شەیتانەکان توانای هاندانی خراپەو خراپەکارییان هەیەو تاوانو گوناهەکانیش ویستێکی لە پێشینەو بەردەوامی ئەوانەو بەردەوامیش لە ناخەوە پاڵنەری مرۆڤن بۆ ئەنجامدانیان، لە ڕێی جوانکردنو ڕازاندنەوەیانو لە ڕێی ئەو حەزو غەریزانەی لە مرۆڤدا سروشتیو خواڕسکن، حەزو غەریزەیەك کە دەبێ ڕێکبخرێو سنورێك بۆ تێرکردنیان دابنرێ. ئەگەرنا ژیانی مرۆڤ پڕدەکەن لە چەرمەسەریی و نەهامەتی..

★ئەم کتێبەی بەردەستیشتان کە لە زمانیو بەدەستکارییەوە وەرگێڕراوە لە لایەن بەڕێزان (کاك هێمن شێخانی) و (م. نەوزاد)ەوە، کتێبێکی بەنرخو پڕبایەخە، سەرەڕای ئەوەی هیچ بەرهەمێکیش بێ کەمو کورتی نیە.

سەبارەت بە شەیتانو فرتو فێڵەکانیو ئەو ڕێو شوێنانەی خۆیو داروەدستەکەی دەیگرنە بەر، بۆ گومڕاکردنو سەرلێشێواندنو لەڕێ لادان، سەرەڕای ئاماژەدان بە سیحرو چارەسەرکردنیو شەیتان پەرستانو.. هتد.

* ڕوویەکی تری گرنگو جێ بایەخ لەم کتێبەدا هێنانی کۆمەڵێك بەسەرهاتو چیرۆکی واقیعیو ڕووداوە، کە نوسەر بە ﴿قوربانیەکانی شەیتان﴾ ئەژمارو ناوزەدی کردوونو بەرەنجامی شەیتانو ختوکەو وەسوەسەکانی ئەون..

لە ڕاستیشدا ئەو ڕووداوانەو هاوشێوەکانیان ڕۆژانە لێرەو لەوێ ڕوودەدەنو بوونەتە مایەی کێشەو سەرئێشە بۆ مرۆڤو دەرخەری ئەوەن کە مرۆڤ ئامادەیی ئەوەی تێدایە (گەر داماڵرێ لە بیروباوەڕو بەهاو ڕەوشت) بۆ ئەوەی ببێتە خراپترین دڕندەو چڵێسترین گیاندارو بە قێزەونترین ڕەفتار هەستێ، هۆکارە نوێیەکانی سەردەمیش ئاسانکاری بۆ مرۆڤ لەم ڕووەوە دەستەبەر دەکات!! سەرجەمی ئەو بەسەرهاتانە ئەوە دەسەلمێنن گەر مرۆڤ خۆی بداتە دەستی حەزو ئارەزووە شەیتانیەکانو خواستە فرەکانی خۆیو چێژە جۆراوجۆرەکانی ـ بەبێ ڕەچاوکردنی ماف بەرامبەرو ڕێکخەرە ڕەوشتیەکان ـ ئەوا ستەم دەکاتو مرۆڤی دی دەکوژێو ستەم لە منداڵو خانەوادەو کەسوکاری خۆیو مرۆڤ بە گشتی دەکاتو ئامادەیە لە پێناوی ژیانو حەزی خۆیدا ژیانی خەڵکی تێکبداو بۆ گەیشتن بە ئارەزووەکانی ناوو ناوبانگی کەسانی تر بزڕێنێو لەکەداریان بکات!! ئەم بەسەرهاتانە دەریدەخەن زۆرن ئەوانەی بە ناوی ئەوینو خۆشەویستیو خواستی هاوسەرگیریو زەواجەوە خەڵکی دەکەنە نێچیری خۆیانو لە پەلوپۆیان دەخەنو کەسێتیان دەڕوشێننو کەسێتی مەعنەویان دەکوژنو پاشانیش دەیانەوێ وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەرچنو ئەوی ترو بەرامبەریش وەك قوربانیەك بەجێبهێڵن، بەڵام زۆرجار ئەوانیش بە جۆرێك لە جۆرەکان تووشی داوی خۆیان دەبنو لە ژیانێکی پڕ ئازارو چەرمەسەریدا دەژینو بەردەوامیش ویژدانیان ئازارین دەدا، یان دەبنە پەندی زەمانەو ڕیسوا دەبن.. جگە لە هەڕەشەکانی پەروەردگارو سەرەنجامێ کە چاوەڕوانی ستەمکارانە!!

*زۆربەی هەرە زۆری بەسەرهاتەکان گرێدراوی مادده سەرخۆشکەرو سڕکەرەکانن، یاخود بەرەنجامی هێرشو شاڵاوە پڕ لەتاوانەکانی داگیرسانی غەریزەی سێکسینو دواجار دەستدرێژی کردنە سەر منداڵو زیناو زینای مەحرەمی لێ کەوتۆتەوە، کە ئەم دوانەش (مادده سەرخۆشکەرو سڕکەرەکانو موخەدەراتو شاڵاوی غەریزەی سێکسی) لە کۆمەڵگەی ئێمەش قوربانیەکانی بەدەرکەوتوونو ڕۆژانە گوێبیستی ئەو جۆرە بەسەرهاتانە دەبین، گەر لێپرسراوو خەمخۆرانی ئەم کۆمەڵگەیە لە بیری چارەسەرێکدا نەبن، ئەوا

کۆمەڵگەکەمان بەرەو لەرزۆکیو دارمانی زیاتر دەچێ.. دواتر سەرمایەی ڕەمزیمان لەدەست دەدەینو بانگەشەکارانی بەناو ئازادیو بەکرۆك بەدڕەوشتی هیچ شتێکیان لەدەست نایەو وزەو سەرمایەیەکی زۆریشی دەوێ تاوەکو بارێکی ئاساییو ساز بڕەخسێنرێ.

لە کۆتاییدا دەستخۆشیم هەیە بۆ هەر دوو وەرگێڕی لاو، وا دەزانم کارێکی جوانیان ئەنجام داوەو خزمەتێکی باشیان کردووە، هیوادارم لە داهاتوودا بەرهەمی بەپێزتریش پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی بکەن، بە تایبەتی لە بواری کۆمەڵایەتیو ئاینیدا.

فاتیح سەنگاوی

چەمچەماڵ٢٠/٧/٢٠٠٨

## بەناوی خودای گەورەی میهرەبان

## پێـــشەکـــی

**إن الحمدلله تعالى، نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسناومن سيئات أعمالنا، من يهده لله فلا مضل لەومن يضلل فلا هادى له، وأشهد أن لا اله الا اللەوحده لاشريك له، وأشهد أن محمدا عبدەورسوله، أرسله بالهدى ودين الحق ليظهره على الد ين كله ولو كره الكا فرون، وبعد:**

بێگومان جەنگی نێوان نەوەکانی ئادەمو ئیبلیسی دوژمنی خودا ناشوبێکی دێرینە، سەرەتـای ئەم جەنگەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی خودای گەورە ئادەمی دروســتکردو فەرمانی بە فریشتەکان کرد کە کڕنوش (**سجدە**) بۆ ئادەم بەرن، جاهەمـوویان فەرمایشتەکەیان بەجێهێنا، تەنها ئیبلیس نەبێ (نەفرەتی خودای لێبێت) ئەم کارەی نـەکردوو خودای بالآدەستیش لە ڕەحمەتی خۆی بێ بەری کردوو لە بەهەشت دەریکرد، خودای گەورە دەفەرمویێت:﴿ قَالَ اخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٨﴾ ﴾ الاعراف. واتە:(خودا فەرمووی: لەبەهەشت دەرچۆرە دەرەوە بەسەر شۆڕیو ڕیسوایی‌و دەرکراوی، سوێند بەخودا ئەو کەسەی شوێنت کەوت لەوان، ئەوە بێگومان دۆزەخ پڕ دەکەم لە نێوەهەمووتان).دوا بەدوای ئەم دەرکردنە داوای مۆڵەتی کرد، وەکو خودای مەزن دەفەرمویێت :﴿ قَالَ أَنظِرْنِي إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤﴾ ﴾الاعراف. واتە:(شەیتان ووتی: داواکارم کەمۆڵەتم بدەیت تا ئەو ڕۆژەی کە هەموو نەوەکانی ئادەم زیندوو دەکرێنەوە).

جا کەوەڵامی داواکارییەکەی درایەوە، سوێندی خوارد نەوەکانی ئادەم سەرگەردان بکات، وەکو خودای کاربەجێ دەفەرموویێت:﴿ قَالَ رَبِّ بِمَا أَغْوَيْتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾ الحجر.واتە: (ئیبلیس بەبوغزو کینەوحەسادەتەوە، ووتی: پەروەردگارم، مادەم بەهۆی ئەم ئینسانەوە منت سەرلێشێواو

کرد، شەرت بێت لەزەویداهەمووی گوناهو لادانو تاوانێکیان لە لاجوانو شیرین بکەمو هەر هەموویان سەر لێشێواوو سەرگەردان بکەم، بێجگە لەبەندە پوختەو دڵسۆزەکانی خۆت نەبێت (چونکە دڵیان بەباوەر بەتۆو یادی تۆوە ئاوەدانە، هەوڵو کۆششی من بۆ وێڵ کردنیان ناکامە) ). بەڕاستی شەیتان هەموو دەرگاکانی خراپەی کردۆتەوە، وەلە هەر لایەکەوە بتوانێ هێرش بکات بۆ سەر مرۆڤ دەیکاتو جۆرەها ڕێگە بەکاردێنێ، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ الأعراف. واتە:(شەیتان ووتی: بەهۆی ئەوەی کەتۆ منت گومڕاو سەرگەردان کرد، ئەوە سوێند بێت منیش لەڕێگە ڕاستەکەتدا بۆیان دادەنیشم تا لایان بدەم * پاشان سوێند بەخودا لە بەردەمیانەوە، لەپشتیانەوە، لەلای ڕاستیانەوە، لەلای چەپیانەوە، بۆیان دێمو ( دنیایان لاخۆشەویست دەکەمو گومانیان دەربارەی قیامەت لا دروست دەکەم) و دەستت ناکەوێت زۆربەیان سوپاس گوزاربن).

لەو ڕۆژەوە ئەم شەڕە هەڵگیرسا، گومانی تێدانیە کە ئیبلیس سەرکەوتنێکی وەهای بەدەست هێنا کە چاوەڕوان نەدەکرا، بەجۆرێك کە خەڵکی لە خشتە بردو هەڵی خەڵەتاندن، لەمەشدا چەندەها ڕێگاو چاوو ڕاوو فێڵی بەکارهێنا تا لەڕێی ڕاست ڕەتاندیانیو بەرەو هەڵدێری بردن.

سەیر نە بێ بەلاتەوە کەئەبیستی هەندێ گرۆهو خەڵكو نەتەوە دار ئەپەرستن، هەندێکی تر ڕۆژو مانگ، هێندێ تریش مانگا دەپەرستن، کەسانێکیش هەن مشك دەپەرستن، میللەتی وەهاش هەیە ئەوەندە پیسو چەپەڵن عەورەت ئەپەرستن. هەندێ تریش هەن شەیتان ئەپەرستنو کردویانە بە پەرستراوو پەروەردگاری خۆیان، بەهاو نرخی بۆ دائەنێنو لێی ئەترسن، سروتی ئاینی بۆ ئەنجام ئەدەن، قوربانی بۆ دەکەنو بۆ ڕەزامەندیو خۆشەویستی ئەو هەوڵئەدەن!!پەنا بەخودا .

لەم پەرتوکەی بەردەستت زۆرێك لەوشتانە بەدی ئەکەیت کە ڕوون کراوەتەوە، بۆ ئەوەی تۆی بەڕێز لەباری ئامادە باشیدا بیت، بۆ ڕوو بە ڕووبوونەوە لەجەنگێکدا، کەبەڵگە نەویستەو دوژمنەکەش شەیتانێکی بەنەفرەت کراوە، کە بەردەوام لە بۆسەدایە بۆت، ئاگادار بونیشت لەو شتانەی باس دەکرێت لەم کتێبەدا، سەرکەوتوت دەکات ( بەپشتیوانی خودا ) دوژمنەکەشت سەر شۆڕو دۆڕاو دەبێت.

خوێنەری ئازیز تۆش لەگەڵ مندا بڵێ: پەروەردگارا ئەگەر دوژمنێكت بەسەردا زاڵ كردوین كە هاوشێوەكانی ئێمە دەبینن‌و ئێمە ئەو نابینین، خودایە بێ بەری بكەی لە ئێمە،وەك چۆن ئەوت بێ بەش كرد لە بەزەیی خۆت، نێوانی ئێمەو ئەو دوور بخەیتەوە بە ئەندازەی نێوان ئەوو بەخشندەیی‌و لێبوردەیی خۆت، خودایە دەسەڵات‌و ڕێبازەكەی ئەو بەسەرماندا زاڵ نەكەیت، ئەی خودای بەخشندەو باڵادەست ، شاعیر ڕاستی فەرمووە كە ئەڵێ:

ئـەزموونی مـن لەگـەڵ چوارانە زاڵ بونیـان ئەسـتەم بـوو
ئەگــەر سەركەشــی خــۆم‌و قورســی ئــەزموون نەبوایــە
ئیـــــبلیس‌و دونیـــــاو نەفـــــس‌و ئـــــارەزوو
چـــــۆن ڕزگـــــاربم دوژمنـــــن هەمـــــوو
ئیـــــبلیس لـــــە ڕێـــــی فەتـــارەتدایـــــە
نەفـــــسی ئەممـــــارەش پـــــڕ لـــــە هیـــــوایە
ئـــارەزووش بانگـــــی بـــــۆ یـادەوەریـــــــو
لـــە بـــۆ تـــاریكی‌و ســـەراب‌و چـــاوو ڕایـــە
دونیـــای ڕەنگـــاڵەش ئەڵـــێ بـــاڵای مـــــن
جـــــل‌و شـــانازی‌و جـــــوان‌و بەهـایـــــە

داواكارم كە خودای خاوەن میهرو میهرەبان سەركەوتنمان بۆ بنوسێ لەم كارەماندا، سودی لە بۆ خۆمان‌و مسوڵمانان هەبێ‌و لەو كارانەشی ئەژمار بكات كە تەنهاو تەنها لەبەر خاتری زاتی پاكی خۆی ئەنجام دراون، پاشان سڵاوو درودی خوداش لەسەر ڕێ نیشاندەرو مامۆستامان (محمدی كوڕی عبدالله) بێت (ﷺ).

خزمەتكاری سونەتی پێغەمبەر (ﷺ)
یـوسف الحاج أحمـد

# بەشی یەکەم

## شەیتـــان کێیــــە؟

ووشەی **(الشياطين)** کۆکراوەی **(شيطان)**ەو لەسەروەزنی **(فيعال)**ەو لە**(شطن)**: بەواتای دوورکەوتنەوە، یان دورکەوتنەوە لە باشە هاتووە، ئەویش بیروڕای ئەوانەیە کە (ن) بەپیتێکی بنەڕەتی دانەنێن لەووشەکەدا، هەروەها بیروڕایەکی تر هەیە ئەڵێت: **(الشيطان)** لە سەر وەزنی **(فعلان)**ەو لە**(شاط، يشيط)** وە هاتووە، بەواتای: ماندوو بوو، هەروەها سوتێنرا، ئەمەش بۆ چوونی ئەوانەیە کە (ن) بە پیتی زیادە ئەزانن لەووشەکەدا.

* ئەزهەری ئەڵێ: بیروڕای یەکەم نزیکترە لەشەیتانەوە، هەروەها بەشێوەیەکی گشتی؛ لوت بەرزو پڕلە خراپەو سەرپێچیو فێڵە، لەتاوانو ستەمدا ڕۆچووەو لاسارە، هەموو تاوانبارێکی یاخی لەمرۆڤو جنۆکەو شەیتانیشدا تایبەتمەندێتیو گشتێتی هەیە. بە لاساری شەیتانەکان ئەوترێت (عفريت)، عفریتیش: خراپەکارو پیسو بەلایە، هەروەها جنۆکە کە بگاتە ئاستێك لە بێ باوەڕیو ستەمو هێزو سنور بەزاندن، پێی دەوترێت: (عفريت).

* ئەبو عومەری کوڕی عەبدولبیڕ دەڵێ: جنۆکە لای زانایانی زمان دابەشکراوە بۆ چەند ئاستێك: ئەگەر باسی جنۆکەی ئاسایی بکەن، دەڵێن:( **جني**)، ئەگەر مەبەستیان ئەوە بێ کە لەگەڵ خەڵکدا نیشتە جێیە دەڵێن: ( **عامر** )، ئەوەی خۆی پیشانی منداڵ ئەدات پێی دەڵێن: **(أرواح)**، ئەگەر خراپو پیس بوو ئەوە **(شيطان)**ە، ئەگەر لەوە خراپتر بوو ئەوە **(مارد)** ە، لەم پلەیەش بەرزتر بۆوە ئەوە**(عفريت)**ە، گەورەی هەموو جنۆکەکانیش ( **إبليس** )ە، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓ ﴿٥٠﴾ ﴾ الكهف . واتە:(هەموو کڕنوشیان برد جگە لە ئیبلیس نەبێت کەلە پێڕی جنۆکەکان بوو بۆیە لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو).. **(إبليس)** وەزنەکەی ( **إفعيل** )ەو لە ( **إبلاس** )ەوە وەرگیراوە، بەواتای (بێ هیوایی لەبەزەیی خودای گەورە ) دێت. ئیبن عەباس ئەفەرمووێت:

(ئیبلیس خودای گەورە بێبەری کرد لە چاکەو کردی بەشەیتانی نەفرەت لێکراو، وەك سزایەك بۆ لەرێ لادانەکەی).

★ ئیبن عەباس ئەفەرموویّت:(ئیبلیس پێش ئەوەی ئەو تاوانە بکات ناوی ( **عەزازیل**) بووە، لە دانیشتوانی سەر زەوی بووە، لە هەموو فریشتەکان کۆششی زیاتر بووەو زانیاری زۆر بووە، ئەمەش‌وای لێکرد خۆی بەگەورە بزانێو فیز پەیدا بکات، لەتاقمێکیش بووە ناوی (جنۆکە) بووە.

★ ئیبن عەباس ئەفەرموویّت: لە فریشتەکاندا بەشێك هەبوون پێیان ئەوترا: جنۆکە (**الجن** ) ئیبلیس یەکێك لەوان بوو، نێوانی ئاسمانو زەوی بەرێوە ئەبرد، بەلاّم گومڕا بوو، خوداش کردی بەشەیتانی نەفرەت لێکراو .

★ حەسەن ئەڵێ: ئیبلس هەرگیز یەکێك نەبووە لە فریشتەکان، بەڵکو بنەڕەتی (**أصل** ) جنۆکە بووە، وەکو چۆن ئادەم بنەڕەتی (**أصل**)ی مرۆڤە..ووتەی پەسەند خودا باشتر دەزانێ، ئەو ووتەیەیە کە ئیبن زەید ووتویەتی: لە ڕاستیدا ئیبلیس باوکی جنۆکەیە، وەکو چۆن ئادەم باوکی مرۆڤە، بەڵگەش بۆ ئەمە خودای گەورە لە قورئاندا بۆی باسکردوین کە ئیبلیسی دروستکردووە لە ئاگرێکی بڵێسەدار، بەلاّم فریشتەکان لە شتێکی لەو جۆرە دروستنەکراون، بەپێی ئاماژە قورئانیەکان، هەروەها بەم پێیە ئیبلیس لە جنۆکەیە، جاشیاو نیە ــ **غیر الجائز** ــ کە ڕەچەڵەکی بدەینە پاڵ بنچەیەکی تر کە خودا باسی نەکردبێ، لەلایەکی ترەوە شەیتان وەچەی هەیە بەلاّم فریشتە ئەوەیان نییە.

## ئایا زانست بەبــــێ کردار ســـــــــودی هەیە؟

نەخێر، جارێکی دیش نەخێر، بەڵکو ئەبێتە بەڵگەیەك بەسەر خاوەنەکەیەوە تا ڕۆژی دوایی، ئالێرەوە پاش خۆ بەگەورە زانینی، فەرمانی پەروەردگار دەرچوو بەدەرکردنو نەفرەت لێکردنی، وەکو خودای گەورە دەفەرمویّت: ﴿ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ٣٤ وَإِنَّ عَلَيۡكَ ٱللَّعۡنَةَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ٣٥ ﴾الحجر. واتە:(خودا فەرمووی: چونکە لە فەرمانی من سەرپێچیت کرد دەبێت لەم شوێنە نەمێنیت، کە بەهەشت، یان ئاسمانە، کەواتە دەرچۆ لێرە، چونکە بەڕاستی تۆ نەفرین لێکراویت ★ بەڕاستی نەفرینی خودات لەسەرە تا ڕۆژی دوایی).

پاشان ئیبلیس دەرکرا لە بەهەشت، ئەمەش لە ئەنجامی خۆ بەگەورە زانینو کڕنۆش نەبردنی بۆ ئادەم، ئەوجا ئادەم نیشتەجێ بوو لە بەهەشتدا، پێش ئەوەی ئیبلیس دابەزێ بۆ سەر زەوی، خودای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾ فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ۖ وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٣٦﴾ ﴾ البقرة. واتە:(ئینجا ووتمان: ئەی ئادەم خۆتو هاوسەرت لەم بەهەشتەدا ژیان بەرنە سەرو نیشتەجێ بنو لە هەر کوێ حەز دەکەن بخۆنو بخۆنەوە بە تێرو تەسەلی، بەلاّم نزیکی ئەم درەختە مەکەون (درەختێکیان بۆ تاقیکردنەوە لێ قەدەغەکرا ) ئەگەر نا دەچیتە ڕیزی ستەمکارانەوە، شەیتان (فرسەتی لێهێنان)و لەخشتەی بردن (وای لێکردن لە بەروبومی درەختە قەدەغەکراوەکە بخۆن )و لەو شوێنە ( خۆشو پڕ لە نازو نیعمەتە ) بەدەرکردنی دان، ئەوسا پێمان ووتن: (مادەم سەرپێچیتان کرد ئیتر لێرە جێتان نابێتەوە )، دەبێ دابەزنە خوارەوە بۆ سەر زەوی، جا (لەوێ) هەندێکتان دوژمنی هەندێکتان دەبن (شەیتان دوژمنی ئێوەیەو بەردەوام هەوڵ دەدات دوژمنایەتی لە نێوانتاندا بەرپا بکات)، تا ماوەیەکی دیاری کراو نیشتەجێ دەبن لە زەویداو لە نازو نیعمەتەکان سود وەردەگرنو بەهرەمەند ئەبن) .

دیارە کە ئیبلیس لە گوێ ڕایەڵی خودا لای دان، چونکە تەنها ئەو کڕنوشی بۆ ئادەم نەبرد، ئامادە نەبوو کڕنۆشی بۆ ببات ئیتر بە نەفرەت کرا. پاش ئەمە دوژمنایەتی پەیدابوو لە نێوان شەیتان (نەفرەتی خودای لێ بێت) و ئادەم (سلاّوی خودای لێ بێت)، جا شەیتان بیری لە تۆڵە سەندنەوە کرد لە ئادەمو نەوەکانی، پیلانێکی پیسو پڕفێڵی دارشتو هاتە گۆ، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ الحجر . واتە: (شەیتان ووتی: پەروەردگار، مۆڵەتم بدە، هەتا ئەو ڕۆژەی هەموان زیندوو دەکرێنەوە ).

## مۆڵەتم بدەریٚ تـاڵەو ڕۆژەی
## هەمـوان زینـدوو دەکریٚنـەوە

ئیبلیسی خۆبەگەورەزان‌و کەللە ڕەق‌و یاخی، شایستەی ئەم سزایە بوو، بۆیە خودای گەورە لە بەھەشتدا دەریکردو سوك‌و ڕیسوای کرد، دوای ئەمە ئیبلسی نەفرەت لێکراو، داوای مۆڵەتی لە پەروەردگاری کرد، بەوەی دەرفەتی بداتیٚ ھەتا ڕۆژی زیندوو بوونەوە، خودای گەورە وەڵامی ئەم داواکاریەی دایەوە، لەبەر حیکمەتێك کە خودا خۆی دەیزانیٚ‌و پێی فەرموو: ﴿ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿٨٠﴾ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴿٨١﴾ ﴾ص . واتە: (خودا فەرمووی: باشە تۆ لە مۆڵەت دراوانی * تارۆژو كاتی دیاریکراو ) .

بێگومان ڕۆژی دیاریکراو ڕۆژی دواییە، ئەم مۆڵەتە لەبەر ئەوەیە، کەخودای گەورە پەلە ناکات لە تۆڵە سەندنەوە، لەو کەسانەی کەیاخی دەبن لێی .

جاداوای مۆڵەتەکەی بۆ ئەوە نەبوو کەپەشیمان بێتەوەو بگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگارو داوای لێخۆشبون بکات، تا تاوانەکەی لەسەر لابچێت، نەخێر مۆڵەتەکەی بۆ تۆڵە سەندنەوە بوو لە ئادەم‌و نەوەکانی، چونکە ھۆکاری نەفرەت لێکردنەکەی ئەگێڕایەوە بۆ ئادەم، نەك بۆ گومڕایی‌و سەرپێچی خۆی .

دوای ئەوەی ئیبلیس دڵنیا بوو لە مانەوەی تا ڕۆژی زیندوکردنەوە (قیامەت)، دڵنیا بوو لەوەی تیا ناچێت، ئیتر یاخی بوو لە تاواندا و لە گوناھیشدا ڕۆچوو، کەوتە پیلان دانان بۆ ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ مرۆڤدا، شوێنی ئەم ئاشوبەش سەر زەوی بوو، پیلانەکەشی بریتی بوو لە ڕازاندنەوە، ڕازاندنەوەیەکی پیس‌و جوانکردنی شتەکان، بەجۆرێك ھەر خراپەیەك مرۆڤ دەیکات جیٚ دەستی شەیتانی پێوە دیارە، چونکە ڕازاندوێتیەوەو جوانی کردووە لەبەر چاوی، ڕووکەشێکی بۆ دەکات کە ڕووکاری درۆیانەو ھەڵخەڵەتاندنە . ئالێرەدا پێویستە مرۆڤ ئاگادارو ورياو ھۆشیار بێت، نەیەڵێت شەیتان فرسەتی لیٚ ببینیٚ‌و جوانی‌و درەخشانی ئارەزوو تاوان فریوی نەدات و لەھەر کاتێك شەیتان ھانی دا بۆ خراپەیەك پەنا بە خودا بگریٚ‌و پشتی پیٚ ببەستیٚ، چونکە شەیتان تواناو دەسەڵاتی بەسەر بەندە دڵسۆزەکانی خودای باڵادەستدا نییە .

## حیکمەتی دروستبونی ئیبلیس

خودا، گەورەو بالادەستە، پاكو بێگەردی شایستەی خۆیەتی، دوورە لەوەی کەشتێك بەبێ سود دروست بکات، هیچ دروستکراوێکی بەبێ مەبەستو حیکمەت دروست نەکردووە، تەنانەت زیندەوەری بچوكو میکرۆبو زیندەوەرۆچکەش .. جا هەندێ لەو مەبەستانە بۆ خەڵکانێك دەرکەوتوون، لای کەسانێکی تریش نادیارە، ئەگەر حیکمەتو مەبەستی کارەکە زانرا، بێگومان شتێکی چاكوباشە، بەڵام ئەگەر نەزانرا، ئەوا ڕازینو باوەڕمان بەوە هەیە، کە خودا زاناو بیسەرو دانایە بەشتەکانو هیچ شتێ بێ هودە دروست ناکات .

پاشان دێینە سەر حیکمەتی هەبوونی ئیبلیس (نەفرەتی خودای لێبێت) .

* ئیبن قەییم (ڕەحمەتی خودای لێبێت) لەکتێبێکدا بەناوی (شفاء العلیل) باسی هەندێ حیکمەتی دروستکردنی ئیبلیس دەکات، لەگەڵ حیکمەتی هەبوونی بێ باوەڕەکان .

* ئیبن قەییم ئەفەرمووێت: ئەگەر ووترا، ئیبلیس خراپەیەکی ڕەهایەو کوفرو خراپەش وەکو ئیبلیس وان، جا چ خێرێك لە بوونی ئەمانەدایە تابێنە ئەم بوونەوە؟

وتراوە: لەبوونی ئیبلیسدا حیکمەتو بەرژەوەندیو خێری زۆر هەیە، کە بەبونی ئەوەوە پەیوەستە، تەنها خودا ئەزانێ ئەو حیکمەتو بەرژەوەندیانە چین، وەکو ئێمە هەندێکی شارەزا دەبین لەمەودوا .

پەروەردگاری کاربەجێ ئیبلیسی بەبێ هۆ دروست نەکردووە، مەبەستیشی نی یە بەهۆیەوە زیان بگەیەنێ بەبەندەکانیو بەرەو فەوتانیان ببات، خودای گەورە لەدروستکردنی شتەکاندا چەندەها مەبەستی ئاشکراو درەخشانو بەڵگەی بڵندو نیعمەتی دیارو بەرچاوی هەیە، هێندێ لەو شتانە بۆ ئایینو بیرو باوەڕ، وەکو ژەهروایە بۆ لاشەی مرۆڤ، دیارە لە هەبوونی ژەهریشدا بەرژەوەندیو مەبەست گەلێك هەن، کە ئەو حیکمەتو مەبەستانە زۆر زیاترن لەوەی کە ژەهرەکە نەبێ، بەڵام ئەو شتەی نەخێرو نەشەڕی هەیە بێگومان لەبووندا نییە، یان نایەتە بوونەوە، چونکە بێ هودەیە، پاكو بێگەردیش بۆ خودا، کەشتی بێ هودە دروست بکات.

هەر کەسێك بڕوانێ بۆ ئەم بوونە (وجود) ئەزانێ کە خێرو چاکە تیایدا بالا دەستە، نەخۆشی هەرچەندە زۆربێ، تەندروستی تیایدا زیاترە، خۆشیەکان زۆر زیاترن لە

ناخۆشیەکان، بەهێزیو بەتوانایی زۆر زیاترن لە کە نەفتیو بێ توانایی، خنکانو سوتانو ڕووخانو هاوشێوەکانی هەرچەندە زۆربن، بەلأم سەلامەتی زیاترە . جانەگەر ئەم بەشەی کەخێرەکەی باڵادەستە نەبوایە لەبەر ئەوەی هەندێ خراپەی تێدایە، ئەوا هەموو چاکەکان لە ناونەچوو.

لەناوبردنی زۆرەکەش شەڕێکی گەورەترە، نموونەی ئەمەش ئاگر، بێگومان لەبوندا سودی زۆری هەیە، بەلأم زیانیشی هەیە، جا ئەگەر بەراورد بکەین لە نێوان سودو زیانەکانیدا بێگومان ڕێژەی زەرەرەکانی زۆر کەمترە لەبەرامبەر سودەکانیدا، بەهەمان شێوە بارانو باو گەرماو سەرماش هەروان، بەشێوەیەکی گشتی توخمەکانی ئەم جیهانەی خوارەوە( السفلی )، چاکەکانی ناوێتە بووە بەخراپەکانیەوە، بەلأم چاکە کانی زیاترە بەلأم جیهانی سەروو (العلوي) دوورە لەم شتانە .

ئەگەر ئەڵێن حیکمەتی ئەوە دەرکەوت، کە ئەم جیهانە دروستکراوە لە ناوێتەیەك، لە خۆشیو ناخۆشی، چاکەو خراپە، بەلأم چاکەو خۆشی باڵا دەستە، تا خراپەو ناخۆشی، کە ئەمەش هەبوونی لە پێشترە تا نەبوونی، باشە چ خێرو بەرژەوەندیەك لەسەر چاوەی هەموو خراپەیەكو پێشەوای کەسانی خراپ ئیبلیسدا هەیە؟ چ خێرێك لە مانەوەیدایە تا ڕۆژی دوایی؟ چ خێرێك لە بونێکدایە کە نەوەدونۆی بۆ ئاگر بڕواتو یەکێکی بۆ بەهەشت؟ چ خێرێك لەوەدا بەدی دەکرێت، کە دایكو باوکمانی تێدا دەرکرا لەبەهەشتدا، ئایا ئەگەر هەر لەبەهەشتدا بمانایەتەوە، شەڕ بەتەواوەتی هەڵدەگیرسا؟ بۆوەڵامی ئەم پرسیارانە ئیبن قەیم ئەفەرمووێت: لە بوونی ئیبلیسدا جۆرەها حیکمەت هەیە، کە هیچ کەسێ ناتوانێ پەی بەهەمووی بەرێ، تەنها خودا نەبێ، لەو حیکمەتانەش:

١ـ لەبوونی شەیتانو دەستو پێوەندەکانیدا تەواوکردنی پلەکان (مراتب)ی پەرستنی خودا هەیە: تا بۆ پێغەمبەرانو پیاو چاکان تەواوکردنی پلەکانی بەندایەتی بۆ خودا بێتە کایەوە، ئەمەش بەتێ کۆشان بەرامبەر بەئیبلیسی دوژمنی خوداو ئەوانەی لەگەڵیدان، هەروەها جوڵانەوە بەپێچەوانەی خواستەکانی ئەوەوەو دوژمنایەتی کردنی لەبەر خاتری خودای گەورە، پاشان ڕق لێ بوونەوە لە شەیتانو هاوشێوەکانی، ئینجا پەنا گرتن بە خودا لەشەیتانی نەفرەت لێکراوو هاناو هاوار بردن بۆ خودا کەبیان پارێزێ لەفێڵو شەڕی ئەو

دوژمنە، خوێنەری بەڕێز، زۆر بەرژەوەندی دونیاو قیامەتی لەسەر ئەوانە سازکراوە کە باسکراون، بەبێ ئەوانەش بەدەست نایەن، چونکە شتێك لەبەر شتێکی تر سازکرابێ بەبێ ئەو شتە دەست ناخرێت.

٢- ترساندنی بەندەکانی خودا لەتاوان: لەو حیکمەتانەش، ترسی فریشتەکانو باوەڕدارەکان لەتاوانەکانیان، ئەمەش پاش ئەوەی حاڵی ئیبلیسیان بینی کەچی بەسەر هات، دابەزاندنی لەپلەو پایەی فریشتەوە، بۆ جێگایەکی پاخیوخراپەکاری، کە جێگای پێشتری تەواو ترو باشتر بوو. گومانی تێدا نییە کەفریشتەکان کاتێ ئەوەیان بینی کە ڕوویدا، پەرستشو بەندایەتیەکی زیاتریان بۆ پەروەردگار نواند، لەگەڵ ملەکەچیو ترسێکی زیاتر، هەروەك چۆن دیمەنی پادشایەك ئەبینی کە کۆیلەیەکی خۆی سوكو ڕیسوا دەکاتو کۆیلەکانی تریش کە ئەمە ئەبینن، گومانی تێدا نیە کە ترسو ئاگادارییەکەیان زیاتر دەبێ.

٣- خودای گەورە کردی بەپەندێك بۆ کەسانی تر: بێ گومان پەروەردگار گێڕای بە پەندوئامۆژگاری بۆ ئەوانەی فەرمانەکانی بەجێ ناهێننو سەر پێچی دەکەنو خۆیان بە گەورە دەزانن لە ئاست فەرمایشتەکانی خودای میهرەبانو لەسەر تاوان بەردەوام دەبن، بەهەمان شێوە گوناهی ئادەمی کردە پەندو ئامۆژگارییەك، بۆ ئەوانەی کە قەدەغەکراوەکان ئەنجام ئەدەنو سنورەکان ئەبەزێنن، دیارە کە ئادەم لەکردەوەکەی پەشیمان بۆوەو تەوبەی ڕاستەقینەی کردو پەشیمان بۆوە لە تاوانەکەی، لێرەدا دوو تاقیکردنەوە بەدی دەکەین : یەکەم: باوکی جنۆکە، دووەم: باوکی مرۆڤ ، باوکی جنۆکە (ئیبلیس) لەسەر تاوانەکەی بەردەوام بوو، ئەنجامەکەشی بۆ دۆزەخە، بەڵام باوکی مرۆڤ لە تاوانەکەی پەشیمان بۆوەو تەوبەی کردو ئەنجامەکەشی بۆ بەهەشتە .

٤ ـ گێڕای بەتاقیکردنەوە بۆ بەندەکانی: لە ڕاستیدا شەیتان سەنگی مەحەکەو خودای بەخشندە دروستکراوەکانی پێ تاقیدەکاتەوە، تاچاکەکارانو خراپەکاران لە یەکدی جیابکاتەوە، پەروەردگار مرۆڤی لەزەویدا نیشتەجێ کردووەو جۆرەهایان هەیە، هەیانە دڵ خۆشن هەیانە دڵ تەنگ، هەیانە چاکەکار هەیانە خراپەکار، بۆیە پێویستە دەربکەوێ کێ باشەو کێ خراپە، لە فەرمودەیەکدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (**إن الله تعالى خلق أدم من قبضة قبضها من جميع الأرض، فجاء بنو أدم على قدر الأرض، فجاء منهم الأحمر والأبيض والأسود وبين ذلك، السهل والحزن والخبيث والطيب**). (رواه الترمذي). واتە:(خودای گەورە

ئادەمی دروستکردووە لەمشتێك، ئەو مشتەی لە هەموو زەوی وەرگرتووە، بۆیە سورو سپیو ڕەشی تێدایە، هەیشە لەو نێوانەدایە، هەیانە دڵ خۆشەو هەیانە دڵ تەنگەو هەیانە باشەو هەیانە خراپە) .

کەوابێ مرۆڤ لەماددە بنەڕەتیەکەی زەوی دروست بووە، حیکمەتی پەروەردگاروابوو کە ئەم مرۆڤە تاقیبکاتەوە، ئەمەش پێویستی بەهۆکارێك هەیە، کە ئەم ئەزمونە دەربخات، ئیبلیس لێرەدا دەبێتە ئەوسەنگی مەحەکەی، کەچاكو خراپی پێ جیادەکاتەوە، بەهەمان شێوە، خودای گەورە پێغەمبەرانو نێردراوەکانی کردۆتە سەنگی مەحەك، بۆ ئەم جیاکردنەوەیە .

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ﴿١٧٩﴾ ﴾آل عمران!!واتە: ( خودا ئیمانداران واز لێناهێنێ هەروەکو ئەوەی کەئێستا ئێوە لەسەری هەن ( د ڵسۆزو نادڵسۆز، خەمخۆرو بێباك تێکەڵن ) هەتا پیسو پاك لەیەك جیانەکاتەوە (بەهۆی جۆرەها تاقیکردنەوەو پێش هاتەوە) پەروەردگاری مەزن، پێغەمبەرانی ڕەوانە کردووە بۆ بەندەکانی، بێگومان باشو خراپیان تێدایە، ئەوجا چاکە بۆلای چاکە دەچێتو خراپەش بۆلای خراپە دەڕوات) .

حیکمەتی بێ کۆتایی خودا وابوو کەلەم دونیایەدا تێکەڵیان بکات بۆ تاقیکردنەوە، بەڵام لە حاڵی جێگیرو بێ کۆتاییدا جیایان دەکاتەوە، وەبۆ هەر یەکێکیان جێگایەکی داناوە کەشایستەی بێت بەپێی کردەوەکانی .

٥- دروستکردنی دژیەکەکان بە تەواوەتی توانای پەروەردگارمان بۆ دەرئەخات: لەو حیکمەتانەش: کامڵیەتی توانای خودا دەرئەکەوێ لەدروستکردنی جوبرائیلو فریشتەکان، ئیبلیسو شەیتانەکان، ئەمەش لەگەورەترین بەڵگەو نیشانەی تواناو کاربەدەستیو گەورەیی خودایە .

پەروەردگار دروستکەری دژیەکەکانە، زەویو ئاسمان، تاریکیو ڕووناکی، بەهەشتو دۆزەخ، گەرمیو ساردی، چاكو خراپ .

٦- لەو حیکمەتانەش چاکەی هەموو دژێك پێچەوانەکەی دەردەخات: لەو حیکمەتانەش، ئەوەیە کە دوو دژیەکی دروستکردووە لە تەواوی باشەی دژەکەی یان

خراپەی دژەکەی، لەڕاستیدا دژیەکەکان باشەکانیان بە پێچەوانەکانیان دەردەکەوێ، ئەگەر ناشیرینی نەبوایە کەی نرخی جوانی دەزانرا؟! ئەگەر هەژاری نەبوایە چۆن نرخی دەوڵەمەندی دەزانرا؟!

٧ـ بەتاقیکردنەوە سوپاسگوزاری دێتەدی: خودای بەخشندە پێی خۆشە کە سوپاس بکرێت، بە جۆرەها سوپاس‌و هەروەها بە ڕاستی سوپاسبکرێ، بێگومان خۆشەویستانی خودا چەندەها تاقیکردنەوەو سوپاس گوزارییان بەدەست هێناوە، بەهۆی هەبونی ئیبلیس‌و سەربازەکانییەوە، دیارە بەبێ بوونی ئەوانیش ( ئیبلیس‌و سەربازەکانی ) ئەم چاکانە بەدەست نەئەهات. جا تەماشاکە چەند جیاوازی هەیە لەنێوان سوپاسی ئادەم پێش دەرچوونی لە بەهەشت‌و پاش دەرچوونی‌و دوای ئەوەی تاقیکرایەوە بە دوژمنەکەی، پاشان پەروەردگار تەوبەکەی گیرا کردو هەڵیبژاردەوە.

٨ ـ لەگەڵ بوونی ئیبلیسدا بازاڕی خودا پەرستی بەدی دێ: لەڕاستیدا خۆشەویستی خوداو پەشیمانی لەتاوان‌و پشت بەستن بە پەروەردگاری پاک‌و ڕازیبون‌و گوێ ڕایەڵی، لە خۆشەویسترین کارەکانن بەلای خودای گەورەوە، ئەم خوداپەرستنەش بە ماندووبوون‌و هەوڵدان لەبەر خاتری خودا دێتە دی. هەوڵ‌و تێکۆشان(جهاد) بریتیە لە چڵە پۆپەی، بەندایەتی، هەروەها خۆشەویسترین کارە بەلای خودای گەورەوە، ئەم هەوڵ‌و تێکۆشانەش بەرامبەر ئیبلیس‌و گرۆهو کۆمەڵەکانێتی، کەوابێ ئالێرەدا ئەم بازاڕی خودا پەرستیە دێتە ئاراوە وکەس ناتوانێ حیکمەتەکان‌و سودەکانی بژمێرێ تەنها خودا خۆی نەبێ.

٩ـ دەرکەوتنی نیشانەو توانا بێ کۆتاییەکانی خودای خاوەن فەرمانڕەوا: لەدروستکراوەکاندا کەسانێك هەن دژایەتی پێغەمبەران دەکەن‌و بەدرۆیان دەخەنەوەو دوژمنایەتیان لەگەڵدا دەکەن، جا ئەمانە زۆر پێویستن بۆ خۆشەویستانی خودا، چونکە خودای گەورە تواناو دەسەڵاتی خۆی لەڕێگای پێغەمبەران‌و پیاو چاکانەوە بۆ ئەمانە دەردەخات، ئەم خەڵەتاندنەش بریتین لە: باو بۆرانی زۆر، گۆچان، دەست، شەق کردنی دەریا، مردوو زیندوو کردنەوە، ... هتد بێگومان ئەمانەش بەڵگەو نیشانەی تواناو زانایی خودای بەدیهێنەرە .

١٠ـ دروستکردنی لە ئاگر بەڵگەیەکە: ماددەی ئاگر سوتان‌و بەرزبونەوەو خراپەی تێدایە، هەروەها گەشانەوەو درەوشانەوەو ڕووناکی تێدایە، خودای کاربەجێ هەر دووکی

لێدەرهێنا، واتە هەر لە ئیبلیسدا، چونکە یەکەم جار باش بوو، بەڵام دوایی گومڕابوو، وەکو چۆن ماددەی خۆڵ لەزەویدا باشو خراپو خۆشیو ناخۆشیو سورو سپیو ڕەشی تێدایە، جا هەموو ئەم دەرهێنانە بەڵگەو نیشانەی کاربەجێیی خودای داهێنەرو بەتوانایە، ئەمەش ئاماژەیە بەوەی کە ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾ ﴾ الشورى. واتە:(هیچ شتێك بەوێنەی خودا نیەو ئەوە کەبیسەرو بینایە).

١١- بەدەرخستنی شتگەلێك کەپەیوەستن بە ناوەکانی خوداوە: بەڕاستی ئەم سیفەتانە لە ناوە پیرۆزەکانیەتی . (**الخافض**)واتە: (دانەوێن)، (**الرافع**) واتە: (بەرزکەرەوە)، (**المعز**) واتە: (زاڵکەر)، (**المذل**) واتە: (زەبوونکەر)، (**الحکم**)واتە: (فەرمان ڕەوا)، (**العدل** ) واتە: (دادگەر )، ( **المنتقم**) واتە:(تۆڵە سێن)، جا ئەم ناوانە پێوستیان بەچەند پاسایەك هەیە تا دەربکەون لەواقیعی ژیانی مرۆڤەکاندا .

١٢ - دەرخستنی بێ کەمو کوڕێتی خاوەن دارێتیەکەیو گشتێتی کردارەکانی: لەو حیکمەتانەش: بەڕاستی خودای پاكو بێگەرد، پادشایەکە خاوەنداریەتیەکەی بێ کەمو کوڕیە، هەروەها لەنیشانەکانی کامڵی ئەم خاوەندارێتیە، وە گشتێتی کردارەکانی ئەوەیە، کە جۆرەها ڕەفتاری هەیە: پاداشتو سزا، بەخشینو دادپەروەریو خۆشەویستکردنی کەسانێكو زەلیل کردنی هەندێکی تر، بۆیە پێویستە کەسانێك هەبن یەکێك لەم شتانە بیان گرێتەوە، بۆ نموونە: کەسانێك هەبن پاداشت بدرێنەوەو کەسانێك هەبن سزا بدرێن .

١٣- بوونی ئیبلیس لە کامڵیو کاربەجێی خودای گەورەوەیە، وە دیارە کەیەکێك لە ناوەکانی خودای گەورە (الحکیم)ە، واتە: (کاربەجێ)، ئەمە یەکێکە لەسیفەتەکانی، جا کاربەجێیی خودا لەوەدایە هەموو شتێك لە جێگەیەك دائەنێ کە شایستەی ئەو شوێنە بێت، هەر بۆیە دژ یەکەکانی دروست کرد، دیارە هەردوو دژێ کۆمەڵێ یاساو ڕێسای تایبەتی خۆیان هەیەو کەبۆ ئەوی دی نابێت، جا بوونی ئەم جۆرانە لەگەڵ یاساو ڕێساکاندا، تواناو زانایيو دانایی خودا دەردەخەن .

١٤- سوپاس کردنی پەروەردگار: بەڕاستی سوپاس کردنی خودا کامڵو بێ هاوتایە لە هەموو ڕوویەکەوە، پەروەردگاری بەخشندە لەسەر جۆرەها شت سوپاس کراوە، وەکو دادپەروەریو نەرم کردنەوەو تۆڵە کردنەوەو سوککردنی تاوان باران، بەهەمان شێوە سوپاس

کراوە لەسەر بەخشینی بەرزکردنەوەی کەسانێك‌و هەروەها پێدانی نیعمەت بەهەندێکی تر . پاشان خودای گەورە سوپاسی زاتی خۆی دەکات، ئەوجا پێغەمبەران‌و فریشتەکان‌و پیاو چاکانیش سوپاسی دەکەن، مرۆڤە بە ئەمەك‌و بەوەفادارەکانیش سوپاسی دەکەن، ئەم سوپاسگوزارییە لەسەر دانایی‌و کاربەجێی زاتی پاکی پەروەردگارە، لە هێنانەدی‌و دروستکراوەکاندا، جا یەك خستنی سوپاس‌و کاربەجێی کارێکی شیاو نیە .

١٥ـ خودای گەورە لەسەرخۆیی‌و ئارامگری خۆی بۆ بەندەکانی دەردەخات: بەڕاستی خودای تاك‌و تەنیا پێی خۆشە هێمنی‌و لەسەرخۆی‌و ئارامگری‌و لێبوردەیی‌و بەزەیە فراوانەکەی بۆ بەندەکانی دەربخات، جا کەسانێك هەن هاوەڵ پەیدا دەکەن بۆ خودا، دژایەتی بەرنامەکەی دەکەن، بە پێچەوانەی فەرمانەکانی ئەو دەجوڵێنەوە، هەندێ جار ئەمانە خۆشیان بەخودا دەچوێنن، لەگەڵ ئەمەشدا خودای بە توانا جۆرەها نیعمەتیان ئەداتێ، بەڵام ئەمان گلەیی لە پەروەردگار دەکەن، خودای گەورە چێژی پێ بەخشیون بۆ تامکردنی ڕۆزی، خراپەیان لەسەر لادەبات، مامەڵەشی لەگەڵیاندا چاکەو دادپەروەرە، بەپێچەوانەی ئەوانەوە، کە هاوەڵ دانەر (مشرك)و بێ باوەڕو خراپەکارن، ئائەمانە نیشانەی ئارامگری‌و حیکمەتی خودان. لەئاکامیشدا سوپاس دەکرێت‌و خۆشەویست دەبێت لە لای پیاوچاکان، پێغەمبەر (ﷺ) لەم بارەیەوە لەفەرمودەیەکدا دەفەرموێت: ( **لا أحد أصبر على أذى يسمعه من الله عزوجل، إنه يشرك به، ويجعل له ولد، ثم هو يعافيهم و يرزقهم** ) (متفق عليه). واتە:(کەسێك نییە بەئارامتر بێ، لەخودای گەورە، کاتێ گوێ بیستی ناخۆشیەك دەبێت، چونکە بەڕاستی خودا هاوەڵی بۆ بڕیار ئەدرێ، کوڕی بۆ دائەنێن، ئەوجا لێیان خۆشدەبێ‌و ڕۆزیان دەداتێ) .

لەصەحیحی بوخاریدا هاتووە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ( **قال الله : كذ بني إبن آدم ولم يكن له ذلك، و شتمني ولم يكن له ذلك، فاما تكذبه إياي ، فزعم أني لا أقدر أن أعيده كما كان، وأما شتمه إياي فقوله لي ولد، فسبحاني أن أتخذ صاحبةً أو ولدا** ) .

واتە:(خودا دەفەرموێت: بنیادەم بەدرۆم دەخاتەوە، بەڵام‌واش نییە، جنێوم پێدەدات، بەڵام‌واش نییە، بەدرۆخستنەوەکەی ئەوەیە وادەزانێ من توانام نییە زیندووی بکەمەوە، وەکو یەکەم جار، جنێوەکەشی ئەوەیە، کە ئەڵێ: من کوڕم هەیە، پاك‌و بێگەردی بۆ من کە هیچ هاوەڵ‌و کوڕێکم هەبێ) .

خودای پاك‌و بێوێنه، لەگەڵ ئەمانەشدا ڕۆژی جنێودەرو بە درۆخەرەوەش ئەدات، بەرگری لێدەکات، بانگەوازی دەکات بۆ بەهەشت، تەوبەی لێوەردەگرێ، ئەگەر پەشیمان بێتەوە، خراپەکانیشی بۆ ئەگۆڕێت بەچاکە، بەزەیی پێدا دێتەوە، پێغەمبەرانیان بۆ ڕەوانە دەکات‌و فەرمانیان پێ دەکات کە گفت نەرم‌و قسە خۆش بن لەگەڵ یەکتردا .

* فوزەیلی کوڕی عەیاز ئەفەرمووێت: هیچ شەوێك تاریك دانایات، تا خودای میهرەبان بانگ نەکات: کێ لەمن بەخشندە ترە ئەی دروستکراوەکان؟ سەرپێچی فەرمانی من دەکەن، بەڵام من چاودێرییان دەکەم لە جێگاکانیانداو ئەیان پارێزم، وەکو ئەوەی تاوانیان نەکردبێ، بەبەخشندەیی خۆم سەرپێچیکارو خراپەکار ئەبەخشم، کێ نزای کردووەو وەڵامی نەدراوەتەوە؟ کێ داوای کردووەو پێم نەبەخشیوە؟ من بەخشندەم‌و بەخشندەیی لەمنەوەیە، من میهرەبانم‌و میهرەبانی لەمنەوەیە، لە بەخشندەییمەوەیە وەڵامی داواکاران دەدەمەوەو پێیان دەبەخشم، لە میهرەبانییمەوەیە کە تەوبەکاران دەبەخشم، وەکو ئەوەی هەر تاوانیان نەکردبێ، جا بۆچی لەمن ڕادەکەن، لە بەر دەرگای من بۆ کوێ هەڵدێن، ئەی سەرپێچیکاران؟

لە فەرمودەیەکی قودسیدا هاتووە: ( **قال الله تعالى: إنيّ والجن والإنس في نبإٍ عظيم، أخلق ويعبد غيري، وأرزق و يشكر غيري** ). واتە:( خودای گەورە دەفەرموێت: لەڕاستیدا من‌و جنۆکەو مرۆڤ لە دەنگ و باسێکی گەورە داین، من دروستم کردون، بەڵام کەسانێکی دی دەپەرستن، من ڕۆزییان دەدەم، بەڵام سوپاسی کەسانێکی تر دەکەن).

هەروەها لە فەرمودەیەکی صەحیحدا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: **(والذي نفسي بيده لولم تذنبوا، لذهب الله بكم، ولجاء بقوم يذنبون، فيستغفرون الله تعالى، فيغفرلهم)** (مسلم . ٢٧٤٩).

واتە:( سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر تاوان نەکەن، خودا ئێوە لادەبات‌و کەسانێکی تر دێنێ، تا داوای لێخۆشبون لەخودا بکەن، خودای گەورەش لێیان خۆش دەبێ) .

١٦ـ بەهۆی بوونی شەیتانەوە خۆشەویستی بۆ پەروەردگار دێتە ئاراوە: بەهۆی ئەم دوژمنە سەر سەخت‌و یاخییەی پەروەردگارەوە، چەندەها خۆشەویست پەیدا بووە بۆ خودای باڵادەست . ئەگەر بەهۆی ئیبلیسەوە، خراپەو سەرپێچیکردن بێتەدی، ئەوا بەهۆی

ئەوو سەربازەکانییەوە چەندەها گوێ ڕایەڵی دێتە دی، کە زۆر خۆشەویستن لەلای پەروەردگار . لەو کارانەش بەگوێ نەکردنی ئارەزووەکانی ئەمانە، ئەبنە هۆی ڕازیبوونی پەروەردگار، پاشان خۆشەویسترین شت بەلای خۆشەویستراوەوە ئەوەیە کە خۆشەویستەکەی ببیستێ لەپێناوی ئەو دا ئارام ئەگرێ لەسەر ناخۆشیو دەردەسەری، دیارە ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەو خۆشەویستیە.

لـە پێناوی تۆدا، ڕووم کردووە بە زەوی
بۆ جنێو دەرو حەسود، هەتا تۆ ببی ڕازی

ئاخۆ ئەم ئاکارانە چەند بەرزبن لەلای خودا، کاتێ خۆشەویستەکانی ئارامدەگرن لەسەر ئازاری دوژمنانی خودا، بۆ ڕەزامەندی زاتی پەروەردگار، پاشان ئەم بەندە چاکەکارانە سەرئەنجامیان چەند ڕۆشنو بەختەوەرە لە بەدەست هێنانی بەخشندەیی خۆشەویستەکەیان، بەڵام ئەم خۆشەویستیە قەدەغەکراوە لەسەر ئەوانەی کە ئینکاری خۆشەویستی خودا دەکەنو بەپێچەوانەی فەرمایشتەکانی دەجوڵێنەوە، جا ئەوانە لەم چێژە ڕوحییەو لەم تامی ئیمانە بێ بەرین، چونکە لەم دەروازەی ئاسودییەوە نەهاتنە ژورەوە . ئەگەر ئەم شەیتانە خودا تورە بکات، بێگومان کەسانێکی زۆر هەن لەپێغەمبەرانو پیاو چاکانو پەیامبەرەکان، کە عەوداڵن بەدوای ڕازی کردنی پەرروەردگارا، ئەم عەوداڵیەش زۆر گەورەترە لەو تورەکردنە .. ئەگەر کەسانی یاخیو سەرپێچیکار، خودا لەخۆیان دەرەنجێنن، بەڵام پەروەردگاری پاكوبێگەرد، زۆر خۆشحاڵە بەپەشیمانی بەندەکانی، وەکو ئەو کەسەی وڵاخەکەی بەکۆڵو بارەوە لەدەستی ڕائەکات، بەڵام لە ساتی تیاچوونو ماندوێتی دا ئەیدۆزێتەوە.

هەرچەندە خواردنی ئادەم لەدارەکە، خودا ناڕازی دەکات، بەڵام تەوبەکردنیو پەشیمانیەکەی وملکەچیەکەی بۆ پەروەردگار ئەبێتە مایەی ڕەزامەندی خودا.

جا ئەگەر دەرکردنی پێغەمبەر (ﷺ) لە مەککەدا لەلایەن دوژمنەکانیەوە، تورەی دەکات، بەڵام چوونە ژوورەوەی لەکاتی ڕزگارکردنی مەککە دا بەو جۆرە زۆر جێی ڕەزامەندی زاتی بەدیهێنەرە.

ئەگەر چی نارازییە بەتاوانی بەندەکان، بەڵام شایەتی فریشتەکانو پێغەمبەرانو پیاوچاکان لەسەر فراوانی لێبوردنو لێخۆشبوونو بەخشندەیی رازی دەکات، ئەوجا سوپاس کردنیو بەگەورە راگرتنیو ستایشکردنی زیاتر مایەی رازی بونیەتی تانەهێشتنی ئەو تاوانانە .

١٧ـ خودای گەورە پێی خۆشە ببێتە پەناگەو پشتیوانی خۆشەویستەکانی:

ئیبن قەیم ئەفەرموێت:وەکو چۆن خودای گەورە ستایش دەکرێت لەسەر کەمالی سیفەتەکانیو بەخشندەییو میهرەبانی، بەڵام هێندێ سیفەتی تریشی هەن، وەکو پەنا پێ گرتنی لەلایەن بەندەکانەوەو پاشان سەریان دەخاتو بەفریایان دەکەوێ لە کاتی تەنگانەدا. هەروەها کەماڵی خاوەن موڵك لەوەدایە کە خۆشەویستەکانی پەنای پێ بگرنو بیکەن بە پەناگەی خۆیان. مەبەستمان لێرەدا ئەوەیە کە فەرمان رەوای فەرمان رەواکان پێی خۆشە بەندەکان پەنای پێبگرن، هەروەها فەرمانی بەپێغەمبەران کردووە، کەپەنابەخودا بگرن لەشەیتانی نەفرەت لێکراو، بەمەش تەواوی نیعمەتەکانی بەسەر بەندەکانیەوە دەرئەکەوێ، لە کاتێکدا کە هانای بۆ دەبەنو پەنای پێ دەگرن لەلای دوژمنە سەر سەختەکەیان کەشەیتانە، جا بەهانا هاتنی بەندەکان لەلایەن خودای گەورەوە، نیعمەتێکی زۆر گەورەوەیەو هەروا بە سانایی نابێ سەیر بکرێ. خودای گەورە پێی خۆشە نیعمەتەکانی تەواو فەراهەم بکات بۆ بەندە بروا دارەکانی، سەریان دەخاتو زاڵیان دەکات بەسەر دوژمنەکانیانداو پارێزگاریان لێدەکاتو دڵیان خۆش دەکات، بەجۆرێك دونیایان بۆ دەکات بە بەختەوەری، دیارە کەبێ باوەرە کانیش لەم نیعمەتانە بێ بەرین.

## حیكمەتی هێشتنەوەی ئیبلیس تاكۆتایی ژیان

(**إبن القیم**) لە (**شفاء العلیل**) دا ئەفەرموێت: خودا چەندەها حیكمەتی هەیە كەوەهەم و خەیاڵ لەناو ئەبات و كەمی ئەكاتەوە لە هێشتنەوەی ئیبلیس، لەوانەش:

١ ـ تاقیكردنەوەی بەندەكان: خودای پاك و بێگەرد شەیتانی كرد بەسەنگێك تاپاك و پیس لەیەك جیابكاتەوە، دوژمن و خۆشەویستی پێ لێ جیا بكاتەوە، خودای كاربەجێ مەبەستی بوو شەیتان بمێنێتەوە، تا مەبەستی داواكراوی بەندەكانی بێتە دی، ئەگەر بیمراندایە، ئەو مەبەستە لەناو دەچوو، هەروەك چۆن حیكمەتی خودا بوو كە باوكی مرۆڤایەتی (ئادەم)ی تاقیكردەوە، هەروەها تاقیكردنەوەی ئەوەكانی كە لە دوای ئەو دێن، خۆشبەختیو سەربەرزی بۆ ئەو كەسەیە كە دوژمنایەتیو سەرپێچی شەیتان بكات، هەركەسێكیش گوێ ڕایەڵی شەیتان بكات و خۆشەویستی ئەو بێت، ئەچێتە ڕیزی شەیتانەوە.

٢ـ هێشتیەوەوەكو تۆڵەیەك بۆ كارەكانی پێشووی دوای ئەوەی فەرمانی بەسەردا دراو حوكم درا بەبێ بەشكردنی لەڕۆژی دواییدا، لەوەو پێش گوێ ڕایەڵیو پەرستشی هەبووە ، بەوە پاداشتی درایەوە كەلە دونیادا بمێنێتەوە، تا كۆتایی ژیان، چونكە خودای گەورە زوڵم و ستەم لەكەس ناكات، كە كرداری چاك بكات، پاداشتی چاكەی ئیماندار لەدونیاو دوارۆژدا ئەداتەوە، بەڵام پاداشتی چاكەی بێباوەڕ، لەدونیادا ئەداتەوەو لەدوارۆژدا هیچ پاداشتێكی نیە، وەكو چۆن لەفەرمودەی صەحیحی پێغەمبەر(ﷺ)دا هاتووە .

٣ـ مۆڵەت دراو هێشتیەوە تا تاوانی زۆرتر بكات: بەڕاستی مانەوەی ڕێزلێنان نەبوو بۆی، چونكە ئەگەر بیمراندایە، باشتر بوو بۆی و سزاكەی سوكتر ئەبو، كەمتریش خراپەی ئەكرد، بەڵام كاتێ گوناهەكەی توند تر بوو، بەوەی سور بوو لەسەر سەرپێچی كردن و دوژمنایەتی كردنی هەركەسێك ڕازی بێت بەفەرمانی خودا، قسەی لەحیكمەتی خودا دەكرد، سوێندی خوارد كە بەندەكانی خودا دوورخاتەوە لە پەرستنی، سزای تاوانەكەی گەورەترین سزایە بەپێی گەورەیی تاوانەكەی، سزایەكی بۆ بڕیاردرا، كەبۆ كەسێكی تر بڕیار نەدراوە، لەبەر ئەوەی سەرچاوەی هەموو خراپەیەكەو هەموو خراپەیەك لەوەوە هەڵدەقوڵێ، وەكو خراپەكانی بەئاگر پاداشت ئەدرێتەوە، هەموو سزایەك كاتێك دائەبەزێتە

سەر خەڵکانی ناو ئاگرو دۆزەخ، لە شەیتانەوە دەست پێ ئەکات، پاشان لەوەوە ئەچێت بۆ شوێنەکەوتوانی، بەڕاستی دادگەریەکی ئاشکراو ڕوونە .

٤ـ هێشتیەوە تابێتە دۆستو پشتیوانی تاوان باران، شەیتان لەدوژمنایەتی کردنی پەروەردگاردا ووتی: ﴿ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٢﴾ ﴾ الإسراء. واتە:(پێ شەرمانە ووتی: ئا ئەمەیە کەڕێزت داوە بەسەر مندا؟! سوێند بەخودا ئەگەر دوام بخەیت تا ڕۆژی قیامەت ئەوە بێگومان هەموو نەوەکانی گومڕاو سەرگەردان ئەکەم، جگە لەکەمێکیان کەدەسەڵاتم بەسەریاندا نیە).

خودای گەورە ئەیزانی لە نەوەکانی ئەو، کەسانێك هەن کە ناگونجێت لە ماڵی خودا نیشتەجێ بن، وە بەزمانی قەدەر پێی فەرموو: ئا ئەوانە هاوڕێی خۆشەویستی تۆن، وە دانیشە لە چاوەڕوانییاندا، ئەگەر چاکەکار بن تۆ ناتوانیت بەسەریاندا زاڵ بیت، چونکە من دۆستو پشتیوانی چاکە کارانم، ئەوە ئەوانن کەگونجاون بۆ من، تۆش دۆستی تاوان بارەکانی، کە شایەنی ئەوە نین ببنە خۆشەویستی منو ڕەزامەندی من بەدەست بێنن:

﴿ إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ إِنَّمَا سُلْطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾ النحل. واتە:(بێگومان شەیتان دەسەڵاتی نیە بەسەر ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو پشت بە پەروەردگاریان ئەبەستن * بە ڕاستی تەنها دەسەڵاتی بەسەر ئەوانەدا هەیە کە پشتیان پێ بەستوەو مل کەچو فەرمان بەرداری ئەو ئەبن، هەروەها ئەوانەش کە هاوبەش بۆ پەروەردگار دائەنێن).

بەڵام مراندنی پێغەمبەران بە سوکگرتنیان نیە، پەنا بەخودا، بەڵکو بۆ ئەوەیە بگەنە جێگەی ڕێزداریو شکۆداری، بۆ ئەوەی پشو بدەن لەو ماندو بونەی کە لەدونیادا توشیان بووە، لەگەڵ دەردەسەریودڵ ڕەقی دوژمنەکانیان. هەروەها بۆ ئەوەی پێغەمبەری تر بنێرێو خەڵکی پێغەمبەر لەدوای پێغەمبەر ببینن کە ڕەوانە ئەکرێن . مردنیان باشترو چاکترە بۆ خۆیانو میللەتەکانیان، بە نیسبەت خۆیانەوە بۆ ئەوەی پشو بدەن لەو شتانەی کە توشیان بووە لە دونیاداو گەیشتنیان بەدۆستی هەرە بەرزیان، کە ئەویش تەواوترین

چێژو خۆش بەختیە، بە تایبەت خودای گەورە سەرپشکی کردوون لەنێوان مانەوەیان لەدونیادا، یان گەیشتنیان بە خودای گەورە.

بەنیسبەت میللەتەکانیانەوە، وەکو چۆن لەژیاندا گوێ ڕایەڵیان کردوون، لە دوای مردنیشیان گوێ ڕایەڵیان کردوون، شوێنکەوتوانی پێغەمبەران ئەوانیان نەپەرستوە، چونکە خودای گەورە هەمیشە زیندووەو هەرگیز نامرێ. لە مراندنی پێغەمبەراندا چەندەها حیکمەتو بەرژەوەندی هەیە بۆ خۆیانو میللەتەکانیان، هەرچەندە ئەوانیش مرۆڤن، خودای گەورە مرۆڤی بۆ ئەوە دروست نەکردووە کە بە هەمیشەیی بمێنێتەوە، بەڵکو کردوونی بەجێنشینی خۆی لەسەر زەویدا، هەندێکیان ئەبنە جێنشین بۆ هەندێکی تریان، ئەگەر بیهێشتنایەتەوە ئەوا بەرژەوەندیو حیکمەت نەئەما لەکردنیان بە جێنشینو زەوی لەسەریان تەسك ئەبۆوە، مردن تەواوکەری هەموو باوەڕدارێکە، ئەگەر مردن نەبوایە ژیان خۆش نەئەبوو، هەروەها بەختیاری تیا نە ئەبوو بۆ کەسانی ئەم دونیاو حیکمەتی مردنیش وەك حیکمەتی ژیانوایە.

## سەرەنجامی ئیبلیس و ووتارەکەی لەئاگردا

خوێنەری بەڕێز: باش بزانە کە بەڕاستی سەرەنجامی شەیتان بۆ ئاگر چوونە، شەیتانو سەربازەکانیو شوێنکەوتوانی بەپێی کردەوەکانیان پاداشتیان ئەدرێتەوە، خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ قَالَ ٱخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٨﴾ ﴾الاعراف واتە:(خودا فەرمووی: لەبەهەشت دەرچۆرە دەرەوە بەسەر شۆڕیو ڕیسواییو دەرکراوی، سوێند بەخودا ئەو کەسەی شوێنت کەوت لەوان، ئەوە بێگومان دۆزەخ پڕ دەکەم لە ئێوە هەمووتان ) هەروەها خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ قَالَ ٱذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمْ جَزَآءً مَّوْفُورًا ﴿٦٣﴾ ﴾ الإسراء. واتە: (خودا بەشەیتانی فەرموو: بڕۆ ئەوەی شوێنی تۆ بکەوێت لەوان، ئەوە بێگومان دۆزەخ پاداشتی هەمووتانە، کە پاداشتێکی مسۆگەرەو جێگەی هەمووتانی تێدا دەبێتەوە).

هەروەها بە نیسبەت‌وتارەکەی بۆ شوێنکەوتوانی، لەو کەسانەی کە لەئاگردان، بێگومان خودای گەورە باسی کردووە لەقورئانی پیرۆزداو ئەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ الشَّيْطَانُ لَمَّا قُضِيَ الْأَمْرُ إِنَّ اللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ الْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ إِلَّا أَن دَعَوْتُكُمْ فَاسْتَجَبْتُمْ لِي ۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوا أَنفُسَكُم ۖ مَّا أَنَا بِمُصْرِخِكُمْ وَمَا أَنتُم بِمُصْرِخِيَّ ۖ إِنِّي كَفَرْتُ بِمَا أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾ إبراهيم .

واتە:(کاتێ هەموو شت تەواو ئەبێت بەهەشتیەکان ئەچنە بەهەشتەوەو دۆزەخیەکان ئەچنە دۆزەخەوە، شەیتان بەفەرمانی خودا دێتە قسەو ڕووبەڕوو بە شوێن کەوتوانی ئەڵێت: بەڕاستی خودا بەڵێنی ڕاست‌و دروستی پێڕاگەیاندبوون، منیش بەڵێنی درۆو نادروستم پێدان‌و جا توانیم گومڕاتان بکەم‌و لەڕێبازی ڕاست وێڵتان بکەم، وەنەبێت من هیچ زۆرو دەسەڵاتێکم بەسەر ئێوەدا هەبووبێت، جگە لەوەی بەوەسوەسەو خەیاڵ بانگم کردن بۆ خودا نە ناسی‌و تاوان، ئێوەش بە دەمەمەوە هاتن‌و بە قسەتان کردم، ئیتر سەر زەنشت‌و لۆمەی من مەکەن، بەڵکو سەر زەنشت‌و لۆمەی خۆتان بکەن، کە ئاوا بەبێ بیرکردنەوە بە قسەتان کردم، ئەمڕۆ من ناتوانم بە هاناو هاواری ئێوەوە بێم، ئێوەش ناتوانن بە هاناو هاواری منەوە بێن، بێگومان من باوەڕم بەوە نەبوو کە کاتی خۆی منتان کردبوو بە شەریك‌و هاوبەش لە پێشدا، بەڕاستی ئەمڕۆ ستەمکاران سزای زۆر بە ئازارو ئێش ئەدرێن) .

ئەم ناونیشانە (وتاری ئیبلیس لە ئاگردا) ئیمامی بەناوبانگ (إبن كثير) لە تەفسیرەکەیدا ئاماژەی پێکردووە، بە بۆچوونی من ئەم ناونیشانە پێویستی بەهەندێ ڕوونکردنەوەو ڕاستکردنەوە هەیە کە لەوانەیە لەبیرو هۆشی خوێنەردا شێوەیەك بێنێتە کایەوە کە شەیتان وتارەکەی تێدا ئەدات، ئەم شوێنەی شەیتان ووتاری تێدا ئەدات زۆر جیاوازە لەو شوێنەی وتار بێژێك، یان ئامۆژگاری کارێك، یان مامۆستایەك،ووتاری تێدا ئەدات‌و بەتەواوی پێچەوانەیە، چونکە شەیتان لەم کاتەدا هیچ توانایەکی نیە، ئەگەر ووتار بێژ، کارەکەی‌وایە ووتار بدات بەگوێی بیسەراندا لە بەرزاییەوەو لەسەر پلیکانێك یان چەند پلیکانێك، ئەوا شەیتان لە خوارەوەو لەژێری ژێرەوە ووتار ئەدات، ئەگەر ووتار بێژ

ئامۆژگاری خەڵك ئەكاتو فێریان ئەكاتو بڕیار ئەدات، بەڵام ئیبلیس لەوێدا ڕەنگ گۆڕاوو كزۆڵو ڕیسوا كراوە . ئەگەروتار بێژ سەری بەرزئەكاتەوە بۆ ئەوەی خەڵكی ببینن یان تاوشەكانی واتای هەبێتو هێز دروست بكات، بەڕاستی ئیبلیس لەوێدا سەری داخستوەو بچوك بۆتەوە، چونكە هەمووان داوای مافی خۆیان ئەكەنو بەدەنگی بەرزو بە تورەییو بێزڕێزییەوە سەیری دەكەنو داوای ڕوونكردنەوەو وەڵامی لێدەكەن.

ئیبلیس لەم ووتارەیدا لەژێری ژێرەوە كەوتووە، بەڵكو لە خواری خوارەوەیە، بێ هیواو شەكەت، ئاگر ئەیسوتێنێو لە هەموو جێگایەكەوە سزای بۆ دێت، فریشتەكانی سزا لە هەموو لایەكەوە لێی ئەدەن، هاوارو ناڵەی شوێنكەوتوانی ئازارەكانی زیاتر ئەكەن، لە سەروی ئەو ئازارانەشەوە كەهەیەتی، كاتێك ئەو هەزارو دەست كورتانە ئەبینێ كە لە دونیادا گاڵتەیان پێ كردوون، ئێستا لە بەهەشتدا پادشان، ئەمانە دڵی لەناو ئەباتو حەسرەتو داخی گڕ ئەسێنێ، پێویستە بەم شێوەیە بڕوانینە ئەم‌وتارە، ئەگەر نا ئەكەوینە هەڵەیەكی گەورەوە، لە تێگەیشتنی ئەو شتانەی خودا باسی كردوون .

حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خودای لێبێت ) ئەفەرموێت: ئیبلیس لەسەر دوانگەیەكی ئاگر ڕائەوەستێ، كێ ئەچێتە سەر ئەم دوانگەیە بەئارەزوی خۆی؟! بەم قسەیەی شێخ حەسەنی بصری بێت، دەرئەكەوێت كەشەیتان ئەو دوانگەیەی بۆ دروستكراوەو بە ئارەزووی خۆی ناچێتە سەری، بەڵكو بەزۆرو سزادان ئەچێتە سەری، ئەمەش لە لێكدانەوەی ئێمەوە دوورنیەو خودای گەورەش باشتر ئەزانێ. ئەم ئایەتە كەلە بارەیووتارەكەی شەیتانەوەیە، لە قورئاندا خودای گەورە ئاماژەی پێكردوە، دوای ئەوەی خودا هەواڵی ئەوەمان ئەداتێ كە گەورەكان بێبەری بوونی خۆیان ڕادەگەیەنن لەشوێن كەوتوانیان، خودای گەورە ئەفەرموێت:!﴿ وَبَرَزُوا لِلَّهِ جَمِيعًا فَقَالَ الضُّعَفَاءُ لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ اللَّهِ مِن شَيْءٍ قَالُوا لَوْ هَدَانَا اللَّهُ لَهَدَيْنَاكُمْ سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَجَزِعْنَا أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ ﴿٢١﴾ ﴾ ابراهيم .!!

واتە: ( ئەو ڕۆژەی كە قیامەت بەرپائەبێت، هەموان لەبەر دەسەڵاتی خودا دەرئەكەون، ئینجا لاوازو بێ دەسەڵاتەكان، ئەوانەی كوێرانە شوێن ملهوڕو ستەمكارەكان كەوتبون، ئەڵێن: بەوانەی خۆیان بە گەورە دانابوو، بێگومان خۆ ئێمە شوێن ئێوە كەوتبوین؟! ئێمە

گوێ ڕایەڵو فەرمان بەرداری ئێوە بووین! ئایا ئەمڕۆ ئێوە ناتوانن هەوڵێك بدەن تا ئەندازەیەك لە سزای خودا لەسەرمان کەم بێتەوە، لەوەڵامیانداووتیان، ئەگەر خودا هیدایەتی ئێمەی بدایە، ئێمەش هیدایەتی ئێوەمان ئەدا (ئەڵبەت ڕوونو ئاشکرایە ئەوانە بە دەسەڵاتدارو بێدەسەڵاتیانەوە لە دونیادا نەك هیدایەتیان نەئەویست، بەڵکو دژیشی ئەوەستانو پیلانیان ئەگێڕا، ئیتر چۆن خودای گەورە هیدایەتی ئەو جۆرە کەسانە ئەدات، خۆهیدایەت دان بەزۆر نییە ) ئێستەش بۆ ئێمە چون یەکە، هاوارو ئاهو ناڵە بکەین، یان دان بەخۆدا بگرین، چارمان نییەو ڕزگاربونمان ئەستەمە).

پەیوەندی نێوان ئەم دووئایەتە بەڕاستی ڕوونو ئاشکرایە، بە ڕاستی ناوەڕۆکی هەردوو ئایەتەکە قسە کردنە لەبارەی مەسەلەیەکی گرنگ، ئەویش مەسەلەی دەستو پێوەندو شوێن کەوتوانە، ئەوان بەڵگەیان نییە لەلای خودای گەورە لە سەر ئەوەی کەبێهێز بوون لەڕووی تواناو زیرەکیانەوە، ڕازی بوون بەخۆبەدەستەوەدان، پەیوەست بوون بە بێبڕوایی‌و تاریکی‌و بەزۆری شمشێری گەورەکانین، بۆ ئەوەی تۆمەت لەسەرخۆیان لابدەن، ئەمەش پۆزشێکە بەردەوام دووبارە ئەکرێتەوە لەهەموو کاتێکداو خەڵکی بەشێوازی جۆراو جۆر ئەیڵێن، بەڵام لەیەكواتادا خۆی دەبینێتەوە ئەویش ﴿ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ ﴾ النساء/٩٧ واتە:(ئێمە لاوازو بێ دەسەڵات بووین لەسەر زەوی).

خودای گەورە بەبێ گومان ئەم بیانوەی بڕیوە هەر لەدونیا، بەهەمان شێوە لەدوارۆژیشدا، هەر لەدونیا خودای گەورە شوێن کەوتوانی فیرعەونی لەناو برد، هەروەها ستەمکارەکانو گەورەکانی لەناو برد، خودای گەورە لەبارەی فیرعەونەوە ئەفەرموێت:

﴿ فَأَخَذْنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذْنَٰهُمْ فِي ٱلْيَمِّ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾القصص. واتە:(تۆڵەمان لەفیرعەونو لەشکرو سەربازەکانی سەندو فڕێمان دایە ناو ئاوی نیلەوە، ئینجا سەرنج بدە ئەی موحەممەد(ﷺ) سەرئەنجامی ستەمکاران چۆن بوو ).

خودای گەورە کۆشكو تەلاری فەرماندارو فەرمانبەری تێكو پێك شکاند، خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَدَمَّرْنَا مَا كَانَ يَصْنَعُ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُۥ وَمَا كَانُوا۟ يَعْرِشُونَ ﴿١٣٧﴾ ﴾ الأعراف واتە:(ئەو کۆشكو تەلارانەی فیرعەونو دارو دەستەکەی‌و گەلەکەی دروستیان کردبوو تێکماندو ڕووخاندمان، هەروەها ئەو ڕەزو باخانەی کە کەپریان بۆ کردبوون ).

★ ئیمامی (إبن القیم) (ڕەحمەتی خودای لێبێت) لە کتێبی ( **طریق الهجرتین** ) دا باسی چەند پلەیەك ئەکات، لەوانە، پلەی مرۆڤە ئاژەڵ ئاساکان، ئەوانەی لاسایی بێبڕواو ستەمکارەکان ئەکەنەوە، خودای گەورە پەنامان بدات .

ئایەت زۆرە کە ئاگادار کردنەوەو هۆشیار کردنەوەی تێدایە بۆ لاسایی کردنەوەی کوێرانە، هەروەها قورئانی پیرۆز بانگەواز ئەکات بۆ ڕازی نەبوون بەژێردەستەیی‌و زەلیلی‌و ڕێگای کوفروتاریکی، پەنا بەخودای گەورە.

ئیسلام هاتووە بۆ ڕزگارکردنی خەڵکی لەکۆت‌و پێوەندو بەربەستەکان، میللەت بەزانستی دروست‌و ڕزگار بوون بەرەو پێشەوە ئەچێت .

★ ئیمامی شافیعی ڕاستی فەرمووە، کاتێك بە نەفسی خۆیدا هەڵئەدا، چونکە سەرشۆڕی بە کوفر ئەزانێ، وەکو لەدیوانەکەیدا هاتووە، میللەتی ئێمەش بەهۆی سەرشۆڕی‌و سوکایەتیەوە دواکەوتووەو بەرەو دوائەچێت، هەروەها نەزانین هۆکارێکی ترە بۆ دواکەوتوویی. ﴿ وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ ﴾ إبراهیم: ٢٢ واتە: (کاتێك هەموو شتێك تەواو بوو...) ئالێرەدا شتێك بە بیری مرۆڤدا دێت کە پێش قسەکەی شەیتان کەوتووە، ئەویش جوڵاندنی شوێن کەوتوانی‌و ئەوانەیە کە ئەویان پەرستوە، ئەوان ڕاپرسیان کردووە لەنێوان خۆیانداو ڕێکەوتوون لە سەر ئەوەی لێپرسینەوە لەگەڵ شەیتاندا بکەن‌و داوای جێبەجێ کردنی بەڵێنەکانی لێدەکەن‌ووەکو شەپۆلێك هێرش ئەکەنە سەری‌و داوا لەشەیتان ئەکەن کە بۆچی کەوتونەتە ئەم چاڵ‌و کون‌و کەلەبەرانەوە، بە هەموو هێزی خۆیان هاوار ئەکەن: ئەی شەیتان .. ئەی ئیبلیس .. ئەو بەڵێنانە چی لێهات کە بەئێمەت ئەدا؟! ئەو شتانە لەکوێن کە بۆ ئێمەت جوان ئەکرد؟! لەوانەیە ئەوان بەزۆر ڕایان کێشابێت‌وخستبێتیانە سەر دوانگەکە، کە لە ئاگر دروست کراوە، یان ئەوە تا بچوك بۆتەوەو ئەم قسانە ئەکات‌وەکو هەوڵێك کە بە پێی توانا بتوانێت سوکی‌و ڕیسواییەکەی بشارێتەوە، هیچ بیانوو پۆزشێکی بۆ نەماوەتەوە، چونکە بێ گومان شتەکانی بەسەر چووە، هەموو خەڵك گەڕاونەتەوە بۆ شوێنی خۆیان، شەیتان‌و کۆمەڵەکەی بۆ ئاگرو دۆزەخ، کۆمەڵی خوداش بۆ بەهەشت، بەڵێنی شەیتان‌وەکو ئەم‌وەسفەی خودای گەورەوایە لەم ئایەتەدا بۆ بێباوەڕەکان وەك ئەفەرمووێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَعْمَٰلُهُمْ كَسَرَابٍۭ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ

ٱلظَّمْـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمْ يَجِدْهُ شَيْـًٔا وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٣٩﴾ ﴾النور. واتە:(ئەوانەی كەرِێبازی كوفریان گرتۆتەبەر كردەوەكانیان‌وەك تراویلكەو سەرابێك‌وایە لەبیابانێكدا كە بریسكە بداتەوە، كەسێكی تینووو‌ابزانێت ئاوەو بەخێرایی بۆی بچێت، كاتێك ئەگاتە لای ئەبینێت هیچ نیە، ئەوسا كاتێك بە خۆی ئەزانێ ژیان كۆتایی هاتووەو قیامەت هەستاوە، خوداش بەگوێرەی كردەوەكانی خۆی لێپرسینەوەی لەگەڵ دەكات‌ولێی ئەپرسێتەوە، خوداش بەخێرایی لێپرسینەوە ئەنجام ئەدات) .

خودا بەڵێنی داوە، بێگومان بەڵێنەكەشی ڕاستە، بەڕاستی خودای پاك‌و بێگەرد بە توانایە، كە بەڵێنەكانی جێبەجێ بكات‌و هیچ شتێك لەخودا یاخی نابێت ئەگەر بیەوێت. بێگومان خودا بەڵێنی داوە بەزیندوو كردنەوەو بەهەشت‌و ئاگر، پاداشت بۆ گوێ ڕایەڵان‌و سزاش بۆ یاخی بووان، بەڵێنی ڕزگاربوون‌وسەلامەتی بە پێغەمبەران‌و شوێن كەوتوانی داوە، بێگومان ڕاستگۆش بووە لە بەڵێنەكەیدا، شەیتانیش ئەڵێت: من بەڵێنم پێدا بوون كە زیندوو بوونەوەو بەهەشت‌و ئاگرو پاداشت‌و سزا نیە، بەڵام من درۆم لەگەڵ كردن .

بەڵێ سەرابی بەڵێنەكان دەركەوت، درۆكانی ئاشكرابوون، ڕاستی شتەكان دەركەوت، بێگومان گشتی پوكایەوە، بەیەك‌ووشەی شەیتان (درۆم لەگەڵ كردن) بەهەموو دەنگیان هاواریان ئەكرد، هەتا ماندوو بوون‌و دەنگیان نووسا.

(درۆم لەگەڵ كردن )ووشەیەكە كە هیچ هیوایەك لە دەروونیاندا ناهێڵێ، هەموو ئومێدێكیان تێك ئەدات‌و هیچ ئاواتێكیان نامێنێ، ئەگەر چی شەیتان كەم ڕاستگۆیە، بەڵام لێرەدا ڕاستگۆیە، چونكە هەموو فەرمانەكان بۆ خودایەو توانای ڕاكردنی نیە.پاشان بەچەند‌ووشەیەكی سوك‌و شاراوە،وەكووتارێك بێ لایەنی‌و بێ بەری بوونی خۆی ئەدات بەڕوویانداو‌ئەڵێت:﴿ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ﴾ ابراهیم: ٢٢ واتە:(من هیچ دەسەڵات‌و زۆرێكم نەبوو بەسەرتانا، تەنها ئەوە نەبێت كە بانگم كردن بۆ گومڕایی، ئێوەش بە دەنگمەوە هاتن).

ووشەی (دەسەڵات) بەلای زۆرێك لە زانایانی تەفسیرەوە بەمانای (بەڵگەو دەلیل) دێت، بە مانای: من هیچ بەڵگەو دەلیلێكم پێ نەبوو لەسەر ئەو شتەی كە بانگم دەكردن بۆی، لە هاوەڵ

دانان بۆ خوداو بێ باوەڕیو سەرپێچی کردن، بەڵکو تەنها ئاڵای ئارەزووم بۆ بەرزکردنەوە، ئێوەش پێشوازیتان لێکرد، بەبێ بیرکردنەوە لە ئەنجامەکەیو بەبێ تێڕوانینێکی دروست.

هەندێکی تر لەزانایان ئەڵێن: مەبەست لە (دەسەڵات) بریتیە لە هێزو توانا، بە مانای ئەوەی من زۆرم لێنەکردن بۆ ئەوەی بێباوەڕبنو هاوەڵ بۆ خودا پەیدا بکەن، بەڵکو بە ئارەزووی خۆتان پێشوازیتان لێکردم، دووریش نیە هەردوو ماناکە بگەیەنێت .

بەڕاستی شەیتان ئەیەوێ خۆی بێ بەری بکاتو تاوانەکە بخاتە سەر شوێن کەوتوانی، لە ئەنجامی ئەوەی کردوویانە لە کردەوەکانیان، ئەیەوێت خراپەکانی ڕابردووی ڕاست بکاتەوە، بەوەی ڕوونی بکاتەوە کە هیچ کارێکی نەکردووە:﴿ إِلَّآ أَن دَعَوۡتُكُمۡ ﴾ ابراهیم: ٢٢. واتە:(تەنها ئەوەندە نەبێ بانگم کردن).. بەم شێوەیە هەموو ئەو شتانەی کردوونی ئەیشارێتەوە لە سەرخستنی خراپەو وەسوەسە خستنە دڵی خەڵکەوە، بەیەك ووشە (بانگم کردن). ئەمووشەیە خۆ بێبەری کردنە، بەڵێ لەهەمان کاتداووشەی شەرمەزاریو ڕیسواییە بۆ شوێن کەوتوانی، بێ گومان ئەم ووشەیە دڵیان پڕ ئەکات لە دەردە سەریو نەگبەتی، چونکە شەیتان بانگی کردوون، کاری ناشرینی بۆ ڕازاندونەتەوە، وەسوەسەی خستۆتە دڵیانەوە، بەڵێنی پێدابوون، هەزارانی لە ڕێ دەرکردووە، هاوڕێی دڵەکانیان بووە لەنهێنیو ئاشکرادا، ئەو ڕۆژەی بەنەفرەت کرا بە پەروەردگاریووتووە:﴿ قَالَ أَرَءَيۡتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِي كَرَّمۡتَ عَلَيَّ لَئِنۡ أَخَّرۡتَنِ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَأَحۡتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٦٢﴾ ﴾ الإسراء . واتە:(شەیتان بەبێ شەرمانەوتی: ئا ئەمەیە کەڕێزت داوە بەسەر مندا؟ سوێند بە خودا ئەگەر دوام بخەیتو بم هێڵیتەوە تا ڕۆژی دوای، ئەوە بێگومان هەموو نەوەکانی گومڕاو سەرگەردان ئەکەم جگە لە کەمێکیان کە دەسەڵاتم بەسەریاندا نیە)، خودای گەورەش پێی فەرموو: ﴿ قَالَ ٱذۡهَبۡ فَمَن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمۡ جَزَآءٗ مَّوۡفُورٗا ﴿٦٣﴾ وَٱسۡتَفۡزِزۡ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتَ مِنۡهُم بِصَوۡتِكَ وَأَجۡلِبۡ عَلَيۡهِم بِخَيۡلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِ وَعِدۡهُمۡۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿٦٤﴾ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٞۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلٗا ﴿٦٥﴾ ﴾ الإسراء . واتە:(خودای گەورە فەرمووی: بڕۆ ئەوەی شوێنی تۆ بکەوێت لە ئەوان، ئەوا بێگومان دۆزەخ پاداشتی هەمووتانە، پاداشتێکی مسۆگەرەو جێگەی هەمووتانی تێدا ئەبێتەوە، بڕۆ چیت لە دەست

دێت درێغی مەکە، ئەگەر توانیت هەرکەسێك لەو بەدبەختانە دابڕی بە بانگکردنو هاندانیان بۆ تاوانکاری دایانبڕە، بەهۆی لەشکری سوارو پیادەی خۆتەوە هێرشیان بۆ بەرەو هاوبەشییان بکە لەماڵو سامانو منداڵو نەوەیاندا (بەماڵو سامانی حەرامو منداڵی زۆڵ ....... هتد) ئەوەندەش بەڵێنو ئومێدیان پێبدە، کە سەریان لێ بشێوێنی، هەرچەندە بەڵێنو هاندانی شەیتان جگە لە فریودانو فێڵ کردنو ساختە، شتێکی تر نیە * بەڕاستی ئەی شەیتانی نەفرەت لێکراو دەسەڵاتت بەسەر بەندەکانی من دا نابێتو هەوڵو کۆششی تۆ کاریان تێ ناکاتو پەروەردگاری تۆ ئەی ئیماندار بەسە بۆ پارێزگاریو پاراستنت).

**جا تۆ جیاوازی بکە لەنێوان ئەم دوو جۆرە کردەوەیەدا:**

شاڵاوو تەوژمی شەیتان بۆ سەر خەڵکی بە بانگ کردنو هاوارو بانگەشەی بێباوەڕیو هاوەڵ دانان بۆ خوداو سەرپێچیو دابڕینیان، بە لە شکرو سوارەی خۆیو دارو دەستەکەیو بەشداری کردن لەماڵو سامانو نەوەکانیانداو بەڵێنی درۆو ئەمەش وتەی خۆیەتی: ﴿ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥ ﴾الإسراء: ٦٢ بەواتای بەزۆر ڕایان ئەکێشم بۆ خراپەو گومڕایی هەتا توانام هەبێت، ئەم قسەیەشی کە ئەڵێت: ﴿ دَعَوْتُكُمْ ﴾ بانگم کردن، سەیرکە شەیتان چۆن ئەیەوێت هەر درۆ بکاتو ئەیەوێت شتەکان بەڕێ بکات، هەموو ئەو شتانەی پێی هەڵساوە، لەیەك ووشەدا کورتی کردۆتەوە، بەڵام جێبەجێ کردنی لەسەر زەویدا، پێویستی بە چەندەها باسو لێکۆڵینەوەهەیە، هەروەها قسەکەی کە دەڵێت: ﴿ دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ﴾ إبراهيم: ٢٢ واتە: (بانگم کردن بەدەنگمەوە هاتن) بەم جۆرە هەموو شتێك تەواو ئەبێت، بەڵام ئایا چوون بەدەم شەیتانەوە تەنها بە بانگ کردنی شەیتان ئەبێت؟! ئایا شوێن کەوتوانی بێ دەنگ ئەبن؟! گوێ ڕاگرە بزانە خودای گەورە چی ئەفەرمووێت لەبارەیوەڵامی شوێن کەوتوان بۆ گەورە کانیان، لە دوای قسەی گەورەکانیان: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَآ أَن نَّكْفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَـٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾سبا. واتە:(دووبارە لاوازو ژێر دەستەکان بەزۆردارو دەسەڵات دارەکان ئەڵێن: ناوانیە بەڵکو نەخشەی شەوو ڕۆژ بوو کاتێك فەرمانتان پێدەدایین بڕوامان بەخودا نەبێتو

شوێن ڕێبازەکەی نەکەوین‌و هاوەڵی بۆ بڕیار بدەین، پاشان هەموان پەشیمانیان لەدونیادا نەشارنەوە، بە تایبەت کە ئەبینن سزاو تۆڵە بۆیان ئامادەیە، ئێمەش چەندان کۆت‌و زنجیری ئاگرینمان کردە گەردنی ئەوانەی کە بێ بڕوابوون، ئایا جگە لەوەی کە کردیان پاداشت ئەدرێنەوە؟). بەڵێ، ئەوە ئەخشەی شەوو ڕۆژ بوو، ئەخشە سازییەکی ڕێك‌و پێك بەپێی هەنگاوەکانی شەیتان بۆ ئەوەی لەخشتەیان بەرێت، پەنا بە خودا ..... ) پاشان شەیتان پێیان ئەڵێت: ﴿ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُم ﴾ إبراهيم: ٢٢ واتە:(لۆمەی من مەکەن لۆمەی خۆتان بکەن) کەوابێ کاتێ ئەوان هاوارەکەن بەسەریداو لۆمەی ئەکەن بەوەی کە کارە خراپەکانی بۆ ڕازاندوونەتەوە، بەڵام شەیتان لۆمەکە ئەداتەوە بەسەریاندا، ئەم پرسیارە ئەدەن بەڕووی شەیتاندا: بۆچی لۆمەی ئەکەن؟ ئایا ئەو بانگی نەکردوون؟ هەروەك خۆشی دانی پێداناوە، بەڵام شەیتان‌وای لێك ئەداتەوە کە ئەمە ئەو تاوانە نیە کە شایەنی سزا بێت‌و تەنانەت شایەنی لۆمەش نیە . بەڵێ هیچ بیانوییەکیان نیە لەلای خودا بەوەی شوێن شەیتان کەوتوون‌وباوەڕیان بە بەڵێنەکانی کردووە، چونکە بە ڕاستی هەمووومان ئاگادار کراوینەتەوە، خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ١٤٢ ﴾ الأنعام. واتە:(شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون چونکە بێ گومان دوژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە ) .

پاشان شەیتان ئەڵێت: ﴿ مَّآ أَنَا۠ بِمُصۡرِخِكُمۡ وَمَآ أَنتُم بِمُصۡرِخِيَّ ﴾ إبراهيم: ٢٢ واتە:(بەڕاستی من ناتوانم بێم بەهاواری ئێوەوە، وە ئێوەش ناتوانن بێن بە هاواری منەوە).

لە سەر قسەکانی بەردەوام ئەبێت، هەتا ئەگاتە ئەم ڕاستیە، ئەویش ئەوەیە: کە ناتوانێت بە هانایانەوە بچێت‌و ڕزگاریان بکات، هەروەك چۆن ناتوانن ئەوانیش بە هانایەوە بێن‌و ڕزگاری بکەن، بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت کە جگە لەسەراب‌و فێڵ هیچی لا نەبووە، جگە لە ئومێدی درۆو بەڵێنی بۆش هیچی تری پێ نەبووە، هیچ کەسێك ناتوانێ شتێك ببەخشێت کە توانای ئەوشتەی نەبێت، لێرەدا شەیتان ناتوانێت خۆی ڕزگار بکات؟! شەیتان کەی توانیویەتی شتێك ببەخشێت بە شوێن کەوتوانی؟! کەی لەبەڵێنەکانیدا ڕاستگۆ بووە؟! ئای چەندە خراپە ئەو کەسەی شوێن شەیتان ئەکەوێت‌و بڕوای پێنەکات‌و بەڵێنەکانی بە ڕاست ئەزانێت !

لە کۆتاییدا شەیتان پێیان ئەڵێت:﴿ إِنِّي كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ﴾إبراهیم: ٢٢ واتە:(بەڕاستی من باوەڕم بەوە نەبوو کە کاتی خۆی منتان کردبوو بە شەریك‌و هاوبەش لەپێشدا). ئاوا شەیتان پەرستشەکەیان ئەداتەوە بەڕوویانداو بێباوەڕی پێشان دەدا بەرامبەر پەرستشەکانیان‌و خۆی بێ بەری ئەکات لە هاوەڵ دانانەکەیاندا کەئەویان کردبوو بە هاوەڵی خودای گەورە. ئەمەش دان پێدانانە، کە شوێن کەوتوانی کردوویانە بە هاوەڵ‌و شەریکی خودای گەورەو پەرستشێکی پڕو پوچیان بۆ کردووە، بەم جۆرە بۆ شوێن کەوتوانی ڕوون ئەکاتەوەو بەوانە ئەڵێت کە ئەیان پەرست‌و یاسایان لەووەردەگرت‌و سروشتی خۆیان تێك ئەداو مل کەچییان بۆ ئەکردو پشتیان ئەکردە فەرمانی خوداو سوننەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کە هەموو بەڵێنەکانی درۆ بوون، کۆتایی پەیوەندیەکەشیان بریتیە لە خۆ بێ بەری کردن‌و جیابوونەوەو شەیتان توانای ئەوەی نیە ڕزگاریان بکات‌و سەریان بخات، لەهیچ یەکێك لەو شوێنانەی کەپێویستیان بە سەرکەوتن‌و پشتگیری هەیە.

لە کۆتایدا ئەوە بزانن کەووتەی خودای گەورە ڕاستە، بەڵێنەکانی دروستە، هەر شتێکی پێووتبین ڕەحمەتە بۆ ئێمە، ئەو هەواڵانەی پێی داوین بە بێ گومان ڕوو ئەدەن بۆ ئەوەی پەندو ئامۆژگاری لێوەرگرین، پێش ئەوەی هەموو شتێکمان لەدەست دەربچێت، چونکە لەڕۆژی دواییدا پۆزشی ستەمکاران هیچ سودێکی نیە، جا باخەڵکی پەلە بکەن بۆ گەیشتنیان بە دینی خودای گەورە، با پەیوەندی خۆیان لەگەڵ شەیتان‌و سەربازەکانیدا بپچڕێنن‌و گوێ بیستی ئەمووتەیەی خودای گەورە بن کە ئەفەرمووێت: ﴿ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَٰنَ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ ٱعْبُدُونِى هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ ﴾ یس. واتە: (خودای گەورە گلەیی لە یاخی بووەکانی ئەوەی ئادەم ئەکات‌و ئەفەرمووێت: مەگەر من پێم ڕانەگەیاندن کە شەیتان نەپەرستن، چونکە ئەو بەڕاستی دوژمنی ئاشکرای ئێوەیە، بەڵکو تەنها من بپەرستن کە هەر ئەوەیە ڕێگەو ڕێبازی ڕاست‌و دروست ).

جاوای بۆ ئەو کەسانەی کە دڵیان ڕەقە بەرامبەر بەیادی خودا، لەو ڕۆژەی کە هیچ فریاد ڕەس‌و ڕزگار کەرێکیان نیە .

# بـــــەشــــــی دووەم

## ( جـنـــــۆکە )

( **الجن** ) ( **جنۆکە** ) پێچەوانەی مرۆڤە. ( **الجان** ) تەنها یەکێکە لە جنۆکە، ووتراوە: شەو دایپۆشیوتاریکی داهاتو شاردیەوە، هەرشتێ لێتەوە دیار نەبێ ئەوا داپۆشراوە.

* ( **إبن منظور** ) ئەفەرموێت: جنۆکە ناسراوە بە ( **الجن** ) لە بەرئەوەی دیارنینو شاراوەنو لە بەرچاو نین، هەر ئەوەشە بەکۆرپەلە ئەڵێن: (الجنين)، چونکە لەناو سکی دایکیدا شاراوەیە.

خەڵکانی سەردەمی نەزانی لەپێش ئیسلامدا بە فریشتەیانووتوە جنۆکە، لەبەر دیار نەبوونیان لەچاوی مرۆڤ، جنۆکەش بریتییە لە لاشەی ئاگرینو توانای خۆ گونجاندنو خۆنواندنیان هەیە بە چەند شێوەیەك، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ ﴾الحجر. واتە:(جنۆکەشمان پێشتر لە ئاگرێکی بەتین دروستکرد ).

* ( **البیضاوی**) ئەفەرموێت: لاشەی جنۆکە شاراوەیەو ڕووکاری ئاگرینو هەواییان هەیە.

* (**أبو علي بن سينا**) ئەفەرموێت: جنۆکە گیان لەبەری هەواییینو بەشێوەی جیاواز خۆیان ئەنوێنن، لە پێناسەی شەرعیشدا لەمە زیاتر نەوتراوە.

### بنەچەو بنەڕەتی جنۆکەو دروست بونیان

* (قورتوبی) ئەفەرموێت: زانست پەروەران بیرو بۆچونی جیاوازیان هەیە سەبارەت بە بنەڕەتی جنۆکە، لە (حەسەنی بەسری)یەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: بە ڕاستی جنۆکەوەچەو نەوەی ئیبلیسن، مرۆڤیشوەچەو نەوەی ئادەمن، لە هەردوو لاش باوەڕدارو بێباوەڕ هەیەو بەشدارن لە پاداشتو سزادا، هەر کەس لەگەڵ باوەڕداراندا بێت، ئەوا خۆشەویستی خودایە، هەر کەسیش لەگەڵ بێباوەڕاندا بێت ئەوا شەیتانە .

* ( **الضحاك** ) لە ( **ئیبن عەبباس** ) ەوە (ڕەحمەتی خودای لێبێت) ئەگێڕیتەوە کە جنۆکە نەوەی ( **الجان** )نو شەیتان نین، هەیانە باوەڕدارە هەشیانە بێباوەڕە، شەیتانەکانیش نەوەی ئیبلیسن، نامرن هەتا مردنی ئیبلیس.

ئەو بۆچونانەی کەجیاوازیان تێدا نیەو لە دەقی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﴿ﷺ﴾ هاتوەو ئاماژەی پێکراوە ئەوەیە کە بەڕاستی جنۆکە لە ئاگر دروست کراوە.

خودای گەورە ئەفەرموویت: ﴿ وَخَلَقَ ٱلْجَآنَّ مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ ﴿١٥﴾ ﴾الرحمن. واتە:(جنۆکەی دروستکرد لە بڵێسەی ئاگرێکی بێ دوکەڵ).. (ئیبن عەبباس) ئەفەرموویت: ﴿ مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ ﴾ واتە: لەبڵێسەی ئاگرێکی پوخت، بۆچوونی سەیید قوتبوایە کە مەبەست بە (مارج) شەوقو بڵێسەیە، وەکو گڕی ئاگر لەگەڵ بادا . خودای گەورە لەسەر زاری ئیبلیس ئەفەرموویت: ﴿ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾ ﴾الاعراف. واتە:(شەیتان ووتی: من لە ئادەم چاکترم، چونکە منت لە ئاگر دروستکردووەو ئەوت لە قوڕ دروست کردووە).

خودای گەورە ئەفەرمویت: ﴿ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ ﴾الحجر. واتە:(جنۆکەشمان پێشتر لە ئاگرێکی بەتین دروستکرد ).

پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ ئەفەرمویت: ﴿خلقت الملائكة من نور، وخلق الجان من مارج من نار، وخلق أدم مما وصف لكم ﴾ (رواه مسلم). واتە:(فریشتەکان لە (نور) دروستکراون، جنۆکەکانیش لە بڵێسەی ئاگرێکی بێ دوکەڵ دروستکراون، وە ئادەمیش لەوە دروستکراوە کە بۆم باس کردوون).

ئەم دەقانەی باس کران ئەوە ئەسەلمێنن کە جنۆکەکان لە ئاگر دروستکراون، لێرەدا پرسیارێکی گرنگ دێتە پێشەوە:ئایا جنۆکە بەئاگرێتی خۆی ماوەتەوە یان گۆڕاوە بۆ شتێکی تر؟

لە ڕاستیدا جنۆکە ئاگر نین، بەڵکو خودای گەورە ڕەچەڵەکیانی لە ئاگر دروست کردووە، هەروەکو چۆن ڕەچەڵەکی مرۆڤی لە خۆڵو قوڕ دروست کردووە، مرۆڤ ڕەچەڵەکی لە قورە، بەڵام قوڕێکی ڕەها نیە، بەڵکو گیان لەبەرێکی زیندووەو ژیری هەیە، هەروەها دەمارو ماسولکەو گۆشتو ئێسکی هەیە .......... بەهەمان شێوە جنۆکە بنەچەیان لە ئاگرە بەڵام گۆڕاون بۆ شتی تر.

* (ئەبوو دەرداء ) ئەگێڕێتەوەو ئەفەرمویت: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ نوێژی ئەکردو گوێمان لێبوو ئەیفەرموو: (أعوذ بالله منك ) واتە:(پەنا بە خودا ئەگرم لە تۆ)، پاشان فەرمووی: (ألعنك بلعنة الله ثلاثا ) واتە:(سێ جار فەرموی: نەفرەتی خودات لێبێت)، پاشان دەستی

ڕاکێشا وەکو ئەوەی بیەوێت شتێك وەربگرێ، کاتێك لە نوێژ بۆوە، ووتمان: ئەی پێغەمبەری خودا گوێمان لێبوو لە نوێژەکەتدا شتێکت نەفەرموو، کە لەمەو پێش گوێ بیستی نەبووبووین، بینیمان دەستت ڕاکێشا، ئەویش فەرمووی: بە ڕاستی ئیبلیسی دوژمنی خودا بە بڵێسەیەك ئاگرەوە هات، تا بیکاتە دەمو چاومەوە، منیش سێ جار ووتم: پەنا بەخودا دەگرم لە تۆ، پاشان سێ جاروتم: نەفرەتت لێ ئەکەم بە نەفرەتی خودا، هەر نە گەڕایە دواوە، پاشانویستم بیگرم، سوێند بەخودا ئەگەر دوعاکەی سولەیمانی برامان نەبوایە، ئەم بەستەوە تا منداڵانی مەدینە یاریبان پێ بکردایە (موسلیم گێڕاویەتەوە).

ئەم فەرمودەیە ئەوەمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە کە ئەم شەیتانە پێویستی بەئاگر بووە تا بیکات بە ڕوخساری پێغەمبەردا ﴿ﷺ﴾ چونکە خۆی ئاگر نەبووە .

## بـــاسی سەرەتـــای دروست بوونـــی

خوێنەری بەڕێز ئەوە بزانە کە خودا جنۆکەی لە پێش مرۆڤدا دروست کردووە بە ماوەیەك کە کەس نازانێ ئەو ماوەیە چەندە بووە، تەنها خودای گەورە خۆی نەبێت، خودای گەورە ئەفەرموێت:﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن صَلْصَالٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٦﴾ وَالْجَانَّ خَلَقْنَاهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ السَّمُومِ ﴿٢٧﴾ ﴾الحجر. واتە:( سوێند بەخودا ئێمە سەرەتا ئینسانمان لە قوڕێکیوشك دروست کرد کە پێشتر قوڕێکی ڕەشباوو ترشاو بوو، جنۆکەشمان پێشتر لە ئاگرێکی بەتین دروستکرد کە بەوردیلە کونەکاندا تێدەپەڕێت). ئەم پێشترەش مانای ئەوماوەیەیە کە جنۆکە نیشتەجێی زەوی بووە لە پێش مرۆڤدا، هەروەها خودا ئەفەرموێت: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاریات. واتە:(من جنۆکەو ئادەمیزادم تەنها بۆ ئەوە دروست کردووە بەندایەتیم بۆ بکەن).

ئالوسی لە بارەی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە ئەفەرموێت: لەوانە یە پێش خستنی جنۆکە بۆ پێش خستنی دروستکردنیان بێت لە پێش دروستکردنی مرۆڤ لەم بونەدا.

هەندێ لە یارانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەو ماوەیەیان دیاری کردووە، لەوانەش (عبداللەی کوڕی عومەر) کە ئەفەرموێت: جنۆکە هەزار ساڵ پێش ئادەم هەبوون، خوێنیان ڕشتوە، خودای گەورەش سەربازی لە فریشتەکان بۆ ناردوونو دەریان کردوون بۆ دەریاکان.

خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ البقرة.

واتە: (ئەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ باسی بکە کەلە دێرزەماندا پەروەردگارت بە فریشتەکانیووت، بەڕاستی من ئەمەوێت جێنشینێك لەسەر زەویدا دابنێم بۆ ئاوەدانیو دینداری، فریشتەکان ووتیان:ئایا کەسێکی تێدا دەکەیتە جێنشین، کە خراپەو تاوانی تێدا بچێنێتو خوێن ڕێژی تێدائەنجام بدات؟! لە کاتێکدا ئێمە تەسبیحاتو سوپاسو ستایشت ئەکەینو قەدرو ڕێزی تۆ چاك ئەزانینو بە دوورت ئەگرین لەو شتانەی کەشایستەی تۆ نین، لەوەڵامیاندا خودا فەرمووی: ئەوەی من ئەیزانم ئێوە نایزانن). (عبداللەی کوڕی عباس) لە بارەی ئەم ئایەتەوە ئەفەرمووێت: ئەوانەی خوێنیان ڕشتوە جنۆکە بوون، کە نیشتە جێی زەوی بوونە لە پێش ئادەمدا (سەلامی خودای لێبێت).

## بـــوونی جنۆکــــــــە

لە قورئانو فەرموودەی پێغەمبەردا ﴿ﷺ﴾ بونی جنۆکە چەسپاوەو زانایانیش کۆدەنگن لەسەر ئەمە، ئەوەی ئینکاری بوونیان بکات ئەوا بێباوەڕە، چونکە ئینکاری لەشتێك ئەکات کە لە دیندا بە پێویست زانراوە.

## توانای خۆ دەرخستنیان بە شێوەی جۆراو جۆر

* (بدر الدين الشبلي) ئەڵێت: جنۆکە توانای خۆدەرخستنیان هەیە لە شێوەی مرۆڤو ئاژەڵ دا، ئەتوانن لە شێوەیووشترو مانگاو مەرو ئەسپوماینو گوێ درێژدا خۆیان پیشان بدەن، هەروەها ئەتوانن لەشێوەی مرۆڤو باڵندەش خۆیان دەربخەن، هەروەك چۆن شەیتان لە شێوەی سوراقەی کوڕی مالیکدا هات بۆلای قوڕەیش، لە کاتی شەڕی بەدردا، وەك خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلْيَوْمَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَإِنِّى جَارٌ لَّكُمْ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكُمْ إِنِّىٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوْنَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٤٨﴾ ﴾ الأنفال.

واتە:(کاتێك شەیتان بەوەسوەسەو خەیاڵ هەموو کردەوە نا پەسەندو ناڕەواکانی بۆ ڕازاندنەوەو پێیووتن: ئەمڕۆ هیچ کەس بەرەنگاریی ئێوەی پێناکرێت‌و دڵنیابن منیش پشت‌و پەنای ئێوەم، کاتێك ئەو دوو لەشکرە یەکتریان بینی، دەست بەجێ پاشەو پاش گەڕایەوەوووتی: بەڕاستی من لە ئێوە بێ بەریم، چونکە بە ڕاستی ئەوەی من ئەی بینم ئێوە نایبینن، دیارە شەیتان بینیویەتی کە چۆن فریشتەکان دەستە دەستە دا دەبەزن بۆ ئیمانداران، بۆیە لە ترساووتی: بێگومان من لە خودا ئەترسم، تۆڵەی خوداش زۆر سەخت‌و بەزەبرە).

هەروەها شەیتان خۆی‌وەکو گەورە پیاوێکی نەجدی لێکردووە، لە کاتی کۆبوونەوەی سەرانی قوریش لە (دار الندوة) بۆ ڕاوێژ کردن لە بارەی پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ کە بیکوژن، یان زیندانیی بکەن، یان دەری بکەن، لەشاری مەککە .

(ئیبن عابدین) ئەڵێت: خۆ دەرخستنیان لەشێوەی جیاوازدا چەسپاوە لە فەرمودەدا، بەڵام هەندێ ئینکاری لە توانای جنۆکە ئەکەن لەسەر ئەو خۆدەرخستنە.

هەروەها لە تایبەت مەندییەکانی جنۆکە ئەوەیە کە ئەوان مرۆڤ ئەبینن، بەڵام مرۆڤ زۆر بە کەمی ئەوان ئەبینن، خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ ﴿٢٧﴾ ﴾الأعراف. واتە: (بە ڕاستی شەیتان‌و داروده‌ستەکەی دەتان بینن لە جێگەیەکەوە کە ئێوە ئەوان نابینن).

## شوێنی جێگیربوون‌و خواردن‌و خواردنەوەی جنۆکە

جنۆکە بەزۆری لەو شوێنانە جێگیر ئەبن کە شوێنی سەرپێچی‌و شتی پیسن، وەك گەرماوو سەر ئاوو زبڵ دان‌وشوێنی بەخێوکردنی ئاژەڵ.

(زەیدی کوڕی ئەرقەم) لە پێغەمبەروە ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی (**إن هذه الحشوش محتضرة، فإذا أتى أحدكم الخلاء فليقل: اللهم إني أعوذبك من الخبث والخبائث**) (رواه أحمد وابو داود وابن الماجة). واتە:(بەڕاستی سەر ئاو جێگەی ئامادە بوونی شەیتان‌و جنۆکەکانە، ئەگەر یەکێکتان چووە سەر ئاو با بڵێت: خودایە پەنات پێئەگرم لە شەیتانی نێرو مێ)هەروەها لە فەرموودەدا هاتووە کە نوێژ کردن لەو شوێنانەدا نەهی لێکراوە، خواردنی جنۆکەش بریتیە لە ئێسك، هەروەك پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ نەهی کردووە لەوەی کە بەئێسك خۆمان پاك بکەینەوەو ووتویەتی: ئەوە خواردنی برا جنۆکەکانتانە.

**جنۆکەش ئەرکیان لەسەرەو گشتێتی پەیامی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەوانیش ئەگرێتەوە:**
زانایان هاوڕان لەسەر ئەوەی کە جنۆکە ئەرکیان لەسەر شانە بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکە دینیەکان، وەك لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئاماژەی پێکراوە: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاريات. واتە:(من جنۆکەو ئادەمیزادم تەنها بۆ ئەوە دروست کردووە بەندایەتیم بۆ بکەن).. هەروەها ئەم ئایەتەی کە ئەفەرمووێت: ﴿ قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَقَالُوٓا۟ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ﴿١﴾ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا ﴿٢﴾ ﴾ الجن.

واتە: (پێیان بڵێ وەحی و نیگام پێڕاگەیەنراوە کە بە ڕاستی دەستەیەك لە جنۆکە گوێیان گرتووە بۆ خوێندنەوەی قورئان، جاکە تەواو بووەووتویانە، بە ڕاستی ئێمە خوێندنەوەیەکی سەر سوڕهێنەرمان بیست، هیدایەت دەرە بۆ ڕێبازی ژیری و تێگەیشتن، ئێمەش باوەڕمان پێکردو هەرگیز کەس ناکەینە شەریك و هاوەڵ بۆ پەروەردگارمان) .
هەروەها ئەو ئایەتەی کە ئەفەرمووێت: ﴿ يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا۟ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ فَٱنفُذُوا۟ ۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَـٰنٍ ﴿٣٣﴾ ﴾ الرحمن.

واتە:(ئەی کۆمەڵی جنۆکەو ئادەمیزاد ئەگەر ئەتوانن بە بەشەکانی ئاسمان و زەویدا دەرچن و ئەو کارە ئەنجام بدەن دڵنیاش بن ئەو کارە بەهۆی ماددی و توانای مەعنەویەوە نەبێت ئەنجام نادرێت).

هەروەها ئایەتی تریش هەیە کە ئاماژە بە ئەرك و فەرمانی جنۆکە ئەکات، بە هەر حاڵ زانایان هاوڕان لە سەر ئەوەی جنۆکە هەموو ئەو ئەرکانەیان لە سەر شانە، کە خودای گەورە بە پێغەمبەری ڕاگەیاندوەو ناردویەتی بۆ جنۆکەو ئادەمیزاد.

* (**جابری کوڕی عبدالله** ) لە پێغەمبەرەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:(**كان النبي يبعث إلى خاصة قومه ويبعث أنا إلى الجن والأنس**). (رواه البخاري). واتە:(لە ڕابردوودا پێغەمبەرێك تەنها بۆ ئومەتەکەی خۆی ڕەوانە ئەکرا، بەڵام من ڕەوانەکراوم بۆ جنۆکەو ئادەمی).

## پاداشتی جنۆكە لەسەر كردەوەكانیان

زۆربەی زانایانوای بۆ ئەچن كە بە ڕاستی جنۆكە پاداشت دەدرێنەوە بەگوێ ڕایەڵیانو سزاش ئەدرێن لەسەر سەرپێچیان، بە پێی ئەم ئایەتەی خودای پەروەردگار كە ئەفەرمووێت: ﴿ وَأَنَّا مِنَّا ٱلْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا ٱلْقَٰسِطُونَ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ تَحَرَّوْا۟ رَشَدًا ﴿١٤﴾ وَأَمَّا ٱلْقَٰسِطُونَ فَكَانُوا۟ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴿١٥﴾ ﴾الجن. واتە: (لەناو ئێمەدا كەسانی مسوڵمانو خوداناسو كەسانی بێ دینو خودانەناسوسەركەشیش هەیە، ئەوەی مسوڵمان ئەبێت ڕێبازی سەر فرازی دۆزیوەتەوە، بەڵام خودانەناسو سەر كەشەكان بەسەریانەوە ناچێتو بەڵكو ئەبنە سوتەمەنی دۆزەخ ) . هەروەها خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟ وَلِيُوَفِّيَهُمْ أَعْمَٰلَهُمْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ الاحقاف. واتە:(هەر دەستەیەك، هەر كەسێك لە ئیمانداران یان لەبێ بڕوایان پلەو پایەی بەرز، یان نزمیان هەیە، ئەمەش بۆ ئەوەیە خودای پەروەردگار بەپێی كردەوەكانیان كە ئەنجامیان داوە بە تەواوی پاداشتیان بداتەوە، بە بێ ئەوەی هیچ جۆرە ستەمێكیان لێ بكات).

هەروەها لە ئایەتێكی تردا ئەفەرموێت: ﴿ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٧٤﴾ ﴾ الرحمن. واتە:(ئەو حۆریانە پێش ئەوان دەستی كەسیان بەرنەكەوتووە، نە لەگرۆهی ئادەم نە لە جنۆكەو پەری).

★ (**ئیبن حەزم**)و هەندێ لە زانایان لە ئەبو حەنیفەوە ئەگێڕنەوە كە جنۆكە هیچ پاداشتێكیان نیە تەنها ڕزگاربوون نەبێ لە ئاگر، چونكە لە قورئاندا هاتووە لە بارەی جنۆكەوە كە ئەفەرموێت: ﴿ يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُوا۟ دَاعِىَ ٱللَّهِ وَءَامِنُوا۟ بِهِۦ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ ﴾الاحقاف. واتە: (ئەی قەومەكەمانوەڵامی بانگخوازی خودا بدەنەوەو باوەڕی پێ بهێنن، خودا لە تاوانەكانتان خۆش ئەبێو لە سزای سەخت ئەتان پارێزێت)
★ (**زەیدی كوڕی سولەیم**) ئەفەرمووێت: پاداشتی جنۆكە ئەوەیە كەبپارێزرێت لە ئاگر، پاشان پێیان ئەوترێت ببن بە خۆڵ . كاتێك ئەهلی بەهەشت ئەچنە بەهەشتەوەو ئەهلی ئاگر

ئەچنە دۆزەخەوە، خودا بە باوەڕدارانی جنۆکە ئەفەرمووێت: ببن بە خۆڵ، لەو کاتەدا بێباوەڕ ئەڵێت: ﴿ وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ تُرَٰبًۢا ﴿٤٠﴾ ﴾ النبا. واتە:(خۆزگە خاكو خۆڵ بوومایە) زانایان هاوڕان لەسەر ئەوەی کە بێباوەڕانی جنۆکە لە ڕۆژی دوایدا سزا ئەدرێن هەروەکو چۆن خودا لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرمووێت: ﴿ وَأَمَّا ٱلْقَٰسِطُونَ فَكَانُوا۟ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴿١٥﴾ ﴾ الجن. واتە:(بەڵام لەڕێ لادەرەکان دەبنە سوتەمەنی دۆزەخ).

## چوونی جنۆکە بۆ ناو جەستەی مرۆڤ

* (**ئەبو حەسەنی ئەشعەری**) ئەفەرمویێت: خەڵکی بۆ چونیان جیاوازە لەبارەی جنۆکەوە، کە ئایا ئەچێتە لاشەی مرۆڤەوە یان نا؟

دوو بۆچوون هەیە هەندێکیان ئەڵێن: ئەستەمە کە جنۆکە بچێتە جەستەی مرۆڤەوە.

هەندێکی تریان ئەڵێن: گونجاوەو ئەبێت جنۆکە بچێتە لەشی مرۆڤەوە، بە پێی ئەم فەرموودەیە (**أخرج عدو الله، فإني رسول الله** ﴿ﷺ﴾). (رواه أحمد). واتە:(دەرچۆ ئەی دوژمنی خودا بە ڕاستی من پێغەمبەری خودام)، لە بەرئەوەی لەشی جنۆکە لە شێکی نەرمو شلە، لەوانەیە لەڕێگەی بۆ شاییەکانی لاشەی مرۆڤەوە بچنە ژوورەوە، وەکو چۆن ئاوو خواردن دەچنە سکی مرۆڤەوە.

## جنۆکەو گێڕانەوەی فەرموودە

ئەگونجێت جنۆکە لەمرۆڤەوە ئەو فەرموودانە بگێڕێتەوە کە گوێیان لێبووە، یان بەسەریاندا خوێندراوەتەوە، وەك خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَقَالُوٓا۟ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ﴿١﴾ ﴾ الجن. واتە:( ئەی محمد ﴿ﷺ﴾ بڵێ: نیگام بۆ کرا کە بێگومان چەند کەسانێك لە جنۆکە گوێیان گرت لە قورئان خوێندنەوەکەم) . هەروەها ئەو ئایەتەی کە ئەفەرمووێت: ﴿ وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟ ۖ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ

مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ ﴾الاحقاف .واتە:(بیریان بهێنەرەوە كاتێك چەند جنۆكەیەكمان نارد بۆ لات تا گوێ لە قورئان بگرن، جا كاتێ ئامادەی گوێ گرتن لە قورئان بوون، بە یەكتریان‌ووت: بێ دەنگ بن‌و گوێ بگرن، كاتێك قورئان خوێندنەكە تەواو بوو، هەموو گەڕانەوە بۆ لای قەوم‌و هۆزەكانیان بە ترسێنەرووتیان: ئەی هۆزو قەومەكەمان بە ڕاستی ئێمە گوێ بیستی كتێبێك بووین كە لە دوای موسا نێردراوە، سەلێنەری پەیام‌و كتێبەكانی پێش خۆیەتی‌و هیدایەت ئەدات بۆ حەق‌و ڕاستە شەقامی ڕێك‌و دروست ) . ئەگەر بگونجێت كە قورئان ڕابگەیەنن، ئەوا شیاوە كەفەرمووده‌ش بگەیەنن، بەڵام گێڕانەوەی مرۆڤ لە جنۆكەوە، (**سیوطي**) ئەفەرموێت: قەدەغەیە، لەبەر نەبوونی متمانە بەدادگەریان.

## سەربــڕین بــۆ جنــۆكە

لەمەوسوعەی شەرعیدا ئەم دەقە هاتووە كە ئەفەرموێت:(ئەوەی بۆ جنۆكە سەر ببڕدرێت یان ناوی ئەوانی لێ بهێنرێت حەرامە، بە پێی ئەم ئایەتە پیرۆزەی قورئان كە ئەفەرموویێت: ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحْمُ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ﴿٣﴾ ﴾ المائدة .

واتە:(خودای گەورە مردارەوە بووو خوێن‌و گۆشتی بەرازو ئەو ئاژەڵانەی لێ حەرام كردوون كە لە كاتی سەربڕیندا ناوی غەیری خودایان لەسەر هێنراوە).

* (**یەحیای كوڕی یەحیا**) ئەفەرموێت: هەندێك كەس‌ویستیان كە ئاو لە كانیەكەوە دەربهێنن‌و كارەكانیان جێ بەجێ بكەن، هەستان سەر بڕینیان بۆ جنۆكە كرد، بۆ ئەوەی ئاوەكە نەبەنە خوارەوە بە زەویدا، گۆشتەكەیان دا بەهەندێ خەڵك، ئەم ڕووداوەش گەیەنرابە (ئەبو شەهاب) ئەویش فەرمووی: ئەوەی سەربڕینەكەی بۆ كراوە كارێكی حەرامی بۆ كراوەو ئەو گۆشتەش حەڵاڵ نیە بەو كەسانەی دەرد خواردیان دراوە.

## حــوكمی پەنا گرتن بە شەیتــان‌و جنۆكە

تەنها ئەبێت پەنا بە خودای گەورەو ناوو سیفاتە بەرزو پیرۆزو جوانەكانی بگرین. بەڵام دروستە پەنا بە مرۆڤ بگیرێت لەو شتانەدا كە لەژێر توانای ئەودایە، وەكو هانا بردن بۆ مرۆڤ لە ئاژەڵی دڕندە، یان لە مرۆڤێك كە بیەوێت لە ناوی ببات . بەڵام پەنا گرتن بە

شەیتانو جنۆكەكان حەرامە، چونكە خودای گەورە پێمان ڕائەگەیەنێت كە هەر كەس پشت بەوانە ببەستێت ئەوا زیاتر ماندووی ئەكات، وەك لەم ئایەتەدا ئەفەرمووێت: ﴿ وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلۡإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَزَادُوهُمۡ رَهَقًا ۝٦ ﴾ الجن. واتە: (بەڕاستی پیاوانێك لە ئادەمی پەنا ئەبەنە بەر پیاوانێك لە جنۆكە كە بیان پارێزن، كەچی زۆر تر ماندوویان ئەكردن).

## داوای یارمەتی كردن لە جنۆكە

بەهەمان شێوە قەدەغەیە كە داوای یارمەتی لە غەیری خودا بكەین، وەكو داوای یارمەتی كردن لە جنۆكە . لەوانەشە ببێتە هاوەڵ دانانو بێباوەڕی، داوای یارمەتی كردن لە جنۆكە حەرامە، چونكە پشت بەستنە بەكەسێك كە توانای نیە، ئەمەش مرۆڤ بەرەو تاریكی ئەباتو ئەچێتە ڕیزی جادوگەرییەوە.

## ئەو دوعاوویردانەی كە پەنایان پێ ئەگیرێت لە شەیتانو جنۆكە

یەكەم: پەنا گرتن بە خودا لە جنۆكە: خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٌ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ۝٣٦ ﴾ فصلت. واتە:(ئەگەر لەشەیتانەوە توشی خەتەرەو خەیاڵی نا دروست بوون، ئەوا پەنا بەخودا بگرە، چونكە بەڕاستی هەر ئەو بیسەرو زانایە).

لە فەرموودەیەكدا هاتووە كە دوو پیاو لە لای پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ شەڕە جنێویان كرد، هەتا ڕوخساری یەكێكیان سور هەڵگەڕا، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پێی فەرموو: منووتەیەك ئەزانم ئەگەر بتووتایە ئەو شتەت لەسەردا ئەئەما ﴿ أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾ واتە: بیوتایە: (پەنا ئەگرم بە خودا لەشەیتانی ئەفرەت لێكراو).

دووەم: خوێندنی هەردوو سورەتی (معوذتين) (سورەتی الناس والفلق) (ترمذي) ئەم فەرموودەیە لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ئەگێڕێتەوە كە ئەفەرموێت: (كان رسول الله ﴿ﷺ﴾ يتعوذ من الجان وعين الأنسان حتى نزلت المعوذتان، فلما نزلتا أخذ بهما وترك

**ماسواهما** ) واتە:(پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾ بۆ خۆ پاراستن لە جنۆکەو چاوی مرۆڤ دوعای ئەخوێند هەتاوەکو سورەتی (الناس والفلق) دابەزی ئەوسا ئیتر ئەم دوو سورەتەی ئەخوێندو وازی لەدوعای تر هێنا).

**سێ یەم**: خوێندنی (**آیة الكرسي**): (**ئەبو هورەیرە**) ئەفەرموێت: پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ پاراستنی زەکاتی ڕەمەزانی بە من سپارد، کابرایەك هات هەتا هەندێ خواردن بەرێت، منیش گرتم‌و پێم ووت: ئەتبەم بۆ لای پێغەمبەری خودا، ئەویش ووتی: بەڕاستی من هەژارم‌و منداڵم وردەو خێزانم زۆرە، منیش ڕێگەم پێدا بڕوات، بۆ بەیانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: (ئەبو هورەیرە) چیت لە بەندیەکەی شەو کرد؟

منیش ووتم: تکای ئەوەی لێکردم کە پێویستیەکانی زۆرن‌و خاوەنی منداڵی زۆرە، منیش بەزەیم پێدا هاتەوەو ڕێگەم پێدا بڕوات. پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ فەرمووی بەڕاستی درۆی لەگەڵ کردی‌و دێتەوە بۆلات، منیش بەپێی ووتەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ زانیم کە دێتەوە بۆ لام، خۆم خستە بۆسەوە بۆی، هات تا هەندێك خواردن بەرێت، پێم ووت: ئەتبەم بۆ لای پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾، ئەویش ووتی:وازم لێبێنە بەڕاستی دەست کورتم‌و خێزان‌و منالی زۆرم بە سەردا کەوتووە، ئیتر نایەمەوە، منیش بەزەیم پێدا هاتەوەو ڕێگەم پێدا بڕوات، بۆ بەیانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پێیووتم: ئەی (ئەبو هورەیرە) چیت لە بەندیەکەی شەو کرد؟ منیش‌ووتم: ئەی پێغەمبەری خودا تکای ئەوەی لێکردم کە دەست کورت‌و منالدارم، منیش بەزەیم پێدا هاتەوەو ڕێگەم پێدا بڕوات، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ پێیووتم: بە ڕاستی درۆی لەگەڵ کردیت‌و دێتەوە بۆ لات. بۆ جاری سێیەم چومە بۆسەوە بۆی، هات، تا خواردن ببات ئەمجارەش گرتم و پێم ووت: ئەت بەم بۆ لای پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ ئەمە سێیەم جارەو دوا جارە کە تۆ ئەڵێی نایەمەوەو دێیتەوە! ئەویش ووتی: وازم لێبێنە چەندووشەیەکت فێر ئەکەم کە بەهۆیەوە خودا سودت پێبگەیەنێ، منیش ووتم: ئەو ووشانە کامانەن؟ ئەویش ووتی: ئەگەر چویتە سەر جێگەی نوستنەکەت (**آیة الكرسي**) بخوێنە، بێگومان خودا ئەت پارێزێ، وە شەیتانیش لێت نزیك نابێتەوە، هەتا بەیانی منیش بەرمداو بۆ بەیانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پێی ووتم: چیت لەبەندیەکەی شەو کرد؟منیش ووتم: ئەی پێغەمبەری خودا، پێی‌ووتم: کە چەندووشەیەکم فێرئەکات، بە

هۆیەوە خودا سودم پێدەگەیەنێ، منیش ڕێگەم پێدا بڕوات، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ئەو ووشانە چین؟!ووتم: پێی ووتم: کەچوویتە سەر جێگەی نووستن (**أية الكرسي**) لە سەرەتاوە تاکۆتایی بخوێنە ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴾ خودا بەردەوام ئەت پارێزێ‌و شەیتانیش هەتا بەیانی لێت نزیك نابێتەوە.. پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ پێی‌ووتم: ئەو بە ڕاستی لەگەڵ تۆدا ڕاستی کردووە، بەڵام خۆی درۆزنە، ئەی ئەبو هورەیرە ئەزانی ئەو سێ جارە لەگەڵ کێدا قسەت کردووە؟

ووتم: نەخێر، ووتی: ئەوە شەیتان بوو. (بوخاری گێڕاویەتەوە).

**چوارەم**: خوێندنی سورەتی (**البقرة**):لە فەرمودەیەکی سەحیحدا ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ﴿**وإن الشيطان ينفر من البيت الذي تقرأ فيه سورة البقرة**﴾ (رواه مسلم ٧٨٠). واتە:(ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان، بەڕاستی شەیتان هەڵدێت‌و دوور دەکەوێتەوە لە ماڵێك کە سورەتی (**البقرة**) ی تێدا بخوێنرێت) .

**پێنجەم**: خوێندنی کۆتایی سورەتی (**البقرة**): (ئەبو مەسعود) لە پێغەمبەری خوداوە ئەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: (**من قرأ الأيتين من أخر سورة البقرة في ليلة كفتاه**). (متفق عليه) واتە:(هەر کەسێك دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی (**البقرة**) بخوێنێ لە شەودا بەسیەتی، یاخودوەکو ئەوەوایە کەشەو نوێژی کردبێت) .. (نوعمانی کوڕی بەشیر) لە پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ( **إن الله كتب كتاباً قبل أن يخلق السموات والأرض بألفي عام أنزل منه أيتين ختم بهما سورة البقرة ولا يقرآن في دار ثلاث ليال فيقربها شيطان** ) (رواه الترمذي وهو صحيح ) . واتە:(بەڕاستی خودای گەورە کتێبێکی نوسی پێش ئەوەی کەزەوی‌و ئاسمان دروست بکات بە دوو هەزار ساڵ، دوو ئایەتیان کۆتایی سورەتی (**البقرة**) یەو لەهەر ماڵێکدا سێ شەو نەخوێندرێتەوە، ئەوا شەیتان لێی نزیك ئەبێتەوە).

**شەشەم**: سەرەتای سورەتی (**حم، المؤمن، غافر**) هەتا ئەگاتە (**إليه المصير**) لەگەڵ (**آية الكرسي**): (**ئەبوو هورەیرە**) ﴿رضي الله عنه﴾ لە پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (**من قرأ حم (المؤمن) إلى قوله (إليه المصير) و (أية الكرسي) حين يصبح، حفظ بهما حتى يمسي، ومن قرأهما حين يمسي حفظ بهما حتى يصبح**). (رواه الترمذي). واتە:(هەر کەس سورەتی

(**حم، المؤمن**) هەتا ئەگاتە (**إليه المصير**) بخوێنێ لەگەڵ (**أية الكرسي**) لە بە یانیدا پارێزراو نەبێت هەتا ئێوارە، وەهەر كەس لە ئێوارەدا بیان خوێنێت، پارێزراو ئەبێت هەتا بەیانی).

**حەوتەم:** سەد جار بڵێت (**لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك، وله الحمد، وهو على كل شيء قدير**): (ئەبو هورەیرە) لە پێغەمبەرەوە﴿ﷺ﴾ ئە گێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ( هەر كەسێ ڕۆژی سەد جار ئەم زیكرەی سەرەوە بخوێنێت، ئەوە خێری ئازاد كردنی دە كۆیلەی هەیەو سەد چاكەی بۆ دەنوسرێتو سەد خراپەی لێ ئەسڕدرێتەوە، وە ئەبێتە هۆی پارێزگاری لە شەیتان، ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە، وە هیچ كەسێك لەئەو باشتر نیە، جگە لەو كەسە نەبێت كە لە ئەم زیاتر ئەو زیكرە بڵێت) (رواه البخاري ٦٤٠٣و مسلم ٢٦٩١).

**هەشتەم:** زۆر یاد كردنی (**ذیكر**) خودای گەورە: (**حارسی ئەشعەری**) ﴿ﷺ﴾ لە پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ ئەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: خودای گەورە فەرمانی بە یەحیای كوڕی زەكەریادا (سەلامی خودایان لێبێت) بە پێنج شتو فەرمانیش بكات بە بەنی ئیسرائیل كاری پێ بكەن، خەڵكی لە (**بيت المقدس**) كۆبوونەوەو مزگەوتەكە پڕبوو، ئەویش ووتی: بە ڕاستی خودای گەورە فەرمانی پێكردوم كە كار بەپێنج شت بكەمو فەرمانیش بە ئێوە بكەم كە كاری پێ بكەن.

یەكەمیان: ئەوەیە كە خودا بپەرستنو هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن بەهیچ شێوەیەك، بە ڕاستی هاوشێوەی ئەو كەسەی هاوەڵ بۆ خودا بڕیار ئەداتوەكو پیاوێكوایە كە كۆیلەیەك بە پارەو سامانی خۆی بكڕێتو پێی بڵێ بەم پارەو سامانەی من كاربكەو پاشان بۆمی بگێڕەوە، بەندەكەش كار ئەكات بەڵام ماڵو سامانەكە بۆ یەكێكی تر ئەگێڕێتەوە، كێ لە ئێوە ڕازییە كە كۆیلەكەی بەم شێوەیە بێت؟!

دووەم: فەرمانتان پێ ئەكەم بە نوێژ كردنو لە نوێژەكانتاندا سەیری ئەم لاو ئەولا مەكەن.

سێ یەم: فەرمانتان پێ ئەكەم بەڕۆژوو گرتن، نموونەی ڕۆژوو گرەكو پیاوێكوایە لە ناو كۆمەڵێك خەڵكدا تورەكەیەكی پێ بێت، میسكی تێدا بێتو هەموویان سەرسام بن بە بۆنەكەی، بە ڕاستی بۆنی دەمی ڕۆژووگر لە لای خودا لە بۆنی میسك خۆشترە.

چوارەم: فەرمانتان پێئەكەم بە بەخشینی ماڵ، نموونەی ئەمەش وەك پیاوێكوایە دوژمن بە دیلی گرتبێتیو دەستو قاچیان بەستبێتەوە تابیبەن لەملی بدەن ئەویش بڵێ: هەر چی ماڵو سامانم هەیە ئەیدەم بە ئێوەو خۆی لێیان ڕزگار بكات.

**پێنجەم:** هەروەها فەرمانتان پێئەکەم بەوەی کەیادی خودا بکەن، بێ گومان هاو شێوەی ئەو کەسەی یادی خودا ئەکات وەکو پیاوێک وایە کە دوژمن زۆر بەخێرایی بە دوایەوە بێت، هەتا ئەگاتە قەڵایەکی پتەو، وە مرۆڤ پارێزراو نابێت، تەنها بەیادی خودا نەبێت. (رواه الترمذي وهو صحيح).

**نۆیەم:** دەست نوێژگرتن: ئەمەش لە گەورەترین ئەو شتانەیە کە خۆی پێدەپارێزرێ، بە تایبەت لەکاتی تووڕەبوونی مرۆڤو بەرزبوونەوەی ئارەزووی مرۆڤدا . چونکە بەڕاستی توڕەیی و ئارەزوو، وەکو ئاگرێك لە دڵی مرۆڤدا قوڵپ ئەدات و کڵپە ئەکات. (ئەبو سەعیدی خودری) لە پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی (**ألا وإن الغضب جمرة في قلب ابن أدم، أما رأيتم إلى حمرة عينيه وإنتفاخ أوداجه فمن أحسَّ بشيء من ذلك فليلصق بالأرض**) (رواه الترمذي). واتە:(بەڕاستی تووڕەبوون پشکۆیەك ئاگرە لە دڵی ئادەمیزاددا، ئایا نابینن کە چۆن چاوی سور هەڵئەگەڕێ و دەمارەکانی گەردنی بەرز ئەبێتەوە، هەر کەس هەستی بەوە کرد با لەجێی خۆی بمێنێتەوەو نە جوڵێت).

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە فەرموودەیەکی تردا ئەفەرموێت بەڕاستی تووڕەبوون لە شەیتانەوەیە، شەیتانیش لە ئاگرە، بێگومان ئاگریش بە ئاوو دائەمرکێتەوە، ئەگەر یەکێك لە ئێوە تووڕەبوو، با دەست نوێژ بگرێت).

**دەیەم:** دورکەوتنەوەو خۆگرتنەوە لە زیادە ڕەوی کردنی تێ ڕوانینی ناشەرعی و زۆر قسەکردن و زۆر خواردن و خواردنەوەو زۆر تێکەڵ بوون لەگەڵ خەڵکیدا، بەڕاستی شەیتان لەم شتانەوە زاڵ ئەبێت بەسەرمرۆڤدا، (عبداللەی کوڕی مەسعود) ئەفەرموێت:(خراپە خەجاڵەتکاری دڵەکانە، هیچ سەرنج و تێڕوانینێك نیە لە شەیتانەوە تەماعێکی تێدا نەبێت).

# بەشی سێ یەم

## چیرۆکی بەربەرەکانی نێوان مرۆڤ و شەیتان

سەرەتای دەست پێکردنی ئەم ململانێ و بەربەرەکانیە، لەو کاتەوە دەستی پێکرد، کاتێك شەیتان لە بەهەشتدا قایل نەبوو فەرمانی خودا بە جێ بهێنێت و کڕنوش بۆ ئادەم بەرێت، خودای گەورەش دەری کردو بە نەفرەتی کرد، بۆیە لەلای خودا سوێندی خواردو ووتی: ﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾ ص. واتە:(سوێند بە دەسەڵاتی بێ سنورت، شەرت بێ هەر هەموویان گومڕاو سەرگەردان بکەم * تەنها بەندە دڵسۆزەکانت نەبێت کە هەڵبژاردەی خۆتن و دەسەڵاتم نیە بەسەریاندا) . سەرەتای بەربەرەکانیەکە لە هەڵخەڵەتاندنی دایك و باوکمان (ئادەم و حەوا)وە دەستی پێکرد، لەم کارەدا شەیتان سەرکەوتوبوو، وە بوو بەهۆی دەرکردنیان لەبەهەشت، خودای گەورە ئەفەرموویێت: ﴿ وَلَقَدْ عَهِدْنَا إِلَىٰ آدَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْمًا ﴿١١٥﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَىٰ ﴿١١٦﴾ فَقُلْنَا يَا آدَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ الْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰ ﴿١١٧﴾ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظْمَأُ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ ﴿١١٩﴾ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ الشَّيْطَانُ قَالَ يَا آدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴿١٢٠﴾ فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ ۚ وَعَصَىٰ آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾ ﴾ طه. واتە:(سوێند بەخودا بێگومان ئێمە پێشتر پەیمانمان لە ئادەم وەرگرت (کە نزیکی درەختە قەدەغە کراوەکە نەکەوێت کە چی بیری چوو، بە مەرجێك ئەمان بینی پێشتر بڕیاری کردنی ئەو سەرپێچیە بدات، کاتێك بەفریشتەکانمان ووت: کڕنوش بۆ ئادەم بەرن، هەموو کڕنوشیان برد، جگە لە ئیبلیس کە سەرسەخت و یاخیبوو، جا ووتمان: بە ڕاستی ئەم ئیبلیسە دوژمنی خۆت و هاو سەرەکەتە، وریا بن لە بەهەشت بەدەر کردنتان نەدات، بەو هۆیەوە توشی ناخۆشی و نەگبەتی و دەربەدەری ببن، دڵنیاش بە تۆ لە بەهەشتدا نە برسیت ئەبێت و نەڕووت و ڕەجاڵ ئەبیت،

نەتینووشت ئەبێت‌و نە گەرماش زۆرت بۆ ئەهێنێت، جا شەیتان گومانی خستە دڵیەوەو پێی‌ووت: ئەی ئادەم نیشانت بدەم درەختی نەمری‌و موڵك‌و دارییەك كە بەسەر ناچێت کامەیە؟! شەیتان هەر کۆڵی نەدا تافریوی دان، هەردووکیان لەبەروبومی درەختەکەیان خوارد (ئیتر جل‌و بەرگ‌و پۆشاکیان لەبەرداماڵراو عەیب‌و عاریان دەرکەوت، بە پەلە هەوڵیان دا بەگەڵای درەختەکانی بەهەشت خۆیان داپۆشن)، ئا بەو شێوەیە ئادەم لە پەروەردگاری یاخی بوو، فریوی خواردو ڕێگەی لێ تێکچوو، پاشان پەروەردگاری هەڵیبژاردو کردی بە پێغەمبەرو تەوبەی لێوەرگرت‌و هیدایەت‌و ڕێنمایی کرد، ئەوسا خودای گەورە فەرمانی داووەتی: ئیتر هەردوکتان لە بەهەشت دابەزن بەگشتی، هەندێکتان دەبنە دوژمنی هەندێکتان، جا ئەگەر هیدایەتی من بۆ ئێوە هات، ئەوەی شوێنی بەرنامەکەم بکەوێت، نە گومڕا ئەبێت‌و نە ناخۆشی‌و ناڕەحەتی‌و ناسۆری دێتە ڕێی).

بەڵی، ئادەم دابەزی بۆ سەر زەوی، تا لەگەڵ نەوەکانی خۆیان ئامادە بکەن بۆ ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ شەیتان‌و هەوڵە بەردەوامەکانی بۆ لە خشتە بردنی نەوەکانی ئادەم، شەیتانیش بەجۆرەها شێوە خۆی ئامادە کرد بۆ ئەو ڕوو بە ڕوو بونەوەیە لەوانەش:

**١ـ توانای لەخشتە بردن‌و ڕازاندنەوەی گوناهو تاوان:**

خودای گەورە ئەفەرموێت:﴿ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٣٩﴾ ﴾ الحجر. واتە:(ووتی: ئەی پەروەردگارم، مادام بەهۆی ئەم مرۆڤەوە منت سەر لێشێواو کرد، شەرت بێت لە زەویدا هەموو گوناهو لادان‌و تاوانێکیان لەلا جوان‌و شیرین بکەم‌و هەموویان سەر لێشێواوو سەرگەردان بکەم).. هەروەها خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿ تَٱللَّهِ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٖ مِّن قَبۡلِكَ فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلۡيَوۡمَ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٦٣﴾ ﴾ النحل. واتە:(سوێند بە خودا پێش تۆ بۆ گەل‌و قەومەکانی تریش پێغەمبەرانم ڕەوانە کردووە، بەڵام شەیتان کارو کردەوەی نادروست‌و هەڵەی بۆ ڕازاندونەتەوە، ئەمڕۆ لە دونیادا هەر ئەو پشتیوانیانەو سزای بە ئێش‌و ئازار بۆ ئەو جۆرە قەوم‌و کەسە نا لەبارو نا حاڵیانە ئامادە کراوە).

**٢ـ درۆ کردن‌و هەڵخەڵەتاندن:**

خودای گەورە سەبارەت بە درۆی شەیتان ئەفەرمووێت: ﴿ فَوَسْوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾ الاعراف. واتە:(شەیتان پێی‌ووتن: پەروەردگارتان لەبەر هیچ هۆیەك بەرگری ئەو درەختەی لێ نەکردوون تەنها لەبەرئەوە نەبێت کەنەبنە دوو فریشتە یان بۆ ئەوەی لە بەهەشتدا بە هەمیشەیی‌و بە نەمری نەمێننەوە) .. هەروەها خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ ۖ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢٠﴾ ﴾ النساء. واتە:(شەیتان بەڵێنیان پێ ئەدات‌و ئاوات‌و ئومێدیان ئەخاتە بەر، دڵنیابن شەیتان هیچ بەڵێنێکیان پێ نادات جگە لە هەڵخەڵەتاندن نەبێت) .. هەروەها خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦٨﴾ ﴾ البقرة. واتە:(شەیتان بەڵێنی هەژاری‌و نەداریتان پێئەدات‌و ئەتان ترسێنێت بە هەژاری‌و فەرمانتان پێئەدات بە گوناهو تاوان‌و خراپەو بەنەبەخشینی ماڵ‌و سامان، خوداش بەڵێنی لێخۆشبوونی خۆیتان پێ ئەدات، لەگەڵ ڕزق‌و ڕۆزی زۆرو بەهرەی فراوان‌و خوداش فراوانگیرو زانایە).

**٣ـ ئەم دوژمنە، ئێمە ئەبینێ‌و ئێمە ئەو نابینین:**

خودا ئەفەرمووێت: ﴿ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآ ۗ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ ۗ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ الاعراف. واتە:(ئەی نەوەی ئادەم، شەیتان ئێوەش لە خشتە نەبات، هەروەك دایك‌و باوکتانی لەخشتە بردو لە بەهەشت بە دەرکردنی دان، لە کاتێکدا کە دەستی کرد بە داماڵینی پۆشاکەکانیان تا عەورەتیان پیشانی یەکتر بدات، بێگومان شەیتان‌و دارو دەستەکەی ئێوە ئەبینن لە دنیاداو بەڵام ئێوە ئەوان نابینن، دڵنیابن ئێمە شەیتانەکانمان کردووە بە یارو یاوەری ئەوانەی کە باوەڕ ناهێنن) .

**٤ـ شەیتان‌وەکو خوێن بە دەمارەکانماندا هاتوچۆ ئەکات:**

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێت (إن الشيطان يجري من إبن أدم مجرى الدم) (رواه البخاري ومسلم). واتە:(بەڕاستی شەیتان بە هەموو ئەو شوێنانەی مرۆڤدا هاتووچۆ ئەکات کە خوێنی پێدا تێئەپەڕێت) .

**٥ـ گوێ هەڵخستن بۆ ئەو فەرمانانەی کە لە ئاسمان بڕیاری لەسەر ئەدرێت:**

عائشە (ڕەزای خودای لێبێت) لە پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ ئەگێڕێتەوە کە فریشتەکان دا ئەبەزن بۆ سەر هەورەکانو باسی ئەو فەرمانانە ئەکەن کە لە ئاسمان بڕیاریان لەسەر دراوە، شەیتانەکانیش گوێ هەڵئەخەن بۆ بیستنیو گوێیان لێ ئەبێتو پاشان ئەیهێنن بۆ جادوگەرو کاهینەکان، ئەوانیش سەد درۆی بۆ زیاد ئەکەن).. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بە ڕاستی فێڵی شەیتان زۆر بێ هێزو کەم توانایە، وەکو خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ إِنَّ كَيْدَ ٱلشَّيْطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ﴿٧٦﴾ ﴾النساء . واتە:(بە ڕاستی فێڵو پیلانی شەیتان هەر لاواز بووە) .

ئەمەش لە کاتێکدا کە مسوڵمان هانای خۆی تەنها بۆ خودا بەرێتو خۆی نەداتە دەست وەسوەسەی شەیتانی ئەفرەت لێکراو، خودای گەورەش ئەفەرموێت: ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٠٠﴾ ﴾ الأعراف . واتە:(ئەگەر لەلایەن شەیتانەوە وەسوەسەیەکت بۆ پێشهاتو ویستی لە خشتەت بەرێتو توشی هەڵەت بکات، ئەوا تۆ پەنا بەخودا بگرەو پشت بەو ببەستە، چونکە بە ڕاستی ئەو زاتە بیسەرو زانایە) .

# بــــەشی چـــوارەم

## مەبەستو ئامانجەکانی شەیتان

خوێنەری بەڕێز باش بزانە کە کۆتا مەبەستی شەیتان ئەوەیە کە نەوەکانی ئادەم بچنە دۆزەخەوەو بەهەشتیان لە دەست بچێت، خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمۡ عَدُوّٞ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدۡعُواْ حِزۡبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ٦ ﴾ فاطر. واتە:(بەڕاستی شەیتان دوژمنی ئێوەیەو ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی دابنێن، بێگومان بانگی تاقمو داروودەستەکانی خۆی ئەکات بۆ ئەوەی ببنە نیشتەجێی دۆزەخ) .

هەروەها خودا ئەفەرمووێت: ﴿ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا ٦٠ ﴾ النساء. واتە:(شەیتان ئەیەوێت کە گومڕایان بکات، بە گومڕاکردنێکی دوور لە ڕاستی).

لە ڕاستیدا ئەو مەبەستەی شەیتان لە پێناویدا هەوڵ ئەدات بریتی یە: لە بێباوەڕیو دەرکردنی خەڵك لە بەهەشتەوە بۆ سزای دۆزەخ، تا بیان کات بە کۆمەڵو گرۆهی خۆی، هەر بۆیەش بە شەوو ڕۆژ بانگەوازی خەڵکی ئەکات بۆ تاوانو سەرپێچی بە نهێنیو ئاشکرا، خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ قَالَ فَبِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأَقۡعُدَنَّ لَهُمۡ صِرَٰطَكَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ١٦ ثُمَّ لَأٓتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ وَعَنۡ أَيۡمَٰنِهِمۡ وَعَن شَمَآئِلِهِمۡۖ وَلَا تَجِدُ أَكۡثَرَهُمۡ شَٰكِرِينَ ١٧ ﴾ الأعراف. واتە:(بەهۆی ئەوەی کە تۆ منت گومڕاو سەرگەردان کرد، ئەوا سوێند بێت منیش لەڕێگە ڕاستەکەتدا بۆیان دائەنیشم، پاشان سوێند بەخودا لە بەردەمیانەوەو لە پشتیانەوەو لەلای ڕاستیانەوەو لەلای چەپیانەوە بۆیان دێمو دنیایان لە لا خۆشەویست ئەکەمو گومانیان دەربارەی قیامەت لە لا دروست ئەکەمو زۆر بەشیان نا سوپاس گوزارن).

ئەگەر شەیتان بە تەواوەتیش نەگاتە ئامانجی خۆیو توانای نەبێت خەڵکی بێباوەڕ بکات، بەڵام هیوا بڕاو نابێتو بە تاوانو سەرپێچیو کەم تەرخەمی ڕازیە ئەگەر کەمیش بێت.

پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێت:(بە ڕاستی شەیتان بە جۆرەها شێوە لە ڕێگەی مرۆڤی مسوڵماندا دائەنیشێو پێی ئەڵێت: مسوڵمان ئەبیتو واز لە ئاینی خۆتو باوكو باپیرانت

ئەهێنێ؟ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرمووێت: مسوڵمانەکە سەرپێچی شەیتان ئەکاتو مسوڵمان ئەبێت، پاشان لە ڕێگەی کۆچ کردندا بۆی دائەنیشێو پێی ئەڵێت: ئایا کۆچ ئەکەیتو واز لە زەویو ئاسمانەکەت ئەهێنێو بەجێی دێڵێ؟ مسوڵمانەکە سەرپێچی شەیتان ئەکاتو لەپێناوی خودادا کۆچ ئەکات، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێت: پاشان شەیتان لە ڕێگەی تێکۆشاندا بۆی دائەنیشێو پێی ئەڵێت: دریغیت نەکرد بەنەفسو ماڵت، خەڵك ئەکوژیتو خەڵك ئەتکوژێ، ژنەکەت مارە ئەکرێتەوە، ماڵەکەت دابەش ئەکرێت، مسوڵمانەکە سەرپێچی ئەکات، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرمووێت: هەرکەسێك ئەو کارانە ئەنجام بداتو پاشان بمرێت، ئەوە لەسەر خودایە بە بەهەشتی شاد بکات، ئەگەر بکوژرێو شەهید بێت، ئەوە لەسەر خودایە کە بیکاتە بەهەشتەوە، ئەگەر بخنکێ یان لەسەروڵاخەکەی بەربێتەوەو بمرێ، ئەوە لەسەر خودایە بەبەهەشتی بەرینی شاد بکات) (رواه أحمد و النسائي).

یەکێك پرسیار ئەکات، ئایا ڕێژەی ئەو کەسانە چەندە کەشەیتان گومڕایان ئەکات؟

کاتێكوەڵامەکەی ئەبیستین توشی شۆكو سەرسوڕمان ئەبین، بەوەی کە ڕێژەو ژمارەی ڕزگاربوان لە ئاگر لە هەزار کەس یەك کەسە؟!

(ئەبو سەعیدی خودری) لە پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ ئەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی:(**يقول الله تعالى: يا آدم فيقول: لبيك وسعديك، والخير في يديك، فيقول: أخرج بعث النار. قال:وما بعث النار؟ قال: من كل ألف تسع مئة وتسعة وتسعين، فعنده يشيب الصغير** ..﴿ يَوۡمَ تَرَوۡنَهَا تَذۡهَلُ كُلُّ مُرۡضِعَةٍ عَمَّآ أَرۡضَعَتۡ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمۡلٍ حَمۡلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ ﴾.. **قالوا: يا رسول اللهوأينا ذلك الواحد؟ أبشروا فإن منكم رجلاً ومن ياجوج و ماجوج ألف. ثم قال:والذي نفسي بيده إني أرجو أن تكونوا ربع أهل الجنة، فكبرنا فقال: أرجو أن تكونوا ثلث أهل الجنة، فكبرنا فقال، ما أنتم في الناس إلا كالشعرة السوداء في جلد ثور أبيض أو كشعرة بيضاء في جلد ثور أسود** ) . (رواه البخاري ومسلم). واتە:(خودای گەورە ئەفەرمووێت: ئەی ئادەم، ئەویش ئەفەرمووێت: بەڵێ خوایە گیان، پەیڕەویت ئەکەم، پاكو بێگەردی بۆ تۆیە، هەموو خێرێك لە دەسەڵاتی تۆدایە، خودای گەورە ئەفەرمووێت: خەڵکی دۆزەخ لە خەڵکانی تر جیا بکەرەوە، ئادەم ئەفەرمووێت، کەسانی دۆزەخ کامانەن؟ خوداش ئەفەرمویێت، لە هەر هەزار کەسێك نۆ

سەدو نەوەدو نۆ کەس، ئا لەوێدایە کە منداڵ سەری سپی ئەبێت (هەموو سك پڕو دوو گیانێك سکەکەی دائەنێت، خەڵکی ئەبینیت وەك سەرخۆش وان، بەڵام سەرخۆش نین، بەڵکو سزای خودا زۆر سەختو سامناکە)وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا کێ لە ئێمە لەو یەك کەسەیە؟ ئەویش فەرمووی، موژدەبێ بەڕاستی ئەو کەسە لە ئێوەیە بەڵام لە یەئجوجو مەئجوج هەزارە، پاشان فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە تکا ئەکەم کە ئێوە چوار یەکی خەڵکانی بەهەشت بن، (ئەبو سەعید) ئەفەرمووێت: ئێمەش (الله أكبر) مان کرد، پاشان فەرمووی: تکام وایە کە ئێوە سێ یەکی ئەهلی بەهەشت بن، جارێکی تر (الله أكبر) مان کردوو فەرمووی: تکام وایە کە نیوەی ئەهلی بەهەشت ئێوە بن، ئێمەش (الله أكبر) مان کردو فەرمووی: ئێوە لە نێوان خەڵکدا وەکو موویەکی ڕەش وان لە پێستی گایەکی سپیدا، یان وەکو موویەکی سپی وان لە پێستی گایەکی ڕەشدا) .

## ئاگادارکردنەوەو بیرهێنانەوە

خودای گەورە لە گوێ ڕایەڵی شەیتانو شوێن کەوتوانی ئاگادارمان ئەکاتەوەو پێمان ڕائەگەیەنێ کە سەر ئەنجامی گوێ ڕایەڵی بۆ شەیتان تیاچوونە، خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٌ ١٦٨ إِنَّمَا يَأۡمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلۡفَحۡشَآءِ وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ١٦٩ ﴾ البقرة .

واتە:(ئەی خەڵکینە لە ڕزقو ڕۆزی حەڵاڵو پاکی زەوی بخۆنو نزیکی قەدەغەکراوەکان مەکەون، هەروەها شوێن هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، چونکە بێگومان شەیتان دوژمنێکی ئاشکراتانە * بێگومان ئەو شەیتانە هەر فەرمان بە خراپەو گوناهو تاوان ئەکاتو هەروەها هانتان ئەدات بۆ ووتنی هەندێك شت یان هەڵبەستنی هەندێك گوفتار بەدەم خوداوە، بەبێ ئەوەی بزانن کە سەرئەنجامی ئەو کارەتان چەندە مەترسی دارە) .

هەروەها خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ٦٢ ﴾ الزخرف . واتە:(با شەیتان ڕێتان پێ نەگرێتو لە ڕێی ڕاست لاتان نەدات، چونکە بێگومان ئەو دوژمنێکی ئاشکراتانە).. هەروەها خودای پاكو بێگەرد پێمان ڕادەگەیەنێ کە بەڕاستی شوێن کەوتنی شەیتان جگە لە حەسرەتو شەرمەزاریو دۆڕاندن هیچی تر نیە، خودا

ئەفەرموویێت: ﴿ ٱسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ ٱلشَّيْطَٰنُ فَأَنسَىٰهُمْ ذِكْرَ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱلشَّيْطَٰنِ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ المجادلة. واتە:(ئەوانە شەیتان بەسەریاندا زاڵ بووەو داگیری کردوونو یادی خودای لە بیر بردوون، ئا ئەوانە دەستەو تاقمو حزبی شەیتانن، ئاگادار بن کە بێگومان دەستەو تاقمو حزبی شەیتان خەسارەتمەندو زەرەرمەندن) . هەروەها خودای گەورە ئەفەرموویێت: ﴿ وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيْطَٰنَ وَلِيًّا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا ﴿١١٩﴾ ﴾ النساء. واتە:(هەر کەسێك شەیتان بکات بەدۆستی خۆی جگە لە خودا، ئەوە بێگومان زیانی لێکەوتووە بەزیانێکی دیارو ئاشکرا).

خودای گەورە بە بیری بەندەکانی خۆی ئەهێنێتەوە کە شەیتان چی کردووە بە باوکە ئادەم، وەك ئەفەرموویێت: ﴿ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآ ۗ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ ۗ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ الاعراف. واتە:(ئەی نەوەی ئادەم، شەیتان ئێوەش لەخشتە نەبات، هەروەك دایكو باوکتانی لە خشتە بردو لە بەهەشتدا بە دەرکردنی دان، لە کاتێکدا دەستی کرد بە داماڵینی پۆشاکەکانیان، تا عەورەتیان پیشانی یەکتر بدات، بێگومان شەیتانو دارو دەستەکەی ئێوە ئەبینن لە دنیاداو ئێوە ئەوان نابینن، جا دڵنیابن کە ئێمە شەیتانەکانمان کردووە بە یارو یاوەری ئەوانەی کە باوەڕ ناهێنن، خودای گەورە فەرمان ئەکات بە بەندەکانی خۆی بە ئاشکرا کردنی دوژمنایەتی شاراوەو ئاشکرا بەرامبەر شەیتان) .

﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ﴾ فاطر. واتە:( بە ڕاستی شەیتان دوژمنی ئێوەیە، دەی کەواتە ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی دابنێن، بێگومان شەیتان تاقمو کۆمەڵەکەی بانگ ئەکات بۆ ئەوەی ببنە هاوەڵانی ئاگری هەڵگیرساوی دۆزەخ) .

جا ئەی بەندەکانی خودا ... ئەی شوێن کەوتوانی بەرنامەی خودا بە ڕاستی پشت بەستن بە خودای تاكو تەنهاو دەست گرتن بە بەرنامەکەیەوەو پەیوەست بوون بە ڕێنماییەکانی قورئانی پیرۆزو سونەتەکانی پێغەمبەرەوەو پابەندبوون بە فەرمانی خوداو

پێغەمبەر﴿ﷺ﴾و دوورکەوتنەوە لەو شتانەی کە ڕێگریان لێ کردووە، ئەبنە ڕزگار کەرت، لە فێڵ و تەڵەکەی شەیتان، چونکە شەیتان هەروەك پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەفەرمووێت :(وەکو خوێن لە لاشەی ئادەمیزاددا هاتوچۆ ئەکات).. مرۆڤیش ناتوانێت لەو کەسە ڕزگاری بێت کە تێکەڵی خوێن و گۆشتی بووبێت، تەنهابە پشت بەستن بە خودای تاك و تەنها نەبێت لەگەڵ ڕاستگۆیی لە پەرستندا .

(عەبدو لعەزیزی کوڕی ڕەفیع) ئەفەرمووێت: کاتێك گیانی ئیماندارێك بەرز ئەکرێتەوە بۆ ئاسمان، فریشتەکان ئەڵێن پاك و بێگەردی بۆ ئەو کەسەی ئەم بەندەیەی لە شەیتان ڕزگار کرد، ئەی هاوار!! چۆن ڕزگاری بوو؟!

# بـــــەشی پێنـــجەم

## لاوازیو بـــەهێزی شەیتـــان

بە داخەوە کەسانێکی زۆر گومانیان وایە کە تواناى ڕووبەڕوو بوونەوەی شەیتانیان نیە، ئەگەر ڕووبەڕوو بوونەوەش ڕویدا ئەوا سەرکەوتن بۆ شەیتانە، لەبەر ئەوەی توانای بەهێزە لە ڕازاندنەوەو لە ڕێ دەر کردن .

لە ڕاستیدا شەیتان دەسەڵاتی بەسەر بەندە تایبەتەکانی خودادا نیە، کاتێك بەندەکان پەیوەست بن بە قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾و لەخودا بترسن‌و بە پێی ڕێنماییەکانی پێغەمبەر بڕۆن، ئەوا هیچ کات شەیتان ناتوانێت لە ڕێی ڕاست لایان بدات، خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴿٦٥﴾ ﴾ الإسراء. واته:(بە ڕاستی ئەی شەیتانی نەفرین لێکراو، بەندەکانی من هیچ دەسەڵاتی تۆیان لەسەر نابێت‌و هەوڵ‌و کۆششی تۆ کاریان تێ ناکات‌و ئەی ئیماندار پەروەردگار بەسە بۆ پارێزگاری‌و پاراستنت).

هەروەها خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ وَمَا كَانَ لَهُ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَانٍ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِالْآخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِي شَكٍّ ۗ وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ ﴿٢١﴾ ﴾ سبا. واته:(وە نەبێت ئیبلیس هیچ دەسەڵاتێکی بەسەریاندا هەبێت، بەڵکو ئێمەویستومانە ڕوون بێتەوەو دەربکەوێت، کێ باوەڕی بە ڕۆژی دوایی هەیەو کێش لە شك‌و گوماندایە، (دڵنیابە ئەی پێغەمبەر) کە پەروەردگاری تۆ ئاگادارو چاودێرە بەسەر هەموو شتێکداو هیچ شتێکی لێ‌وون نابێت).

شەیتان خۆشی ئەزانێت کە توانای نیە لەسەر گومڕا کردنی بەندە باوەڕ دارەکانی خودای گەورە، هەر لەبەر ئەمەشە جیای کردونەتەوە لەو کەسانەی کە بڕیاری داوە گومڕایان بکات، خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ قَالَ رَبِّ بِمَا أَغْوَيْتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾ الحجر. واته:(شەیتان بە ڕق‌و

کینەوە ووتی، پەروەردگارم مادەم بەهۆی ئەم ئینسانەوە منت سەر لێشێواو کرد، شەرت بێت لە زەویدا هەموو گوناهو تاوانێکیان لەلا جوانو شیرین بکەمو هەر هەموویان سەر لێشێواو سەرگەردان بکەم ★ بێجگە لە بەندە پوختو دڵسۆزەکانی خۆت نەبێت) .

پاشان لە ڕۆژی دوایدا بە شوێن کەوتوانی ئەڵێت:﴿ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ إِنِّى كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾ابراهيم. واتە:(من هیچ زۆرو دەسەڵاتێکم بەسەر ئێوەدا نەبوو، تەنها ئەوە نەبێت کە بانگم کردن بۆ گومڕاییو ئێوەش بە دەنگمەوە هاتنو بە گوێتان کردم، کەواتە لۆمەو سەرزەنشتی من مەکەن، بە ڵکو لۆمەو سەرزەنشتی خۆتان بکەن).

لەبەر ئەوە خودای گەورە پێمان ڕائەگەیەنێ کە فێڵو تەڵەکەی شەیتان چەندە بێ هێزو بێ توانایە: ﴿ فَقَٰتِلُوٓا۟ أَوْلِيَآءَ ٱلشَّيْطَٰنِ إِنَّ كَيْدَ ٱلشَّيْطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ﴿٧٦﴾ ﴾النساء. واتە:(لەگەڵ دۆستانی شەیتان شەڕبکەن، بەڕاستی پیلانی شەیتان هەر لاوازبووە).

پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بە (عومەری کوڕی خەتاب) ی فەرموو ( سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە هەرگیز شەیتان لە دۆڵێکەوە ناڕوات کە تۆی پێدا بڕۆیت).

ئەگەر شەیتان لاوازو زەبون بێت بەرامبەر باوەڕدار، بە ڕاستی بە هێزو بە توانایە بەرامبەر بێباوەڕ، چونکە بێباوەڕەکان خۆیان شەیتانیان کردووە بە مامۆستاو گەورەی خۆیان، ئەمەش بە دۆستایەتی کردنو شوێن کەوتنی فەرمانەکانی، خودای گەورەش ئەفەرموێت:﴿ إِنَّمَا سُلْطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾النحل. واتە:(شەیتان تەنها دەسەڵاتی بەسەر ئەوانەدا هەیە کە ئەیکەنە دۆستو پشتیوانی خۆیانو هاوەڵ بۆ خودا بڕیار ئەدەن).

ئا ئەوانە ڕازی بوون کەشەیتان بکەن بە سەرۆکو پێشەوای گومڕای خۆیان، لە تۆڵەی ئەمەشدا خودای گەورە شەیتانی بەسەریاندا زاڵ کردووە، بێگومان خودای گەورە ئا یەڵێت شەیتان دەسەڵاتی بەسەر بەندەکانیدا هەبێت، هەتا ئەو کاتەی بەندەکانی لە ژێر فەرمانیدا بن، بەڵام کاتێك شەیتان ئەکەن بە مامۆستاو ڕابەری خۆیانو هاوەڵ بۆ خودا بڕیار ئەدەن، ئەو کاتە شەیتان زاڵ ئەبێت بەسەریاندا، خودای گەورە ئەفەرموێت ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّآ أَرْسَلْنَا

ٱلشَّيَٰطِينَ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ تَؤُزُّهُمۡ أَزّٗا ﴿٨٣﴾ ﴾ مريم. واتە:(ئایا نابینن بەڕاستی ئێمە چۆن شەیتانەکان دەنێرینە سەر خودا نە ناسەکان، شەیتانەکانیش بە گەرمی هانیان ئەدەن بۆ تاوانو گوناهو خراپە) .

## چیرۆکی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ شەیتاندا

(ئەبو سەعیدی خودری) (خودای لێ ڕازی بێت) ئەفەرموویت:(پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ هەستاو نوێژی بەیانی کردو قورئانی خوێند، بەڵام لێی تێك چوو، کاتێك لە نوێژ بووەوە فەرمووی: ( **لو رأيتموني وإبليس، فاهويت بيدي، فماز لت أخنقه حتى وجدت برد لعابة بين أصبعي هاتين ـ الأبهام والتي تليها ـ ولولا دعوة أخي سليمان لأصبح مربوطا بسارية من سواري المسجد، يتلاعب به صبيان المدينة، فمن إستطاع منكم أن لا يحول بينه و بين القبلة أحد فليفعل** ). (رواه أحمد حديث حسن). واتە:(ئەگەر منو شەیتانتان ئەبینی، بەهەر دوو دەستم گرتبوومو بەردەوام بووم بۆ ئەوەی بیخنکێنم، هەتا گەیشتە ئەوەی ساردی لیکو ئاوی دەمی بەنێوانی ئەم دوو پەنجەیەمدا هاتە خوارەوە ( پەنجە گەورەو ئەوەی تەنیشتی) ئەگەر دوعاکەی سولەیمانی برام نەبوایە، ئەبوایە ببەسترایەتەوە بە کۆڵەکەیەك لە کۆڵەکەکانی مزگەوتەوەو منداڵانی مەدینە یاریان پێ بکردایە، هەر کەس لە ئێوە توانای هەبوو با نەیەڵێت لە کاتی نوێژدا کەس بکەوێتە نێوان ئەوو قیبلەوە) .

## چیرۆکـی لاوێـــــــك

گەنجێك لەسەر ڕێگەی ڕاستی ئیسلام بوو، بانگەوازی بۆ دینی خودا ئەکرد لە دێیەکەی خۆیانو لە دەرەوەی دێیەکەشیاندا، ووتاری بۆ خەڵکی دەخوێندەوەو بانگیانی ئەکرد بۆ باوەڕی پاكو ئاگاداری ئەکردن لەوەی کە ئەچن بۆ لای جادووگەرانو دوژمنانی خودای گەورە، وە فێری ئەکردن کە جادووگەری بێباوەڕیە، هەر لەم دێیەمدا جادووگەرێکی بەناوبانگ هەبوو، هەر گەنجێك بیویستایە خێزان پێکەوە بنێو ژن بهێنێ ئەم جادووگەرە داوای پارەی لێئەکرد، ئەگەر نا دەیبەستێو توانای ژنو مێردایەتی ناهێڵێت، بۆیە گەنجەکان هیچ چارەیەکیان نەئەماو ناچار ئەچوونە لای جادوو گەرەکە بۆ ئەوەی

جادووەکەیان بۆ بکاتەوە، لەم کاتەشدا جادووگەرەکە دوو ڤات پارەی لێوەرئەگرتن، لەبەر ئەوەی لەپێش ژن هێنانەکەیاندا رێزی جادووگەرییەکەیان نەگرتووەو بەقسەیان نەکردووە، ئەم گەنجە خودا ناسەش بە ئاشکرا دژایەتی جادووگەرەکەی ئەکردو بەخراپە باسی ئەکردو خەڵکی لێ ئاگادار ئەکردەوە، ئەم گەنجە کاتی ژن هێنانی هاتە پێشەوەو خەڵکەکە چاوەڕێی ئەوەیان ئەکرد کە لەکاتی ژن هێنانی ئەم گەنجەدا چی ڕووئەدات ....پاشان گەنجەکە کاتی ژن هێنانی نزیك بۆوەو هات بۆ لامو (گێڕەرەوەی ڕووداوەکە) ڕووداوەکەی بۆ گێڕامەوە وووتی: بە ڕاستی جادووگەرەکە هەڕەشەی لێکردومو خەڵکی لادێکەش چاوەڕوانن بزانن کێ سەرکەوتوو ئەبێت ئایا ئەتوانی ئەو دوعاو ئایەتانەم بدەیتێ کە دژی جادووە، بەتایبەت جادووگەرەکە ئەوەی لە توانایدا بێت بەرامبەر من بەکاری ئەهێنێ، چونکە زۆر قسەم پێ کردوەو سوکایەتیم پێ کردووە .... منیش ووتم: بەڵێ، بەڵام بەمەرجێك هەواڵی بۆ بنێریو پێی بڵێی کە من لەفلانە ڕۆژدا ژن ئەگوازمەوەو چیت لە دەست دێت بیکە، ئەم ڕووبەڕووبوو نەوەش بە خەڵکی ڕابگەیەنە.

گەنجەکەووتی: ئایا تۆ دڵنیایت؟!

منیش ووتم: بەڵێ .. دڵنیام، سەرکەوتن بۆ باوەڕدارانە، سوکیو ڕیسوایش بۆ تاوانبارانە.

گەنجەکەش بەجادووگەرەکەی ڕاگەیاندو خەڵکەکەش زۆر بە پەرۆشەوە چاوەڕێی ئەو ڕۆژەیان ئەکرد ... منیش هەندێ دوعای خۆپاراستنم دا بەگەنجەکە، سەرەنجام گەنجەکە ژنی گواستەوەو جادووی جادووگەرەکە هیچ کاریگەرییەکی لەسەر دروست نەکرد، خەڵکی سەریان سوڕماو زۆر لە لایان سەیر بوو، ئەم کارەش سەرکەوتنێك بوو بۆ بیروباوەڕی ئیسلامو ئاماژەش بوو بۆ خۆڕاگری کەسانی باوەڕدارو پارێزگاری خودای گەورە بۆ ئیمانداران لە بەرامبەر خراپەکاراندا، خودای گەورە ڕاستی فەرمووە:﴿ فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ٧٦ ﴾النساء. واتە:(لەگەڵ دۆستانی شەیتان شەڕبکەن، بەڕاستی پیلانی شەیتان هەر لاوازبووە). بەمەش ئەم گەنجە لە نێوان خەڵكو کەسو کاریدا سەر بەرزبوو، خوداش سامو هەیبەتی جادووگەرەکەی لەناو بردو سوكو ڕیسوای کرد، سوپاسو ستایش بۆ خوداو سەرکەوتن هەر لای ئەوە .

( الصارم البتار / علاج بعض انواع السحر، وحيد بالي ).

# بـــــەشی شەشـــەم

## هەنگاوەکـــانی شـــەیتان

**هەنگاوە یەك لە دوا یەکەکانی شەیتان بۆ گومڕا کردن:**

براو خوشکی مسولْمان، خودای گەورە منیش‌و تۆش بپارێزێت لە هەموو خراپەیەك، بە ڕاستی خودای گەورە ئاگاداری کردووینەتەوەو فەرمانی پێکردوین کە دوای هەنگاوەکانی شەیتان نەکەوین، هەروەك ئەفەرموویت:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعۡ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۚ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٢١﴾ ﴾ النور. واتە:(ئەی ئەوانەی ئیمان‌و باوەڕتان هێناوە، شوێنی هەنگاوو نەخشەو پیلانی شەیتان مەکەون، هەرکەس شوێنی هەنگاوو نەخشەو پیلانی شەیتان بکەوێت، زەرەر مەند ئەبێت، چونکە بە ڕاستی شەیتان هەمیشە فەرمانتان پێ ئەکات بە کارو کردەوەی خراپ‌و گوناهو تاوان، ئەگەر فەزڵ‌و میهرەبانی خودا نەبوایە لە سەرتان هەرگیز کەستان پاك‌و پوختەو ڕزگار نە ئەبوون، بەلاّم خودا هەرکەسێکی بوێت‌و شایستە بێت، پاك‌و پوختەی ئەکات‌و لە گوناهەکانی ئەبورێت، خوداش هەمیشە بیسەرو زانایە) .

پێغەمبەریش﴿ﷺ﴾ ئومەتەکەی لەم نزیکبوونەوەیەی شەیتان ئاگادار کردۆتەوە (عبداللەی کوڕی عومەر) (خودایان لێ ڕازی بێت) ئەفەموێت: لە سەردەمی پێغەمبەردا﴿ﷺ﴾ دوو پیاوی ووتار بێژ لە ڕۆژهەلاّتەوە هاتن، هەستان‌و قسەیان کردوو پاشان دانیشتن، لەدوای ئەمان (ثابیتی کوڕی قەیس )ووتار بێژی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ هەستاو قسەی کرد، پاشان دانیشت، خەڵکی سەرسام بوون بە قسەی ئەو دووپیاوە، پاشان پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ هەستاو فەرمووی:( **يأيها الناس قولوا بقولكم، فإنما تشقيق الكلام من الشيطان**). (رواه احمد، حديث صحيح). واتە:(ئەی خەڵکینە، ئەو قسانە بکەن کەووتیان، بە دڵنیایەوە زیادە ڕەوی‌و زیاد پیاهەڵدان لە شەیتانەوەیە).

لە ڕووداوێکی تردا پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ یارانی ئاگادار ئەکاتەوە لە نزیك بوونەوەی شەیتان، ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێت) ئەگێڕێتەوە کە پیاوێك ووتی: ئەی موحەممەد، ئەی باشترینمان، ئەی گەورەمان، ئەی کوڕی گەورەمان، پێغەمبەر فەرموویەتی: ( **قولوا بقولكم، ولا يستجركم الشيطان ـ أو الشياطين ـ، قال: إحدى الكلمتين، أنا محمد بن عبدالله و رسوله ، أنا محمد بن عبدالله ورسوله، ما أحب أن ترفعوني فوق منزلتي التي أنزلني الله عزوجل** ) .

(رواه أحمد حديث صحيح). واتە:(هەر ئەو قسانە بکەن کەوتووتانە، با شەیتان بەکرێتان نە گرێت‌و یەکێك لەم دوو ووشەیەی فەرموو: من (موحەممەدی کوڕی عبدالله)م نێردراوی خودام، من (موحەممەدی کوڕی عبدالله)م نێردراوی خودام‌و من حەزناکەم بەرزم کەنەوە زیاتر لەو بەرزکردنەوەیەی کە خودا پێی بەخشیوم‌و بەرزی کردوومەتەوە) .

ئەی بەندەی خودا شەیتان نایات ڕاستەوخۆ پێت بڵێت تاوان بکە، وەك ئەوەی پێت بڵێت زینا بکە، یان مەی بخۆرەوە، یان دزی یان کوشتن یان هەر تاوانێکی تر ئەنجام بدە، بەڵکو لەسەرەتاوە بە جوان کردن‌و ڕازاندنەوەی تاوان دەست پێ ئەکات بۆ نموونە ئەڵێت: سەیری ئەو ئافرەتە بکە بزانە چەند جوانە !

پاك‌و بێگەردی بۆ ئەو کەسەی دروستی کردووە .... ئەمەش زیانت پێ ناگەیەنێت، چونکە تۆ لە خودا ئەترسی‌و نابیتە هۆی ئەنجام دانی زینا، تاوانی بچوکیشە، لەگەڵ دواین دڵۆپە ئاوی دەست نوێژیشدا خودا لێت خۆش ئەبێت، ئەگەر مرۆڤ قایل بوو، ئەوا شەیتان بەم فێڵە زۆر دڵخۆش ئەبێت .... چونکە ئەزانێ لە داهاتوویەکی نزیکدا ئەکەویتە داوی جوانیەکەیەوەو پاشان دڵی ڕەش ئەکات‌و ژەنگ دایئەپۆشێ، ئەو کەسانەی تووشی تاوانی زینا بوون، بەم شێوەیە دەستیان پێ کردووە، چونکە خۆیان بۆ نەگێڕاوەو سەرەتا بە تاوانی بچوکیان زانیوە، هەر لەبەر ئەمەشە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا۟ مِنْ أَبْصَٰرِهِمْ وَيَحْفَظُوا۟ فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ

أَيْمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُوْلِي ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُواْ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾ ﴾ النور. واتە:(ئەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بە پیاوانی ئیماندار بڵێ: چاویان بپارێزن (لە سەرنجدانی ئافرەتی نامەحرەم) هەروەها عەورەتی خۆیان لە حەرام بپارێزن، بێگومان ئەوە پاكو پوخت ترە بۆیان، بە ڕاستی خودا ئاگادارە بەو هەڵسو كەوتو ڕەفتارانەی كە ئەیكەن * بە ئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ: چاویان بپارێزن ( لە تەماشای نامەحرەم) داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناهو جوانی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی كە دیارە (وەك دەمو چاوو دەست) با سەر پۆشەكانیان بدەن بەسەر سینەو ملیانداو جوانیو زینەتی خۆیان دەرنەخەن بە تەواوی بۆ هاوسەرەكانیان نەبێت، یان بۆ باوكی خۆیان یان بۆ باوكی مێردەكانیان یان كوڕی خۆیان یان كوڕی مێردەكانیان، یان بۆ براكانی خۆیان، یان بۆ برازاكانیان ، یان بۆ خوشكەزاكانیان، یان بۆ ئافرەتێ كە پەیوەندیان پێكەوە هەیە، یان بۆ كەنیزەكانیان، ئەوانەی كە لەماڵەكانتادا ئەژینو پێویستیان بە ئافرەت نیە (لەبەر پیری، یان نەخۆشی) یان بۆ ئەو منداڵانەی كە هێشتا شارەزاییان لە ئافرەتدا نیەو (ئارەزووی جنسیان بۆ دروست نەبوەو نازانن باسی عەورەت بكەن) نابێت ئافرەتانی ئیماندار قاچیان دەربخەنو پێیەكانیان بدەن بە زەویدا (تا دەنگی خشڵو پاوانەكانیان بێت)و بزانرێت كە زینەت دارو خشڵ دارن، كەواتە ئیمانداران هەموتان بەرەو لای خوداو ڕەزامەندی ئەو بگەڕێنەوە، بۆ ئەوەی ڕزگارو سەرفرازبن) .

پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەمەی بەرامبەر (**فضل**)ی ئامۆزای خۆی كردووە، هەروەك (عەلی كوڕی ئەبو تالیب) (خودای لێ ڕازی بێت) ئەگێڕێتەوەو ئەفەرموێت: پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾ لە عەرەفە وەستا بوو، كچێكی گەنج هات بۆ لایو ووتی: باوكم پیر بووەو كەنەفتەیە، ئەگەر حەجی بۆ بكەم پاداشتی بۆ هەیە، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: بەڵێ، لە جیاتی باوكت ئەنجامی بدە، پاشان ملی (**فضل**) ی سوڕاند بۆ دواوە، (عەباس) پێی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خودا، بۆچی ملی كوڕە مامەكەت سوڕاند بۆ دواوە؟ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی:كچو كوڕێكی گەنجم بینی، ترسام شەیتان كاریگەری لە سەریان هەبێت) .

هەر لەو تاوانانەش کە شەیتان پلە بە پلە مرۆڤ توش ئەکات، ڕوانینە بۆ هونەرمەندان‌و بێژەری تەلەفزیۆنەکان، شەیتان بەرەبەرە سەماکەرەکانت بۆ ئەرازێنێتەوە بۆ ئەوەی سەیریان بکەی، پاشان هانت ئەدات بۆ سەیرکردنی فلیمە ڕووتەکان بەم شێوەیە لەسەر کاری خۆی بەردەوام ئەبێت هەتا ئەکەویتە داوو بۆسەیەوە ....

زۆرن ئەو کەسانەی کە ئامێری سەتەلایتی دیجیتاڵ ئەبەنە ماڵە کانیانەوە، وەك بیستومە نزیکەی چوار سەد کەناڵی سەماکردن‌و بێ ئابڕوویی تێدایە، یەکەم جار کاتێك ئەیبەنە ماڵەوە، شەیتان بۆیان ئەرازێنێتەوە کەوا دەرسی زانستی بەسودی تێدایە، هەروەها مەککەو مەدینەو نوێژی تەراویح‌و هەینی ئەبینێ.... هتد بەڵام شەیتان واز ناهێنێت کە تەنها سەیری کەناڵە ئاینیەکان بکات، سەرەتا دەست پێ ئەکات، ئەڵێ: سەیری جیهانی دەریاکان بکە، سەیری زۆران بازییەکان بکە، سەیری جیهانی ئاژەڵەکان بکە، سەیری دراما کۆمەڵایەتیەکان بکە..... سەیر بکە.... ئیتر کەناڵەکان ئەگۆڕی بەدوای ئەم کەناڵ‌و ئەو کەناڵدا، هەتا ئەچیتە سەر گۆرانی بێژە سەرگەردانەکان، سەماکەرە بێ ئابڕووەکان.... ئەمەش ئەوەیە کە ئەفست حەزی پێئەکات‌و چێژی لێوەرئەگرێت، ئەو کەسانەش کەمن کە شەیتان ناتوانێ بیان گەیەنێتە ئەم قۆناغە، داوا ئەکەین کە خودای گەورە بمان پارێزێت ـ أمین ـ

## ئایا شەیتان بە ئەوەندە ڕازی ئەبێت‌و واز ئەهێنێ؟!

نەخێر، سوێند بە خودا واز ناهێنێ، هەتا ڕای ئەکێشێ بۆواز هێنان لە نوێژەکانی، ئەیکات بە مرۆڤێك کە بەدوای ئارەزوویدا وێڵ‌و سەرگەردان بێت، تەنانەت لە ڕۆژەکانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزیشدا، هەروەها لە کات‌و شوێنە پیرۆزەکانیشدا لە عیبادەتی خودای گەورە دوری ئەخاتەوەو نغرۆ ئەبێت لە تاواندا، بەڵکو ئەیکاتە مرۆڤێکی بێ ڕەوشت، تەنانەت غیرەتی نامێنێت، وای لێدێت باوەڕی بە خوداش نەمێنێ، ئەمەش بەوازهێنانی لە نوێژو ڕخنە گرتن لە فەرمانەکانی خودای گەورە، تاوای لێدێت ئەبێت بە مرۆڤێك کە ڕازی نابێت بە بنەماکانی شەرع‌و ڕقی لە دین ئەبێتەوە، وەك ڕق بوونەوە لە بەردباران کردنی زینا کەرێکی خێزاندار، ئەمەش لە کاتێکدا کە خۆی یەکێك بێت لەو کەسانە، شەیتان وازی لێ ناهێنێ، تاوای لێدێت باوەڕی بە خوداو ئاینەکەی نامێنێت، هەروەها بێباوەڕە بێت بەرامبەر بەهەر شتێك کە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ هەواڵی لە بارەیەوە دابێت،

ئەگەر شەیتان لەم قۆناغەدا سەرکەوتووبوو کە (قۆناغی بێباوەڕیە) (الکفر) ئەمەش (یەکەم کۆسپە) لەو شەش کۆسپەی کە (إبن القیم) (ڕەحمەتی خودای لێبێت) لە کتێبی (مدارج السالکین)دا باسی کردووەو ئەو کاتە شەیتان ئاگری دوژمنکاریەکەی سارد نەبێتەوەو پشو ئەدات، چونکە ئەم قۆناغە لە دەست دانی دنیاو قیامەتە، ئەگەر مرۆڤی مسوڵمان ئەم کۆسپەی تێکشکاندو ڕزگاری بوو بە ڕووناکیو ڕێنماییەکانی ئایین ئەوە دێتە سەر (کۆسپی دووەم) .. ئەمەشیان کۆسپی (**بدعة**) داهێنانی شتی زیادەیە بۆ دین، ئەمەش (إبن القیم) باسی کردووە لە دوای بڕینی کۆسپەکانی بێباوەڕی بەرامبەر خودا، لەبەر ئەوەش لە دوای بێباوەڕی باسکراوە، چونکە لەترسناکترین کۆسپەکانە، چونکەوا لە مرۆڤ دەکات کە خودا بەشێوەیەك بپەرستێت کە بەو شێوەیە داوای لێ نەکردووە، بەڵکو بەشێوەیەك خودا پەرستی ئەکات کە پێچەوانەی فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خودا بێت ﴿ﷺ﴾.. شێخی ئیسلام (**إبن تیمیة**) (ڕەحمەتی خودای لێبێت) ئەفەرموێت: (بێباوەڕی ڕاستەقینەو بیدعەو تاوان یەکیان گرت، خەسارەمەندیو زەرەر مەندی دونیاو قیامەتیان لێ دروست بوو).

ئەگەر مرۆڤی مسوڵمان ئەم کۆسپەشی بڕی لە ژێر ڕۆشنایی سونەتی پێغەمبەدا ﴿ﷺ﴾ ئەوا شەیتان داوای (کۆسپی سێیەم)ی لێئەکات ئەمیش کۆسپی تاوانە گەورەکانە، شەیتان ئەم کۆسپەی بۆ ئەڕازێنێتەوەو لە نیگایدا جوانی ئەکات، ئەمڕۆو سبەی پێ ئەکاتو پێی ئەڵێت: ئیمان بریتی یە لە پەسەند کردنو بە ڕاست زانین، گوناهو تاوان لەکەداری ناکات یان ئەڵێت: (لەگەڵ یەکتا پەرستیدا تاوان زیانی نیە، هەروەك لەگەڵ هاوەڵ داناندا چاکە سودی نیە) بەڵکو شەیتان زۆر هەوڵ ئەدات کە قەناعەتی پێ بکات کە لەگەڵ ئیماندا سەرپێچی زیانی نیە، وای لێئەکات بڵێ ئەمڕۆ نا سبەی تەوبە ئەکەم، یان کە خێزانم هێنا تەوبە ئەکەم، تەوبە ئەکەم کاتێك تەمەنم گەیشتە پەنجا ساڵی.... سبەی.. دوای سبەی.... کاتێك ئەزانێت فریشتەی گیان کێشان لە دەرگاکەی ئەداتو ئەیەوێت گیانی بکێشێ، ئەوکاتە چی ئەڵێیت ئەی بەندەی خودا کە لەبەردەم دەسەڵاتی خودای گەورە ڕاوەستاوی؟ چی ئەڵێی کاتێك (نەکیرو مونکیر) دێن بۆلات؟ لە تاریکی گۆڕدا چی ئەکەیت؟ نەك هەر ئەوە لەسەر زەوی چی ئەکەیت لە کاتێکدا کە بێ ڕەوشتو بەدڕەوشتی؟ بەبێ

غیرەتی؟ بەبێ ئاینی؟ بەبێ ترسی خودای گەورە، بە ئاشکرا تاوان ئەنجام ئەدەیت، شەوو ڕۆژ بە شوێن ئارەزووەکانتەوەی، لە خراپە کاریدا نغرۆ بووی، لە دوای ئەم تیاچوونە، تیاچوونی تر هەیە ئەی بەندەی خودا؟ چی حەسرەتێك هەیە دوای ئەم حەسرەتە؟چۆن ڕێگەت بە شەیتان دا لە تاوانێکەوە ڕاتبکێشێ بۆ تاوانێکی تر؟ هەتا بەرەو تاوانە گەورەکانی بردیت، پەنا بەخودا ! ئەگەر مسوڵمان ئەم کۆسپەی بڕی یان تەوبەیەکی ڕاستەقینەی کردو بەیارمەتی خودا ڕزگاری بوو پاشان دێتە سەر، قۆناغی چوارەم یان( کۆسپی چوارەم ) ئەمەیان قۆناغی تاوانە بچوکەکانە، شەیتان ئەیرازێنێتەوەو لەبەرچاوی ئاسانی ئەکاتو پێی ئەڵێت: گوناهی بچوك زیانت پێ ناگەیەنێت، ئەگەر لە تاوانە گەورەکان دووربکەویتەوە، ئەگەر لە تاوانە گەورەکان دوورکەویتەوە .. ئەوا تاوانە بچوکەکان ئەسڕێنەوە، بەردەوام وای لێئەکات بە سوکی سەیری تاوانە بچوکەکان بکات، تا سور بێت لەسەری بەمەش ئەو کەسەی گوناهی گەورە ئەکاتو ئەترسێو پەشیمانی دەرئەبڕێ، زۆر حاڵی باشترە لە ئەم، چونکە سووربونو بەردەوام بوون لەسەر تاوانی بچوك لە خودی تاوانەکە گەورەترە .. پەشیمانیو تەوبە کردن، گوناهی گەورە ئەسڕێتەوە، بەڵام بەردەوامیو سووربوون لە سەر تاوانی بچووك سەر ئەکێشێو بەرەو تاوانی گەورەت ئەبات.

لە فەرموودەیەکدا کە ئیمامی ئەحمەد گێڕاویەتیەوە، کە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەفەرمووێت: (**إياكم ومحقرات الذنوب، كقوم نزلوا في بطن وادٍ، فجاء ذا بعودٍ، وجاء ذا بعودٍ، حتى أنضجوا خبزتهم، وإن محقرات الذنوب متى يؤخذبها صاحبها تهلكه** ). (حديث صحيح). واتە: (ئاگاتان لە گوناهەکانتان بێتو بە بچوکیان مەزانن، وەکو قەومێك کە لە دۆڵێکدا لایان دا، کەسێك هەندێك چیلکەو داری بچوکی هێنا، کەسێکی تر دیسان هەندێك چیلکەو داری بچوکی هێنا، تانانەکەیان پێ دروست کرد، گوناهە بچوکەکان هەر کاتێ کۆکرانەوەو لێپرسینەوە لەگەڵ خاوەنەکەیدا کرا، ئەبێتە هۆی لەناو چوونی خاوەنەکەی) .

ئەگەر تاوانی بچوك لە سەر مرۆڤێك کۆمەڵ بێت لەناوی ئەبات، تۆ لەوانەیە نەزانیت کاتێك ڕۆژی قیامەت دێتو ئەم تاوانە بچوکانە لە تەرازوودا لەشاخی ئوحود قورسترئەبن، لەبەر ئەوە ئاگادار کردنەوەکەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بەکەم مەزانەو هۆشیاربە، چونکە دوژمنەکەت زۆر سامناکە.

ئەگەر مسوڵمان لەم کۆسپەش ڕزگاری بوو، ئەمەش بە ئاگاداربوونو خۆپاراستنو تەوبەی بەردەوامو داوای لێ خۆشبوونو ئەنجام دانی چاکە لە دوای خراپە ئەبێت، ئەوسا دێتە سەر( قۆناغی پێنجەم) ئەمەش کۆسپی شتە ئاساییەکانە، کە ئەنجام دانیان تاوان نیە، بەڵام وات لێ ئەکات کە زۆر یادی خودا نەکەیتو زۆر زۆر هەوڵ نەدەیت بۆ ڕۆژی دوایی، پاشان پلە بە پلە لێی نزیك ئەبێتەوە، تاواز لە سوننەتەکان بێنێ، ئەگەر شەیتان توانای ئەمەی نەبوو، ئەوە بەلای کەمەوە وای لێئەکات کە کارە گرنگەکانی لە دەست بچێتو دەستکەوتە گەورەکانو پلەو پایە بەرزەکانی دەست نەکەوێت، بەڵام ئەگەر نرخی ئەو شتانەی بزانیایە بۆ نزیك بوونەوە لە خودا، ئەوا هەرگیز ئەو کارانەی لە دەست نەئەدا، بەڵام نەزان بوو، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرمووێت:( **من خاف، أدلج، ومن أدلج بلغ المنزل، ألا إن السلعة الله غالية، ألا إن سلعة الله الجنة** ). (الترمذي:٢٤٥٢). واتە: (هەر کەسێك گرنگی بەشتێك بدات، لە ئێوارەوە خۆی بۆ حازر ئەکاتو شەوی پێوە ئەگرێت، وە هەر کەسێك خەمی لە کارەکەی خوارد ئەگات بەمەبەستی خۆی، ئایا ئەزانیت ئەوەی کە لە خودات ئەوێت چەندێك بە نرخو گەورەیە؟ ئەوەی کە داوای ئەکەیت ئەزانی بەهەشتە؟!) .

ئەگەر بە بەرچاو ڕوونیو هیدایەتو باوەڕەوە لەم کۆسپەش ڕزگاری بوو، ئەوا شەیتان داوای (قۆناغی شەشەم)ی لێئەکات، ئەم قۆناغەش بریتییە لەوەی کە شەیتان کارە شیاوو پەسەندەکانی لە لا جوان ئەکات، چونکە لەم کارانەش شیاو ترو پەسەند ترو باشتر هەیە، شەیتان ئەم کارە جوانانە زیاتر جوان ئەکاتو ئەیان ڕازێنێتەوە، بۆ ئەوەی سەرقاڵبێتو بەو کارانەوە خەریك نەبێت کە پاداشتو پلەی بەرزتریان هەیە، چونکە شەیتان ئەزانێ ناتوانێ ئەم کارە باشانەی لەدەست بکاتەوە، بۆیە هەوڵ ئەدات کارە زۆر باشو پلە بەرزەکانی لە دەست بدات، بۆ ئەوەی بە پەسەندەوە خەریکی بکات، تا پەسەند تر، یان بەشیاو تا شیاو تر، یان بەو شتانەی کە کەمتر لەلای خودا خۆشەویستن، تا ئەو کارانەی کە زۆر خۆشەویستن لەلای خودا، ئەی بەندەی خودا بڕوانن بۆ هەوڵەکانی شەیتان بۆ گومڕا کردن، بەردەوام ئاگاتان لە خۆتان بێت، داواکارین خودای گەورە، کە بمان پارێزێتو شەیتانمان بە سەردا زاڵ نەکات، خودای گەورە بەڕاستی تۆ باشترین پشتیوانو چاکترین یارمەتی دەری.

# بـــــەشی حەوتەم

## شوێنی چوونە ژوورەوەو هێرشەكانی شەیتان بۆ سەر مرۆڤ

شەیتان دوژمنێكی ئاشكرای مرۆڤەكانە، وەك خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لِلۡإِنسَٰنِ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٥﴾ ﴾ یوسف .واتە:(بە ڕاستـــی شەیتان دوژمنێكی ئاشكرای مرۆڤەكانە).

هەروەهــــا ئەفەرمویـــت: ﴿ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٌ ﴿١٦٨﴾ ﴾البقرة

واتە:(شوێن هەنگاوەكانی شەیتان مەكەون بە ڕاستی شەیتان دوژمنێكی ئاشكراتانە).

**برای بەڕێزو خوشكی ئازیز:** ئێمە هەوڵ ئەدەین سەبارەت بەم دوو ئایەتە بدوێین‌و باسیان بكەین‌و ڕونی بكەینەوە كە شەیتان لەكام ڕاڕەوانەوە گوزەر ئەكات‌و هێرش ئەكاتە سەر مسوڵمان، ئەمەش لە كاتی بێ هێزی یان بێ ئاگایی مسوڵماناندا، خودای گەورە هەموومان بپارێزێ.

**هێرشی یەكەم: لەكاتی لە دایك بووندا:**

سەرەتای ئەم شەڕە بە هێرشی شەیتان دەست پێ ئەكات بۆ سەر مرۆڤ لە یەكەم ساتی هاتنە دونیای مرۆڤ لە كاتی لە دایك بونیدا .

(ئەبو هورەیرە) (خودای لێ ڕازیبێت) ئەفەرمووێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی (**صياحُ المولودِ حين يقع، نزغة من الشيطان**). (رواه المسلم). واتە: (زریكاندنی منداڵی كۆرپە لە كاتی لە دایك بوونیدا، چرنوك پیاچەقاندنێكە لەلایەن شەیتانەوە) .

هەر لە (ئەبو هورەیرە)وە (خودای لێ ڕازیبێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەگێڕێتەوەو ئەفەرمووێت: (**كل بني آدم يطعن الشيطان في جنبيه بإصبعه حين يولد غير عيسى ابن مريم ذهب يطعن فطعن في الحجاب**). (رواه البخاري). واتە:(هەموو ئادەمیزادێك لە كاتی لە دایك بوونیدا شەیتان بە پەنجەكانی سیخورمەیەك لە لای چەپ یان ڕاستی ئەدات، تەنها عیسای كوڕی مەریەم نەبێت، ڕۆیشت سیخورمەی لێبدات بەڵام سیخورمەی دا لە پەردەیەك كە لە نێوانیان دا بوو).

پاشان (ئەبو هورەیرە) ئەفەرمووێت: ئەگەر توانیتان ئەم ئایەتە بخوێنن: ﴿ وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ٣٦ ﴾ آل عمران. واتە:(ئەی خودایە من خۆی‌و نەوەکەی ئەپارێزم بە تۆ لە شەیتانی ڕەجم کراو). (متفق علیه).

زانایان ئەفەرموون: مەرج نیە ئەم پیا چەقاندن‌و چڕنوکەی شەیتان ببێتە هۆی لەڕێ لادان‌و گومڕایی، ئەوەش کە گومانی‌وایە گومانەکەی لە جێی خۆیدا نیە، چونکە چەندەها پێغەمبەرو پیاو چاك توشی ئەم بەلایەی شەیتان بوونە، بەلام خودای گەورە پاراستونی لە هەموو خراپەیەکی شەیتان، هەروەك خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ٤٢ ﴾ الحجر. واتە: (بە ڕاستی بەندە چاك‌و پاکەکانی من بە تۆ فریو نادرێن‌و تۆ هیچ دەسەلاتێکت نیە بەسەریاندا، جگە لەو کەسە سەرکەش‌و سەرگەردانانەی کە شوێنت کەوتوون) .

**هێرشی دووەم: گومان دروست کردن لە بەتاك‌و تەنیا زانینی خودا:**

ئەم جەنگە بەردەوامەو شەیتان هێرشی دووەم دەست پێ ئەکات، کە ئەویش بریتیە لە گومان دروستکردن لە بەتاك زانینی خودای گەورە (التوحید) چونکە یەکتا پەرستی‌و بەتەنها زانینی خودا، بناغەی پتەوی ئیسلامە، هەر لەبەر ئەمەشە زۆرترین هێرشی شەیتان بۆ سەر ئەم بناغەیە ئاراستە ئەکرێت، خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ كَمَثَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ إِذۡ قَالَ لِلۡإِنسَٰنِ ٱكۡفُرۡ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٦ ﴾ الحشر. واتە: (وەکو شەیتان کە بە مرۆڤی‌ووت: بێبڕوابە، کاتێکیش کە بە قسەی شەیتانی کردوو بێبڕوابوو، شەیتان‌ووتی: بە ڕاستی من بەریم لە تۆ) .. شەیتانیش یەکسەر بانگت ناکات بۆ بێباوەڕی، بەلکو شێوازی جیاوازو پلە بەندی بەکار ئەهێنێ‌و بانگت ئەکات بۆوازهێنان لە کارە زۆر باشەکان بەرەو ڕەوشتە ناساییەکان، پاشان هەلئەستێ بە ڕازاندنەوەی تاوانە بچوکەکان‌و ئاسانکردنی لە بەرچاوی مرۆڤ پاشان بەرەو گوناهە گەورەکانت ئەبات، ئەگەر مسولمانیش توشی گوناهی گەورە بوو، پەنا بەخودا ئەوا لە بێباوەڕی نزیك ئەبێتەوە .

پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێت: (**يأتي الشيطان أحدكم فيقول: من خلق كذا؟ من خلق كذا؟ حتى يقول: من خلق ربك؟ فإذا بلغ ذلك فليستعذ بـــالله ولينته**). (متفق عليه) .

واتە:(شەیتان دێتو بە یەکێکتان ئەڵێت: کێ فلانە شتی دروستکردووە؟ ئەی فلان شت کێ دروستیکردووە؟ هەتاوەکو ئەڵێ کێ پەروەردگارتی دروستکردووە؟ هەرکاتێ گەیشتە ئەم پرسیارە، با پەنا بە خودا بگرێو کۆتایی بەبیرکردنەوەکەی بهێنێ) .

**هێرشی سێیەم: لەکاتی وەسوەسەدا:**

یەکێك لە شەڕەکانی تری شیتان بریتیە لەوەسوەسە خستنە دڵی مسوڵمانەوە، وەسوەسەش لە گەورەترین سیفەتەکانی شەیتانەو لە هەموویان خراپترە، هەروەها بنەڕەتی هەموو سەرپێچیو دەردە سەرییەکە .

(ئەبو هورەیرە) (خودای لێ ڕازیبێت) ئەفەرموێت: خەڵکانێك لە یاران هاتن بۆلای پێغەمبەر﴿ﷺ﴾و پرسیاریان لێ کردو ووتیان: (**إنا نجد في أنفسنا ما يتعاظم أحدنا أن يتكلم به، قال: (وقد وجدتموه) قالوا: نعم، قال: (ذاك صريح الإيمان)**. (رواه مسلم) .

واتە:(ئێمە لە ناخو دەروونماندا هەندێك شت ئەبینین کە ناتوانین دەریان بڕین لەبەر خراپی ئەو شتانە، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ئایا ئێوە گەیشتونەتە ئەو ئاستە تا ئەوە ببینن؟ووتیان: بەڵێ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ئەوە نیشانەی ئیمانێکی ئاشکراو پاكو بێگەردە) .

ئەم وەسوەسەیە لە دڵو دەروونو خەیاڵ دوورنەکەوێتەوە بەوەی ڕقێکی زۆرمان لە شەیتان بێت، چونکە ئەم وەسوەسەیە لە ئیمانەوەیە، وەك ئەو تێکۆشەرەی (المجاهد) کە دوژمن هێرشی بۆ دێنێ ئەمیش بەرەنگاری ئەبێتەوە هەتا سەر ئەکەوێ بەسەریدا، ئا ئەمەش گەورەترین تێکۆشانە، چونکە ئیمانی پاك ئەکاتەوە، سوپاس بۆ خودا کە کۆتا فێڵی شەیتان وەسوەسەیە.

**هێرشی چوارەم: لە کاتی درۆدا:**

(عبداللەی کوڕی مەسعود) (خودای لێ ڕازیبێت) لە پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:(شەیتان کاریگەرییەکی لەسەر ئادەمیزاد هەیە، هەروەها فریشتەکانیش کاریگەریەکیان لەسەر ئادەمیزاد هەیە، کاریگەری شەیتان بەڵێن دانە بەشەڕو بەدرۆ

خستنەوەی ڕاستیەکان، بەڵام کاریگەری فریشتەکانە بەڵێن دانە بە چاکەو بڕواکردنە بە ڕاستیەکان، هەرکەسێك ئەمەی بینی با بزانێ ئەمە لەلایەن خوداوەیەو با سوپاسی بکات .

بەڵام ئەوەی کاریگەری شەیتانی بینی با پەنا بەخودا بگرێت، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦٨﴾ ﴾ البقرة. واتە:(شەیتان وەعدو بەڵێنی هەژاریتان پێ ئەدات‌و فەرمانتان پێ ئەکات بە ئەنجام دانی کاری خراپە) . (رواه الترمذي: حديث صحيح) .

**هێرشی پێنجەم: لە کاتی دەست نوێژدا:**

ئەم جەنگەیان، وەستانی نیەو بەردەوامە کاتێك مسوڵمان ئەیەوێت دەست نوێژ بگرێت، شەیتان زۆر ئەم جەنگەی لەگەڵ توند ئەکات .

(ئوبەی کوڕی کەعب) (خودای لێ ڕازیبێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: **(إن للوضوء شيطانا يقال له : (الولهان) فاتقوا وسواس الماء )** (ضعيف الاسناد).

واتە:(بە ڕاستی شەیتانێك هەیە کە تایبەتە بە دەست نوێژو ناوی (وەلهانە) خۆتان بپارێزن‌و ئاگاتان لەوەسوەسەی شەیتان بێت لە ئاودا).

**هێرشی شەشەم: لە کاتی نوێژدا:**

ئەم هێرشەش لەو کاتە دایە کە مسوڵمان ئەیەوێت نوێژ بکات، (ئەبو هورەیرە) (خودای لێ ڕازیبێت) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: **(ما من ثلاثة في قرية ولا بدو لا تقام فيهم الصلاة، إلا قد إستحوذ عليهم الشيطان، فعليكم بالجماعة، فإنما يأكل الذئب من الغنم القاصية )** .(أبو داود:٥٤٧). واتە:(هەر کاتێك سێ کەس لە دێیەکدا یان لە چۆڵیەکدا بوون‌و نوێژەکانیان بە کۆمەڵ ناکرد، ئەوا شەیتان بەسەریاندا زاڵ ئەبێت، ئەکەن‌واز لە کۆمەڵ‌و یەکبونتان بێنن، بە دڵنیایەوە گورگ ئەو مەڕە ئەخوات کە لە ڕانەکەی دورئەکەوێتەوەو جیا ئەبێتەوە) .

هەروەها (ئیبن مەسعود) (خودای لێ ڕازیبێت) ئەفەرموێت: باسی پیاوێك کرا کە شەو خەوتووەو تا بەیانی خەبەری نەبۆتەوەو هەڵنەستاوە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: **(ذاك رجل بال الشيطان في أذنيه )**. (البخاري:١١٤٤، مسلم: ٧٧٤).

واتە:(ئەو پیاوە شەیتان میزی كردۆتە هەردوو گوێ چكەیەوە).

هەروەها لە فەرموودەیەكی تردا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەفەرمووێت: شەیتان سێ گرێ لەسەری هەر یەكێكتان ئەدات كاتێك ئەخەون، لە هەر گرێیەكدا ئەڵێت: شەوێكی دوورو درێژت لە پێشە بخەوە، ئەگەر هەستا لە خەوو یادی خودای كرد، ئەوا گرێیەكیان ئەكرێتەوە، ئەگەر دەست نوێژی گرت، گرێیەكی تری ئەكرێتەوە، ئەگەر نوێژی كرد، ئەوا گرێی سێیەمشیان ئەكرێتەوە، بەمەش‌وای لێدێت چالاك ئەبێت‌و دەروونی پاك ئەبێتەوە، ئەگەرنا بە دەروونی پیس‌و لاشەی تەمبەڵەوە ڕۆژ ئەكاتەوە.

هەروەها (عوسمانی كوڕی عاص) ئەفەرمووێت: چووم بۆ لای پێغەمبەر﴿ﷺ﴾و پێم ووت: ئەی پێغەمبەری خودا بە ڕاستی شەیتان دێتە نێوان من‌و نوێژەكەمەوەو خوێندنی قورئانم لێ تێك ئەدات، پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ فەرمووی ئەوە شەیتانێكە ناوی (خینزەبە) ئەگەر هەستت بەوە كرد پەنا بە خودا بگرە لێی‌و سێ جار تف بەلای چەپدا بكە، ئەفەرمووێت: منیش ئەوەم كردو ئیتر خودای گەورە لە سەری لا بردم). (رواه مسلم).

هەروەها (ئەنەسی كوڕی مالیك) (ڕەزای خودای لێبێت) ئەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی:(لە نوێژەكانتانا ڕێك ڕاوەستن با پاژنەی قاچتان بگات بە یەك‌و نێوانتان نەبێت‌و لە یەك نزیك ببنەوە، سوێند بەو كەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، من شەیتان ئەبینم كە چۆن خۆی ئەكات بە نێوان كە لێن‌و بۆشایی ڕیزەكاناو خۆی بچوك ئەكاتەوە وەكو بەرخ خۆی ئەكات بەناو ڕیزەكانا). (رواه ابوداود والنسائي).

**هێرشی حەوتەم: لەكاتی چوونە ماڵەوەدا:**

شەیتان لەلای دەرگای ماڵی موسڵمانان چاوەڕێی چوونە ژورەوەی موسڵمان ئەكات بۆ ماڵەكەی خۆی، ئەگەر یادی خودای گەورەی كرد، ئەوا هیچ دەسەڵا تێكی بە سەریدا نابێت، ئەگەرنا بەشداری ئەكات لەگەڵیدا لە خەوو خواردن‌و خواردنەوەیدا ....

(جابر) ئەگێڕێتەوەو ئەفەرمووێت گوێم لە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بوو ئەیفەرموو: (**إذا دخل الرجال بيته فذكر الله تعالى عند دخوله وعند طعامه، قال الشيطان: لا مبيت لكم ولا عشاء. وإذا دخل فلم يذكر الله تعالى عند دخوله، قال الشيطان: أدركتم المبيت، وإذا لم يذكر الله تعالى عند طعامه قال: أدركتم المبيت والعشا ء**). (رواه مسلم). واتە: (كاتێك پیاوێك ئەچێتەوە بۆ ماڵەوەو یادی خودا ئەكات لە كاتی چوونە ژوورەوەو كاتی خواردندا، شەیتان

ئەڵێت، نە جێگەمان لێرەدا ئەبێتەوەو نە خواردنیشمان لێرە دەست ئەکەوێت، بەڵام ئەگەر لە کاتی چوونە ژوورەوەدا یادی خودای نەکرد، شەیتان ئەڵێت: باشترین جێگەتان دەست کەوت، وە ئەگەر لە کاتی خواردنیشدا ناوی خودای نەهێناو یادی خودای نەکرد، ئەوا شەیتان ئەڵێت: هەم جێگەی حەسانەوەتان دەست کەوتو هەم خواردنیش).

**هێرشی هەشتەم: لە کاتی خەوتندا:**

ئەم جەنگە بەردەوامە کاتێ مسوڵمان ئەیەوێت بخەوێتو ڕائەکشێ، شەیتان وازی لێ ناهێنێ، تا دوای بخاتو گرێیەك لەسەر سەری ئەداتو پاشان پێی ئەڵێت: بخەوە شەوێکی دوورو درێژت لە پێشە.

**هێرشی نۆیەم: لە کاتی توڕەبووندا:**

(ئەبو هورەیرە) (خودای لێ ڕازی بێت) ئەگێڕێتەوە کە پیاوێك بە پێغەمبەری ووت: ئامۆژگاریم بکە، ئەویش فەرمووی (توڕە مەبە) چەند جارێك دووبارەی کردەوە، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ هەر فەرمووی (توڕە مەبە). (بوخاری گێڕاویەتەوە).

هەروەها (**سولە یمانی کوڕی صورد**) ئەفەرمووێت: لەلای پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دانیشتبووم، دوو پیاو شەڕە جنێویان ئەکرد، یەکێکیان ڕوخساری سور هەڵگەڕابوو، دەماری ملی بەرزبوو بووەوە، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی:من چەندووشەیەك ئەزانم ئەگەر بیڵێت ئەو حاڵەتەی لەسەر لائەچێت، ئەگەر بڵێت: پەنا بە خودا ئەگرم لە شەیتانی دەرکراو، پێیان ووت: پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەفەرمووێت: پەنا بەخودا بگرە لە شەیتانی دەرکراو واتە بڵێت: ﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾. (بوخاری ومسلم ڕیوایەتیان کردووە).

(**جابیر**) ئەفەرمووێت: گوێم لە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بوو ئەیفەرموو: (**إن الشيطان قد أيس أن يعبده المصلون في الجزيرة العرب، ولكن في التحريش بينهم**) (رواه مسلم: ٢٨١٢).

واتە:(شەیتان بێ هیوا بوو لەوەی کە لە دوورگەی عەرەبیدا بپەرسترێت، بەڵام هانیان دەدات، هەتا بەگژی یەکدا بچن).

**هێرشی دەیەم: لە خەودا:**

(ئەبو سەعیدی خودری) (خودای لێ ڕازیبێت) ئەفەرمووێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾ ئەیفەرموو: (**إذا رأى أحدكم رؤيا يحبها، فإنما هي من الله تعالى، فليحمد الله**

**علیها، ولیحدث بها، وفي رواية ـ فلا يحدث بها إلا من يحب ـ وإذا رأى غير ذلك مما يكره، فإنما هي من الشيطان، فليستعذ من شرها، ولا يذكرها لأحد، فإنها لا تضره).** (رواه البخاری: ٦٩٨٥ومسلم:٢٢٦٢) . واتە:(ئەگەر یەکێك لە ئێوە خەوێکی بینیو لەلای خۆش بوو، ئەوە بێگومان لە خوداوەیەو با سوپاسی خودای لەسەر بکاتو با بیگێڕێتەوە، لە گێڕانەوەیەکی تردا ئەفەرمووێت: (با نەی گێڕێتەوە تەنها بۆ ئەو کەسانە نەبێت کە خۆشی ئەوێن)وە ئەگەر خەوێکی ناخۆشی بینی، ئەوا بێگومان لە شەیتانەوەیە، با پەنا بە خودا بگرێ لێی، بۆ کەسیشی باس نەکات، ئەوا زیانی پێ ناگەیەنێ) .

(ئەبوو قەتادە) (خودای لێ ڕازیبێت) لە پێغەمبەرەوە﴿ﷺ﴾ ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (**خەوی چاك**) یان خەوی (**باش**) لە پەروەردگارەوەیە، خەوی خراپیش لە شەیتانەوەیە، هەر کەس خەوی ناخۆشی بینی، با سێ جار تف بکات بەلای چەپیداو پاشان پەنا بەخودا بگرێت لە شەیتان، بێگومان ئەو خەوە زیانی پێ ناگەیەنێت). (بوخاریو موسلیم گێڕاویانەتەوە) .

(**جابیر**) (خودای لێ ڕازیبێت) ئەفەرمووێت: کابرایەکی دەشتەکی هات بۆ لای پێغەمبەر﴿ﷺ﴾و ووتی: لە خەومدا سەرم لێبڕاوە، منیش دوای کەوتبووم، پێغەمبەریش پێی فەرموو: یاری کردنی شەیتان بە خۆت لە خەودا مەگێڕەوە). (بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردووە).

### هێرشی یازدەهەم: لە کاتی باوێشکدا،

خوێنەری بەڕێزو ئازیز، بزانە کە شەیتان پێی خۆشە زۆر باوێشك بدەیت، چونکە نیشانەی تەمبەڵیو سستیە، لەبەر ئەوە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمانی کردووە بە ڕێگری لە باوێشك دانو قووت دانەوەی، ئەبو هورەیرە ئەفەرمووێت: پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: بە ڕاستی خودای گەورە پژمینی پێ خۆشە، بەڵام باوێشکی پێ ناخۆشە، ئەگەر یەکێك لە ئێوە پژمیو سوپاسی خودای گەورەی کرد، پێویستە لەسەر هەموو مسوڵمانێك کە گوێی لێیەتی پێی بڵێ: (يرحمك الله). واتە: خودا ڕەحمت پێ بکات، بەڵام باوێشك لە شەیتانەوەیە، ئەگەر کەسێك باوێشکی دا چەندێك ئەتوانێت بارەتی بکاتەوە، کەیەکێك باوێشك ئەدات شەیتان پێی پێ ئەکەنێت) . (بوخاری گێڕاویەتیەوە) .

(ئەبو سەعیدی خودری) (ڕەزای خودای لێبێت) ئەفەرمووێت: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: (**إذا تثاءب أحدكم فليمسك بيده على فيه، فإن الشيطان يدخل**). (رواه مسلم) .

واتە:(ئەگەر یەکێك باوێشکی دا، با دەستی بخاتە سەر دەمی، چونکە شەیتانی لێوە ئەچێتە ژوورەوە) .

**هێرشی دوازدەهەم: لە کاتی ماڵ بە فیڕۆداندا:**

خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓا۟ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِ ۖ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا ﴿٢٧﴾ ﴾ الإسراء. واتە:(بەڕاستی ئەوانەی ماڵو سامانیان بە فیڕۆ ئەدەنو لە ڕێگەی خراپدا سەرفی ئەکەن، ئەوانە هەمیشەوەك برای شەیتانوان، شەیتانیش لە بەرامبەر نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارییەوە زۆر ناشوکورو بەد نمەکە) .

(**ئیمامی شافعی**) (ڕەحمەتی خودای لێبێت) ئەفەرمووێت: (**التبذير**) بریتیە لە بە فیڕۆدانی ماڵ لە ڕێگەی خراپە، بەڵام ئەگەر لە کاری خێردا بوو ئەوا بە ماڵ بە فیڕۆدان حساب ناکرێت، ئەمەش بۆچوونی زانایانە بەگشتی .

قاعیدەیەکی فیقهیش هەیە کە ئەڵێت: (**لا خير في إسراف، ولا إسراف في خير**). واتە:(خێرو چاکە لە زیادە ڕەویدا نیە، وە زیادە ڕەویش لە خێرو چاکەدا نیە) .

**هێرشی سیازدەهەم: لە کاتی خێرو بە خشیندا:**

خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦٨﴾ ﴾ البقرة. واتە:(کاتێك ئێوە لە ماڵو داراییتان ئەبەخشن، شەیتان بەڵێنی هەژاریو نەداریتان پێ ئەداتو بە هەژاری ئەتان ترسێنێتو فەرمانتان پێ ئەدات بە ئەنجام دانی گوناهو تاوانو خراپەو ماڵ نەبەخشین، خودای گەورەش بەڵێنی لێخۆشبوونی تایبەتی خۆیتان پێ ئەدات، لەگەڵ زۆری بەهرەی فراوانداو خودا فراوانگیرو زانایە) .

بە ڕاستی بەڵێنی شەیتان بە هەژاریو نەداری بۆ ئەوە نیە کە سۆزی هەبێت بۆی، یان ئامۆژگاری بکات بە لکو بەڵێنەکەی بۆئەوەیە، کە گومانی خراپی بەرامبەر پەروەردگاری بۆ دروست بکاتو واز لە بەخشینی ماڵو سامانی بهێنێ .

بەڵام خودای باڵا دەست بەڵێنی لێخۆشبوون بە بەندەكانی ئەدات، لەگەڵ زۆر كردنو زیادكردنی ئەوەی كە ئەیبەخشێت بە چەندان ئەوەندەو بە چەند بارە، ئەمەش لە دونیاو دوا ڕۆژیشدا، ئەمەیان بە لێنی خودایەو ئەوەی تریان بەڵێنی شەیتان، با مرۆڤی ڕژدو ڕەزیل سەیر بكاتو بزانێت كام بەڵێنیان متمانەی زیاترە، دڵیشی بە كامیان ئاسودەو ئارام ئەبێت .

دەبا ئاگاداری بەڵێنەكانی خودا بینو متمانەی تەواومان پێی هەبێتو گوێ ڕایەڵی بۆ شەیتانو بەڵێنە درۆكانی نەكەین .

**هێرشی چواردەهەم: لەگەڵ ئافرەتاندا:**

یەكێكی تر لەو ڕێگایانەی كە شەیتان بەكاری ئەهێنێ، بریتیە لە ئافرەتانو زۆرێك لە سەر بازانی شەیتان ئافرەتانن، زۆر جار ئەو تیرەی شەیتانن كە ئەیهاوێژێو زۆر كات نیشان ئەپێكن، هەروەها گەورەترین مەترسیو كاریگەرین بۆ سەر پیاوان، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەفەرمووێت: ( **ما تركت بعدي فتنة هي أضر على الرجال من النساء** ) (البخاري: ٥٠٩٦ و مسلم: ٢٧٤٠) .

واتە:(لە دوای خۆم هیچ شتێكم جێ نەهێشتووە مەترسی دار تربێت لە ئافرەتان بۆ پیاوان) .

ئافرەتان ئەو تۆڕەن كە شەیتان ناوێتیەوە بۆ ڕاو كردنو لە خشتە بردنی پیاوانو گومڕاكردنیان، تا ئەو كاتەی بەرەو زینایان ئەبات .

(جابیر) (خودای لێ ڕازیبێت) لە پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ ئەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: **(أن رسول الله﴿ﷺ﴾ رأى إمرأة، فاتى إمرأته زينب وهي تمعس منيئة لها، فقضى حاجته ثم خرج إلى أصحابه، فقال:( إن المرأة تقبل في صورة الشيطان، وتدبر في صورة الشيطان، فإذا أبصر أحدكم إمرأة فليأت أهله، فإنه ذلك يرد في نفسه )**. ( مسلم: ١٤٠٣)

واتە:(پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾ ئافرەتێكی بینی، پاشان ڕۆیشتەوە بۆلای زەینەبی خێزانیو پێویستی خۆی لەگەڵیدا جێبەجێ كردو پاشان چوو بۆ لای هاوەڵەكانیو پێی فەرموون: بە ڕاستی ئافرەت بەرەو ڕووت دێت لە سەر شێوەی شەیتانو بەرەو دوا ئەگەڕێتەوە لەسەروێنەی شەیتان، ئەگەر یەكێك لە ئێوە ئافرەتێكی بینی با بچێتە لای خێزانی خۆی، ئیتر ئەوەی لە دەروونیدایە ئەڕەوێتەوە) .

ئەمەش بۆ لە کەدارکردنو کەم کردنەوەی ڕێزی ئافرەت نیە، نەخێر بەڵکو لە ئافرەتاندا کەسانی زۆر چاك هەیە، ئەوەی ئێمە باسی ئەکەین، بۆ ئاگادار بوونە لەو شتانەی کە خاڵی لاوازی پیاوانەو شەیتان ئەتوانێت لەو ڕێگەیەوە بە ئاسانی هێرش بکات، ئەمەش لەو کاتەدا زۆر مەترسیدارە، کە پیاوێك لەگەڵ ئافرەتێکی بێگانەو نامەحرەمدا بێتو کۆببێتەوە .

( **ترمذي** ) لە پێغەمبەرەوە﴿ﷺ﴾ ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ( **لا یخلون رجل بإمرأة إلا کان ثالثهما الشیطان** ) . واتە:(پیاوو ژنێك لە جێگەیەکدا بەتەنیا بەیەکەوە نابن، تەنیا کاتێك نەبێت کە شەیتان سێ یەمیان بێت).

(عوقبەی کوڕی عامیر) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە﴿ﷺ﴾ کە فەرموویەتی: ( **إیاکم والدخول علی النساء** ) **فقال الرجل من الأنصار: أفرأیت الحمو؟ قال** ( **الحمو الموت** ). (البخاري، ٥٢٣٢ ومسلم، ٢١٧٢ ) . واتە:(دەخیلتان بم ئاگاتان لە چوونە ژوورەوە بە تەنها بۆ لای ئافرەتان بێت) پیاوێکی ئەنساری ووتی: ئەی ئەگەر خزمی پیاوەکە بوو؟ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ( **ئەوەیان هەر مردنە** ).

لەبەر ئەوەی خەڵکی زۆرجار خزمی مێرد وەك برای یان مامی یان خاڵی بە ئاسایی دائەنێن، ئەگەر بەتەنیا بن لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا، لە حاڵەتێکدا کە ئەمە زۆر ترسناکترە لە کەسێکی بێگانە، چونکە بێگانە بە ئاسانی ناتوانێت بێتە ئەوماڵەو بەتەنیا لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا بمێنێتەوە.

پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾ ڕێنمایمان ئەکات بۆ ئەو شتانەی کە خێری بۆ ئێمە تێدایە، ئەمەش لەبەر سۆزو خۆشەویستیەتی بۆ ئومەتەکەی، بۆ ئەوەی ئاگاداربن لە ڕوانینی نابەجێ بۆ ئافرەتان، چونکە مەترسی دارە لەسەر ئارەزووی مرۆڤو لە خشتە بردنی. پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێت: ( **إن الدنیا حلوة خضرة، وإن الله مستخلفکم فیها فینظر کیف تعملون، فاتقوا الدنیا واتقوا النساء، فإن أول فتنة بني إسرائیل کانت في النساء** ). (مسلم، ٢٧٤٢ ). واتە: (بە ڕاستی دونیا خۆشیو شیرینیەکی سەوزو جوانە، خودای گەورەش ئێوەی کردووە بە جێنشینی خۆیو تەماشا ئەکات تا بزانێ چی ئەکەن، خۆتان لە دونیاو لە

ئافرەت بپارێزن‌و پارێزکاربن، چونکە یەکەم بەڵاو فیتنەیەك بەلای بەنو ئیسرائیلەوە ئافرەتان بوون).

**هێرشی پازدەهەم: لە کاتی زیادەڕەویدا:**

دەرچوون لە ئاستی مام ناوەندی‌و واز هێنان لە ڕاست ڕەوی، هەنگاوی شەیتانەو ڕێگەی ئیبلیسە، هەندێك لە پێشینانی ئەم دینە ووتویانە: کاتێك خودای گەورە فەرمان بە شتێك ئەکات، شەیتان بەدوو شێوە هانی مرۆڤەکان ئەدات، یان لە ڕێگە دەرچوون‌و کەم کردنەوەی فرمانەکەی خودا، یان هانی ئەدات بۆ سنور بەزاندن‌و زیادە ڕەوی، هەر کامیانی بۆ بکرێت بەلایەوە باشە.

بە ڕاستی گوریسی شەیتان لە نێوان ئەم دوڵەدا چنراوە، هەندێك نەتەوەو میللەت زیادە ڕەویان کردووەو پێغەمبەرەکانی خۆیان پەرستوە، هەندێکی تریان لە ڕێ دەرچوون، تاگەیشتونەتە حاڵەتێك پێغەمبەرەکانیان کوشتووە، هەروەها ئەو کەسانەشیان کوشتووە، کە لەناو خەڵکیدا فەرمانیان بە یەکسانی کردووە، هەندێکی تریان زیادە ڕەوی ئەکەن لەمەسەلەی شێخ‌و پیاو چاکاندا، هەندێکی تریان ڕقیان لێیانەو دژایەتیان ئەکەن.

لە فەرموودەیەکدا کە (ئەنەس) ئەیگێڕێتەوەو ئەفەرمووێت:(سێ پیاو هاتن بۆ لای خانووی خێزانەکانی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾و پرسیاریان لەبارەی خودا پەرستی‌و عیبادەتی پێغەمبەرەوە کرد، کاتێ وەڵامیان درایەوە، خودا پەرستی خۆیان بەکەم زانی‌و ووتیان: ئێمە لە کوێ‌و پێغەمبەری خودا لە کوێ؟! خودا لە گوناهی پێش‌و دوایشی خۆشبووە !!.

یەکێکیان ووتی: من لەمەو دوا بەشەو هەر نوێژ ئەکەم، یەکێکی تریان ووتی: من بە بەردەوامی بەڕۆژوو ئەبم، یەکێکی تریان ووتی: منیش لە ئافرەت دوورئەکەومەوەو ژن ناهێنم، پێغەمبەر هات بۆ لایان‌و فەرمووی: ( **أنتم الذين قلتم كذاوكذا** )؟! **أماوالله إني لأخشاكم الله و أتقاكم له لكني أصوم وأفطر وأصلي وأرقد، وأتزوج النساء، فمن رغب عن سنتي فليس مني** ) . (البخاري: ٥٠٦٣ ومسلم:١٤٠١) .

واتە: (ئایا ئێوە بوون کە ئەوەو ئەوەتان‌وتووە؟! سوێند بەخودا من لە هەمووتان زیاتر لە خودا ئەترسم‌و خۆم ئەپارێزم، بەڵام بەڕۆژوش ئەبم‌و خواردن ئەخۆم‌و بەڕۆژوش نابم، ژنیش ئەهێنم، هەرکەسیش لەسوننەتی من لابدات لە ئومەتی من نیە).

هەروەها (عبداللەی کوری مەسعود) (خودای لێ ڕازیبێت) ئەفەرمووێت : پێغەمبەر سێ جار فەرمووی: ( **هلك المتنطعون** ) . (مسلم:٢٦٧٠) .

واتە: (لەناو چن ئەو کەسانەی کە ڕۆنەچنو زۆر توندن لە شتێکدا کە پێویستی بە زیادەڕەوی نیە).

(ئەبو هورەیرە) (خودای لێ ڕازیبێت) لە پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ( **إن الدين يسرٌ ولن يشاد الدين إلا غلبه، فسددوا وقاربوا وأبشروا، وأستعينوا بالغدوة والروحة وشيء من الدلجة** ). (رواه البخاري) . واتە:(بە ڕاستی دین ئاسانە، هەرکەسیش زۆر زیادە ڕەوی تێدابکات، ئەوا تێئەکەوێتو دین بەسەریدا زاڵ ئەبێت، ڕاستو دروست بنو لە یەکتری نزیك ببنەوەو موژدە دەربن، گوێ ڕایەڵی خودابن بە کرداری چاك لەکاتی چووستو چالاکیدا، لە کاتێکدا دڵتان خاڵیەو چێژوەرئەگرنو بێزار نابنو بە مەبەستی خۆتان ئەگەن، وەکو ئەو کاروانەی لەو کاتەدا ئەکەوێتە ڕێ، ئەو کاتانەش ڕۆیشتنی سەرەتای ڕۆژە، یان کۆتایی شەو بەبێ ماندبوون ئەگەنە جێ ی مەبەست).

سەیر ئەکەین هەندێك خەڵك کەمتەرخەمن لە پێویستیەکانی پاكو خاوێنیو هەندێکی تریان زیادەڕەوی ئەکەن لە دوو دڵیو وەسوەسەدا بۆ پاكو خاوێنی.

هەندێك کەس بەدەست هێنانی زانستیان کردۆتە ئامانجی خۆیانو وازیان لە کردار هێناوە، یاخوود هەندێك وازیان لە فەرزەکان هێناوەو کۆمەڵێکیش وازیان لە کردارەکانی دڵ هێناوە ، وەکو ترس لە خوداو دڵ ڕاچەڵەکین لە بەر ترسی خوداو هاوشێوەکانی ئەم کارانە، بەمەش شەیتان بەسەریاندا زاڵ ئەبێتو وائەزانن ئەم کردارانە زیادە.

شەیتان بەسەر هەندێکی ترشیاندا زاڵ بووە، بەهۆی ئەوەی کرداری لاشەیان پشت گوێ ئەخەن، چونکە پێویستە لەسەر مرۆڤ هەموو ڕۆژێك بەگوێرەی ماسولکەکانی لاشەی چاکە بکات ، هەروەها هەندێك ئەڵێن: کە عاریفەکان ئەو کارەیان لەسەر نیە .. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ ٱلشَّيْطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ ﴿٢٥﴾ ﴾ محمد. واتە:(شەیتان خراپەکانی بۆ جوانو ڕازاوە کردبوونو بەهیواو ئاوات فریوی دابوون).. هەروەها خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت:﴿ وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيْطَٰنُ لَهُۥ قَرِينًا فَسَآءَ قَرِينًا ﴿٣٨﴾ ﴾ النساء. واتە:(هەر کەس شەیتان هاوڕێی بێت، ئەوە هاوڕێیەکی زۆر خراپی هەیە) .

هەروەها ئەفەرموویت: ﴿ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾ الزخرف. واتە:(بێگومان ئەو شەیتانانە، ڕێگەی ڕاستیان لێ ئەگرنو وایان لێ ئەکەن کەوابزانن بە دڵنیاییەوە لە سەر ڕێبازێکی چاكو ڕاستن).

**هێرشی شازدەهەم: هیوا درێژی (بە هیوا بوون):**

ئەمەش ئەو چەکە زۆر بەهێزو پتەوەیە، کە شەیتان بەکاری ئەهێنێ، خودای گەورە ئەفەرموویت: ﴿ يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢٠﴾ ﴾النساء. واتە: (شەیتان بەڵێنیان ئەداتێو ئاواتو ئارەزووەکانیان بۆ ئەڕازێنێتەوە، دیارە کە شەیتانیش هیچ بەڵێنێکیان پێ نادات جگە لە فریودانو خەڵەتاندن نەبێت).

بەهیوابوون مرۆڤ تەمبەڵ ئەکات لە کارداو ئەبێتە هۆی دواکەوتوویی و کەمتەرخەمی، پاشان خۆخەریك کردن دێت، پاشان هیوای مانەوە لە زەویداو لادان دێت بۆ لای ئارەزووەکان، ئەمەش شتێکە بەچاو بینراوەو پێویست بە ڕوون کردنەوە ناکات، چونکە ئاشکراو دیارە.

بە لایەکی تردا کەم هیوایی وات لێ ئەکات کاری زیاتر بکەیت، هانت ئەدات لەسەر دەست پێشخەری و بەرەو ئەومت ئەبات کە پێشبڕکێی زیاتر بکەیت.

ئەگێڕنەوە (ئەبو دەرداء) هەستاو چووە سەر پلیکانەکانی مینبەری مزگەوتەکەی دیمەشقو ووتی: ئەی خەڵکی دیمەشق، ئامۆژگارییەك لە برای خۆتان ببیستن، بە ڕاستی کەسانی پێش ئێوە زۆریان کۆکردەوەو بیناو خانووبەرەی تۆکمەیان دروستکردو بۆ دوریان ئەڕوانی، بەڵام کۆکردنەوەکەیان بێ کەڵك بوو، بیناکانیان بوون بە گۆڕو هیواکانیان بوون بە لە خۆبایی بوون، ئا ئەمە قەومی عادە، وڵاتیان پڕ کردبوو لە مرۆڤو ماڵو سامانو سواری، کێ ئێستا میراتی قەومی هود، بە دوو درهەم ئەکڕێت؟!

**هێرشی حەڤدەهەم: واز هێنان لە ناو هێنانی خودا لەکاتی خواردنو خواردنەوەدا :**

خوێنەری بەڕێز، شەیتان ئەو خواردنە بەدەست ئەهێنێت کە ناوی خودای لەسەر ئەهێنرێ، هەر کەسیش لەسەرەتادا ناوی خودای بیرچوو، با بڵێت: (**بسم الله أوله و أخره**).

(**ئومەیەی کوڕی مەخشی**) ئەفەرموویت: پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبوو، پیاوێکیش نانی ئەخوارد، بەڵام ناوی خودای نەهێنا، هەتاوەکو یەك پارو لە خواردنەکە مایەوە، کاتێك

بەرزی کردەوە بۆ دەمی ووتی: (**بسم الله أوله و أخره**) پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پێکەنیو پاشان فەرمووی: شەیتان بەردەوام لەگەڵیدا ئەیخوارد، بەڵام کاتێك ناوی خودای برد، ئەوەی لەسکی شەیتاندا بوو هاتە دەرەوەو هەڵی هێنایەوە) (رواه أبو داود والنسائي).

هەروەها (جابیر) (خودای لێ ڕازیبێت) لە پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی (ئەگەر یەکێکتان پارووی لە دەست کەوتە خوارێ، با هەڵی بگرێو پاشان ئەوەی پێوەی بوو لێی بکاتەوەو بیخواتو وازی لێ نەهێنێ بۆ شەیتان، دەستیشی بە دەستە سڕەکەی نەسڕێتەوە هەتاوەکو ئەیلێسێتەوە، چونکە نازانێ بەرەکەتی خواردنەکە لە کوێدایە).

**هێرشی هەژدەهەم: لە کاتی خواردنو خواردنەوە بە دەستی چەپ:**

(جابیر) لە پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: (**لا تأكلوا بالشمال، فإن الشيطان يأكل و يشرب بشماله**) .(رواه مسلم: ٢٠١٩). واتە:(بە دەستی چەپ خواردن مەخۆن، بە ڕاستی شەیتان بەدەستی چەپ ئەخواتو ئەخواتەوە).

**هێرشی نۆزدەهەم: لە کاتی پەلە کردندا:**

پەلە کردن بەزۆری ئەبێتە هۆی تاوان کردنو سەرپێچی کردن .....

(**سەهلی کوڕی سەعدی ساعدی**) ئەفەرمووێت: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: (لەسەر خۆیی لە خوداوەیە، پەلە کردنیش لە شەیتانەوەیە). (رواه الترمذي، حديث صحيح).

**هێرشی بیستەم: لە کاتی تەنیایی لە سەفەردا:**

(**عەمری کوڕی شوعەیب**) لە باوکییەوەو ئەویش لە باپیریەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: (**الراكب شيطان، والركبان شيطانان، والثلاثة ركب**). (رواه أبو داود). واتە: (یەك سواری شەیتانێکە، ئەگەر دوو سواری بن دوو شەیتانن، بەڵام سیان سواری تەواون).

ئەمە بەمانای ئەوە دێت، کە شەیتان تەماحی لەیەك کەسدایە کە بەتەنیا بێت، ، وەکو چۆن دزو جەردەش تەماحیان لێ ئەکەن، ئەگەر دوانیش بن لەوانەیە توشی ئەو تەماحە ببن، بەڵام ئەگەر سیان بن ئەوەیان لەسەر نیەو خوداش باشتر ئەزانێت .

**هەروەها پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرمووێت: (إن الشيطان، مع الواحد، وهو من الأثنين أبعد).** (رواه أحمد ،حديث صحيح). **واتە:(شەیتان لەگەڵ یەك کەسدا نزیکە، بەڵام لە دووان دوورترە).**

**هێرشی بیستو یەکەم: لە کاتی گۆرانیو ئاوازدا:**

**خودای گەورە ئەفەرمووێت:** ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿٦﴾ ﴾ لقمان. **واتە:(هەندێك لە خەڵکی هەن قسەی بێ خێرو بێ مانا ئەکڕن).. (وەك گۆرانیە ناپوختەکان، کتێبو کاسێتە بێ خێرەکان ...... هتد) .. بۆ ئەوەی خۆیو کەسانی تریش لە ڕێبازی خوداوێڵ بکات، بەبێ ئەوەی هەست بە مەترسی کارەکەی بکاتو بزانێت چ کەتنێك بە خۆیو خەڵکی ئەکات، هەر لەبەر ئەوە ئەو شتە بێ نرخو بێ خێرانە ئەکڕێت تا گاڵتە بە پەیامو ڕێبازی خودا بکات، ئا ئەوانە سزاو تۆ ڵەیەکی ڕیسواکەرو ئابڕووبەر چاوەڕێیانە .**

**★ (قورتوبی) ئەفەرمووێت: (ئەم ئایەتە یەکێکە لەو ئایەتانەی کە بەڵگەن بۆ قەدەغەکردنی گۆرانیو خراپە) .**

**هەروەها ئایەتی دووەمیش کە ئەفەرمووێت:** ﴿ وَأَنتُمۡ سَٰمِدُونَ ﴿٦١﴾ ﴾ النجم. **واتە:(ئێوە سەرگەرمو بێ ئاگان) .**

**★ (إبن عباس) ئەفەرمووێت:(ئەوە گۆرانیە، بە زمانی حەمیری).**

**ئایەتی سێیەمیش کە ئەفەرمووێت:** ﴿ وَٱسۡتَفۡزِزۡ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتَ مِنۡهُم بِصَوۡتِكَ ﴿٦٤﴾ ﴾ الإسراء. **واتە:(ئەگەر ئەتوانیت هەر کەس لەوان گومڕابکە بەدەنگت).**

**★ ( مجاهيد ) ئەفەرمووێت: مەبەست لە گۆرانیو زوڕنایە.**

**لێرەدا ئەبێت ئاماژە بەوە بدەین کە مەبەست لەو گۆرانیانەیە کە هانی گەنجو لاوو خەڵکی ئەدات بۆ ئارەزوو بازیو تێکەڵی نێوان کچانو کوڕان، وە ئەشپرسین ئایا زۆربەی گۆرانیەکان بۆ ئەم مەبەستە نیە؟! بەتایبەت لە ڕۆژانی ئەمڕۆدا کە زۆربەی گۆرانیەکان پیشان ئەدرێن شان بەشانی ئافرەتانی ڕووتو قووت.**

**یاخود پرسیارێك لەو کەسانە ئەکەین کە گوێ لە گۆرانی ئەگرنو پێیان ئەڵێین: ئایا هیچ کاتێك گوێت لە گۆرانی بێژێك بووە لە گۆرانیەکانیدا ئامۆژگاری گەنجانو لاوان بکات**

بۆ ئەنجام دانی نوێژەکانیان، یاخود بۆ ئەنجامدانی کاری خێرو بەخشینیماڵو هاندانی خەڵکی بۆ ڕۆژووگرتن، بێگومان نەخێر).

**هێرشی بیستو دووهەم: لە کاتی بەچپە قسەکردندا:**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ إِنَّمَا ٱلنَّجْوَىٰ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ۝١٠ ﴾ المجادلة. واتە:(بێگومان چپەی خراپو نابەجێ لە شەیتانەوەیە).

★ (ابن عمر) دەفەرمووێت:پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی:(**إذا كانوا ثلاثة، فلا يتناجى إثنان دون ثلاث**) . واتە: (ئەگەر سێ کەس بوون، با دوانتان چپە چپ نەکەن بەبێ کەسی سێیەم) .. مەبەست ئەوەیە نابێت دوانیان بەچپە قسە بکەنو کەسی سێیەم پشت گوێ بخەن .

بە (ابن عمر) یان ووت ئەگەر چوار کەس بوون؟ووتی ئەوە قەیناکەو زیانی نیە .

هەروەها (ابن مەسعود) ئەفەرموێت: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: (**إذاكنتم ثلاثة، فلا يتنا جى إثنان دون الأخر حتى تختلطوا بالناس، من أجل أن ذلك يحزنه**). (رواه البخاري: ٦٢٩٠ و مسلم: ٢١٨٤) . واتە: (ئەگەر سێ کەس بوون، دوانتان چپە چپ مەکەن، بە بێ ئەوی تریان، هەتا ئەو کاتەی کە تێکەڵی خەڵك ئەبن، لەبەر ئەوەی کەسی سێیەم دڵتەنگو نارەحەت دەبێت).

**هێرشی بیستو سێهەم: لە کاتی دەرکردنو بەرزکردنەوەی چەكو شتی زیان بەخش بەرامبەر مسوڵمانان:**

(ئەبو هورەیرە) لە پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:(**لا يشر أحدكم إلى أخيه بالسلاح، فإنه لا يدرى لعل الشيطان ينزع في يده، فيقع في حفرة من النار**). (رواه البخاري: ٧٠٧٢ و مسلم: ٢٦١٧). واتە:(هیچ کەسێك بە چەکەکەی ئاماژە بۆ براکەی نەکات، بە ڕاستی ئەو نازانێت کە لەوانەیە شەیتان لە دەستی بسەنێت یاخود، بیچەقێنێ، ئەمەش ببێتە هۆی چوونە ناو ئاگر (دۆزەخ) .

لە فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێت: (**من أشاره إلى أخيه بحديدة، فإن الملائكة تلعنه حتى ينزع، وإن كان أخاه لأبيه وأمه**) . (رواه مسلم). واتە:(هەرکەسێك ئاسنێك

هەڵبگرێت بەرامبەر براکەی، فریشتەکان نەفرەتی لێئەکەن، هەتا ئەو کاتەی دایئەنێ، ئەگەر براشی بێتو لە دایكو باوکی بێت ) .

**هێرشی بیستو چوارەم: لە کاتی ووتنی ووشەی ئەگەر:**

( **ئەبو هورەیرە**) لە پێغەمبەرەوە﴿ﷺ﴾ ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (باوەڕداری بەهێز باشترو خۆشەویست ترە لە لای خودا لە باوەڕداری بێهێز لە هەموو چاکەیەکدا، سوربە لەسەر ئەو شتەی کە سودی تێدایە بۆ خودا پەرستی، پشتیش بە خودا ببەستەو لاواز مەبە، ئەگەر توشی شتێك بوویت، مەڵێ: ئەگەروام نەکردایە، ئاواو ئاوام بەسەر نە ئەهات، بەڵکو بڵێ: خودا بڕیاری لەسەردا بوو، ئەوەش خودا بیەوێت، ئەنجامی ئەدات، بەڕاستی ووشەی (ئەگەر) کاری شەیتان ئەکاتەوە) . (مسلم: ٢٦٦٤).

**هێرشی بیستو پێنجەم: لە بازاڕدا:**

( **سەلمانی فارسی**) (خودای لێ ڕازیبێت) فەرموویەتی: (ئەگەر توانیت یەکەم کەس مەبە کە ئەچیتە بازاڕەوەو دوا کەسیش مەبە کە لێی دەرئەچیت، بە ڕاستی بازاڕ جێی جەنگی شەیتانەو لەوێشدا شەیتان ئاڵای هەڵکردووە). (رواه مسلم: ٢٤٥١) .

هەروەها پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەفەرمووێت: ( **لا تكن أول من يدخل السوق، ولا آخر من يخرج منها، فيها باض الشيطان وفرخ** ). واتە:(یەکەم کەس مەبە کە ئەچیتە بازاڕەوەو دواکەسیش مەبە کەلێی دێیتە دەرەوە، چونکە شەیتان لەوێدا هێلکەی کردووەو هەر لەوێشدا کردوویەتی بە جوجەڵە) .

**هێرشی بیستو شەشەم: لە کاتی دوعا کردن لە مسوڵمانان:**

( **ئەبو هورەیرە** ) (خودای لێ ڕازیبێت) ئەگێڕێتەوە کە پیاوێك هێنرا بۆ لای پێغەمبەر، چونکە عارەقی خواردبوو، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: لێی بدەن، ( **ئەبو هورەیرە**) ئەفەرمووێت: هەمان بوو بەدەستی لێی ئەدا، هەمان بوو بەنەعلەکانی لێی ئەدا، هەمان بوو بە جلو بەرگەکەی لێی ئەدا، کاتێك ڕۆیشت، هەندێك پێیان ووت: خودا سوکت بکات، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی:وای پێ مەڵێن، چونکە لەوانەیە وابزانێ شایستەی ئەوەیەو شەیتانیش ئەو هەلە بقۆزێتەوەو وەسوەسە بخاتە دڵیەوە). (رواه البخاري: ٦٧٨١).

**هێرشی بیستو حەوتەم: لە کاتی لە بیر چوونی یادی خودادا:**

خودای گەورە ئەفەرموویت: ﴿ ٱسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ ٱلشَّيْطَٰنُ فَأَنسَىٰهُمْ ذِكْرَ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱلشَّيْطَٰنِ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ المجادلة. واته:(شەیتان زاڵ بووە بەسەر ئەو کەسانەداو داگیری کردوونو بەو هۆیەوە یادی خودای لە بیر بردوون، ئا ئەوانە دەستەو تاقمو حزبی شەیتانن، بێگومان تاقمو دەستەو حزبی شەیتان لە خەسارە مەندو زەرەر مەندانن).

هەروەها لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموویت:﴿ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ ﴾ الزخرف. واته:(کە سێك خۆی کوێر بکات لە ئاستی قورئانو یادی خودای میهرەبان، ئەوا ئێمەش شەیتانێك ئەکەینە ملۆزم بۆیو هەمیشە ئەبێتە یارو یاوەریو لە گەڵیدا ئەبێت) .

( **ئەبو موسای ئەشعەری** ) لە پێغەمبەرەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ( **مثل الذي يذكر ربه والذي لا يذكره، مثل الحي والميت** ). (رواه البخاري: ٦٤٠٧ و مسلم: ٧٧٩ ) .

واته:(نموونەی ئەو کەسەی یادی پەروەردگار ئەکات لەگەڵ ئەو کەسەی یادی پەروەردگار ناکات، وەکو نموونەی مردوو زیندوو وان) .

**هێرشی بیستو هەشتەم: لەکاتی حەسودی بردندا:**

( **ئەبو هورەیرە**) لە پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ( **العين الحق، ويحضر بها الشيطان وحسد ابن ادم** ). (رواه أحمد) . واته:(چاو پیسی ڕاستەو هەیەو شەیتان بەو هۆیەوە ئامادە ئەبێتو هەروەها حەسودی بردنی نەوەکانی ئادەمیش لە نێوان یەکدا هەیەو ڕاستە).

ئیرەییو حەسودیش بریتییە لە خۆزگە خواستن بە نەمانی نیعمەتی کەسێك، جا ئەو نیعمەتە نیعمەتی دین بێت یان دونیا، خودای گەورەش ئەفەرموویت:﴿ أَمْ يَحْسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ﴾ النساء. واته:(یان حەسودیو ئیرەیی بەخەڵك ئەبەن، لەسەر ئەوەی کە خودای گەورە پێی بەخشیون لە فەزڵو بەهرەی خۆی) .

هەروەها ( **ئەبو هورەیرە**) (خودای لێ ڕازیبێت) ئەفەرموویت: کە پێغەمبەر فەرموویەتی: ( **إياكم والحسد، فإن الحسد يأكل الحسنات كما تأكل النار الحطب**). (ابو داود: ٤٩٠٣) .

واتە:(دەخیلتان بم حەسوودیو ئیرەیی مەبەن، بە ڕاستی حەسودی چاکە لەناو ئەبات، وەکو چۆن ئاگر دارو چیلکە لەناو ئەبات) .. ئیرەییو حەسودی بردن کارێکی خراپە، خاوەنەکەشی خەفەتبارو دڵ پڕ پەژارە ئەکاتو چاکەکان لە ناو ئەبات .

( **عبداللەی کوڕی مەسعود** ) ئەفەرمووێت:(دژایەتی نیعمەتی خودا مەکەن، پێیان ووت: کێ دژایەتی نیعمەتی خودا ئەکات؟ فەرمووی ئەوانەی حەسودی بە کەسانێك ئەبەن کە خودا لە فەزڵو بەهرەی خۆی پێی بەخشیون، مرۆڤی حەسود دوژمنی نیعمەتەکانی خودای گەورەیەو بە بڕیارو دابەش کردنی خودا ڕازی نیە).

ئەی ئەو کەسەی کە بەردەوام حەسوودیو ئیرەیی ئەبەیت، ئایا ئەزانی بەرامبەر بە کێ بێ ئەدەبی ئەکەیت؟! بێ گومان بەرامبەر خودای گەورە، پەنا بەخودا!!

هەروەها ووتراوە حەسوودی یەکەم تاوان بوە کە سەرپێچی خودای پێکراوە لە ئاسمان (حەسوودی شەیتان بە ئادەم)، هەروەها یەکەم تاوانیش بووە کە سەرپێچی خودای پێکراوە لەسەر زەوی (حەسودی قابیل بە هابیلی برای) .

(ئەبو دەرداء) (خودای لێ ڕازیبێت) ئەفەرمووێت: هەر کەس یادی مردن زۆر بکات، کەم دڵخۆش ئەبێتو حەسوودی کەم ئەبێتەوە .

ئەی نەوەی ئادەم حەسوودی بە براکەت مەبە، ئەگەر ئەو کەسە خودا لە بەر ڕێزداری پێی بەخشی بێت، دەی تۆ حەسوودی بە کەسێك مەبە کە خودا ڕێزی گرتبێت، ئەگەر لەبەر ئەمەش نەبێت حەسوودی بە کەسێك مەبە کە سەر ئەنجامی بۆ ئاگربێت؟!

**هێرشی بیستو نۆهەم: لە کاتی سەرپێچی کردندا:**

**خوێنەری بەڕێز:** خودای گەورە ئاگاداری کردووینەتەوە لە سەر پێچی کردنو پێی ڕاگەیاندوین، کە شەیتان بەڵێنی داوەو هەڕەشەی کردووە کە نەوەکانی ئادەم گومڕا بکات .

خودای گەورەش ئەفەرمووێت: ﴿ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٣٩﴾ ﴾ الحجر. واتە:(ئیبلیس ووتی: پەروەردگارم، مادام بەهۆی ئەم ئینسانەوە منت سەر لیشێواو کرد، شەرت بێت لە زەویدا هەموو گوناهو لادانو تاوانێکیان لەلا جوانو شیرین بکەمو هەموویان سەرلێشێواوو سەرگەردان بکەم) .

ئەگەر خەڵکی گوێ ڕایەڵی شەیتانیان کردوو سەرپێچی خودایان کردوو تاوانیان ئەنجام دا، ئەوا سزای خودای گەورە بۆ خۆیان مسۆگەر ئەکەن، پەنا بە خودا، خودای گەورە ئەفەرموویت:﴿ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ﴾ واتە:(کە ڕقیان هەڵساندین).

پاشان ئەفەرموویت: ﴿ ٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ ﴾الزخرف. واتە:(تۆڵەمان لێ سەندنەوە). هەروەها ئەفەرموویت: ﴿ فَلَمَّا عَتَوۡاْ عَن مَّا نُهُواْ عَنۡهُ قُلۡنَا لَهُمۡ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴿١٦٦﴾ ﴾ الاعراف.

واتە:(کاتێك سەرپێچیو سەرکەشییان کرد لەوەی کە قەدەغەکرا بوو لێیان ئێمەش پێمان ووتن: ببن بە کۆمەڵە مە یمونێکی سوكو ڕیسواو دوور لە ڕەحمەتی خودا) .

هەروەها خودای گەورە ئەفەرموویت: ﴿ مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا يُجۡزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدۡ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٢٣﴾ ﴾النساء . واتە:(ئەوەی خراپەو گوناهێك بکات، ئەوە بەو هۆیەوە سزا ئەدرێتو هیچ کەسو هیچ هێزێکی تری دەست ناکەوێت جگە لە خودا کە پشتگیری بکاتو یارمەتی بدات) .

پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ لە فەرموودەیەکی صەحیحدا ئەفەرموویت: **(إن الله فرض فرائض فلا تضيعوها، وحدّ حدوداً فلا تعتدوها، وحرم أشياء فلا تنتهكوها، وسكت عن اشياء رحمة لكم غير نسيان فلا تبحثوا عنها )** .واتە:(خودای گەورە کۆمەڵێك فەرزی لەسەر فەرز کردوون، لە دەستی مەدەنو مەی فەوتێنن، هەروەها کۆمەڵێك سنوری بۆ دیاری کردون مەیان بەزێننو مەیان شکێنن، وە هەندێك شتی لێ حەرام کردون، سوکایەتیان پێ مەکەن، هەروەها لە هەندێك شت بێدەنگ بووە، وەکو بەزەییەك بۆ ئێوە، نەكوەکو بیرچوونەوە، واتە:( **لە بیری نەچۆتەوە**) ئێوەش لێی مەدوێنو باسیان مەکەن) .

* ( **بیلالی کوڕی سەعد** ) ئەفەرموویت: مەڕوانە بۆ بچوکی تاوانەکەت، بەڵکو بڕوانە بۆ گەورەیی ئەو خودایەی کە سەرپێچیت کردووە .

* ( **محمدی کوڕی کەعب**) ئەفەرموویت: خۆشەویسترین خودا پەرستی بەلای پەروەردگارەوە واز هێنانە لە تاوان .

خودای گەورە ئەفەرموویت: ﴿ إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ إِنَٰثًا وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَٰنًا مَّرِيدًا ﴿١١٧﴾ لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿١١٨﴾ وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلَءَامُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلْأَنْعَٰمِ وَلَءَامُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيْطَٰنَ وَلِيًّا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا ﴿١١٩﴾ يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ ۖ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ وَلَا يَجِدُونَ عَنْهَا مَحِيصًا ﴿١٢١﴾ ﴾ النساء.

**واتە:(ئەو هاوەڵ گەرانە، ئەوەی هاناو هاواری بۆ ئەبەنو ئەیپەرستن جگە لە خودا، چەند پەرستراوێکی کارتێکراون (پەرستراو ئەبێت کارتێکەر بێت نەك کارتێکراو بۆیە بتەکانیان بە مێینە ناو ناوە، وەك لاتو عوززا) تەنها هاناو هاواریشیان هەر بۆ شەیتانی سەرکەشو یاخییە، کە لە هەموو خێرێك داماڵراوە ٭ ئەو شەیتانەی کە خودا نەفرینی لێ کردووەو ووتوویەتی سوێند بێت بە تۆ ئەی خودا بەشێکی دیاری کراو لە بەندەکانت دائەبڕم لە ئیمانو خوداناسی ٭ سوێند بێت بە تۆ گومڕایان ئەکەمو بە ئاواتو خەیاڵی پوچەوە سەرگەرمیان ئەکەمو خۆم فەرمانیان پێ ئەدەمو هانیان ئەدەم ئەوجا ئەوانیش بێ گومان گوێی ئاژەڵەکانیان ئەبڕن، هەروەها فەرمانیان پێ ئەدەم ئەوانیش دروست کراوانی خودا دەست کاری بکەنو بیگۆڕن، ئەوەی لە جیاتی خودا شەیتان بکاتە پشتیوانی خۆی، ئەوە بە ڕاستی دوچاری زیانو خەسارەت مەندیەکی ئاشکرا بووە ٭ شەیتان بەڵێنیان ئەداتیو ئاواتو ئارەزوو ئە ڕازێنێتەوە بۆیان، کە شەیتانیش هیچ بەڵێنێکیان پێ نادات جگە لە فریو دانو خەڵەتاندن ئەبێت ٭ ئا ئەوانە جێگەو سەرەنجامیان دۆزەخەو کە لێنی لێ دەرچوونیان لێ دەست ناکەوێت).**

**بەڕاستی سەرپێچیو تاوان شوێنەواری خراپ بەجێ ئەهێڵێ، ئەم شوێنەوارانەش پڕ زیانن بۆ ژیریو جەستەی مرۆڤ هەروەها بۆ دونیاو دوا ڕۆژیش، لەو زیانانەش:**

**١ـ بێ بەش بوون لە زانستو زانیاری، بەڕاستی زانست ڕووناکیەو خودا ئەیخاتە دڵەوە، تاوانیش ئەو ڕووناکیە ئەسڕێتەوە .**

**٢ـ بێ بەش بوون لە ڕزقو ڕۆزی، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەفەرموویت: (إن العبد ليحرم الرزق بالذنب يصيبه ). (رواه احمد) واتە: (بە ڕاستی مرۆڤ بێ بەش ئەکرێت لە ڕزقو ڕۆزی بە**

هۆی تاوانێکەوە کە تووشی بووە). خۆ پارێزیو تەقواش ڕزق زۆر ئەکات، واز هێنانیش لە تەقواو خۆپارێزی ئەبێتە هۆی هەژاری.

٣ـ خەمباری، ئەمیش مرۆڤی گوناهکار هەستی پێ ئەکات لە دڵیداو لە نێوان خۆیو خودادا، بە جۆرێك دەروونی تاریك دادێ، گیانیشی بێزار ئەبێت، ئەگەر بێتوواز لە تاوانو گوناهەکانی بێنێت ئەوا بە خۆشی ژیان بە سەر ئەبات .

٤ـ بێزاری لە نێوان خۆیو خەڵکیدا، وا هەست ئەکات کەلێنێك لە نێوان خۆیو خەڵکی چاکەکاردا هەیەو بێ بەش ئەبێت لە بەرەکەتی سودوەرگرتنی پیاو چاکان، لەوانەشە لە کۆمەڵی شەیتان نزیك بێتەوە، بە پێی دوور کەوتنەوەی لە کۆمەڵی خودا، ئەم بێزارییەوای لێدێتو بەهێز ئەبێت هەتا کەلێن ئەکەوێتە نێوان خۆیو خێزانەکەیو منداڵەکانیەوە، هەندێ جار لە خۆشی بێزار ئەبێت، پەنا بەخودا لەم بێزاریە .

هەندێك لە پیاو چاکانی پێشوو ووتوویانە، کاتێك سەرپێچی خودا ئەکەین، شوێنەواری سەرپێچیەکە لەوڵاخەکەماندا یان لە خێزانەکانماندا ئەبینین .

٥ ـ کاری لە سەر قورسو گران ئەبێت، بە جۆرێك بۆ هەر شتێك بچێت بەسەریدا دائەخرێتو لەسەری قورس ئەبێت .

٦ـ هەست کردن بەبوونی تاریکیەك لە دڵداوەکو چۆن هەست بەتاریکی شەو ئەکەیت، ئەم تاریکیەو تارمایی تاوانە لە دڵداوەکو تارمایی سەر چاووایە، چونکە بە ڕاستی گوێ ڕایەڵی خودای گەورە ڕووناکیەو سەرپێچی کردنیشی تاریکیە .هەر چەندە ئەم تاریکیە زیاد بکات، ئەوا شپرزەیی زیاد ئەبێت، هەتاوەکو سەرگەردان ئەبێت .

★ ( **عبداللەی کوڕی عباس**) (خودا لێیان ڕازی بێت) ئەفەرمووێت: بە ڕاستی چاکەکردن ڕۆشناییە لە ڕوخسارداو ڕووناکیە لە دڵدا، فراوانیە لە ڕزقو ڕۆزیدا، گڕوتینە لە جەستەدا، خۆشویستنە لە دڵی خەڵکی دا، بەڵام خراپە کردن ڕەشاییە لە ڕووخسارداو تاریکیە لە دڵداو سستییە لە لاشەدا، کەمو کوڕیە لە ڕزقو ڕۆزیدا، ڕقو کینەیە لە دڵی خەڵکیدا .

٧ـ بێ بەش بوون لە گوێ ڕایەڵی خودا: ئەگەر تاوان هیچ سزایەکی نەبێت جگە لەوەی کە ڕێگریت ئەکات لە گوێ ڕایەڵی خودای تاكو بێ هاوتا، ئەوە بەسە بۆ بەدبەخت بونت .

٨ ــ هەروەها تاوان تەمەن کورت ئەکاتەوەو بەرەکەتی ئەسڕێتەوە، هەروەکو چۆن چاکە تەمەن زیاد ئەکاتو پڕ بەرەکەتی ئەکات، ئەمەش هیچ گومانو دوودڵییەکی تێدا نیە .

ئەگەر مرۆڤ پشت لە خودا بکاتو سەرقاڵ بێت بە سەر پێچی خوداوە، ئەوا ڕۆژگاری لە دەست ئەچێتو ئاکامەکەشی لە ڕۆژی دوایدا هەست پێدەکات، خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي قَدَّمۡتُ لِحَيَاتِي ۝٢٤ ﴾ الفجر . واتە:(ئەڵێت خۆزگە لە دنیادا کاری چاکەم پێش بخستایە بۆ ئەم ژیانە) .

٩ــ هەندێك لە تاوانەکان هەندێکی تریان زیاد ئەکەن، تا ئەو کاتەی واز هێنان لێیان قورسو زەحمەت ئەبێتو ئەبێت بە بەشێك لە جەستەیو سیفەتی بەردەوامی وەرئەگرێتو ئەگەر وازی لێبێنیت ئەوە زۆر شپرزە ئەبێت، تەنانەت هەندێك لەو کەسانەی ڕاهاتوون لە سەر گوناهو تاوان بەبێ هیچ چێژوەرگرتنێك ئەم کارە ئەکەن، تەنها لەبەر ئەوەیە کە ناتوانێ دەستی لێ هەڵگرێت، چونکە تاوانەکان بەسەریدا زاڵ بوون .

١٠ــ ترسناکترین کاریگەری لەسەر مرۆڤ ئەوەیە کە دڵی بێ هێز ئەبێت بەرامبەر تەوبەکردن، هەروەها حەز کردن بە تاوان لە ناخیدا زیاد ئەکاتو بەهێز ئەبێت، ئەم توانای تەوبە کردنە هێواش هێواشو سات بە سات لە دڵی دا کەم ئەکات، تا ئەو کاتەی بەرەو ئەمان ئەچێت، جا ئەگەر نیوەی لاشەشی بمرێت ناگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگاری، بەڵکو تەنها تەوبەو پەشیمانی سەر زارەکیو درۆزنانە دەرئەبڕێت، بەڵام دڵو دەروونی بەتاوانەوە گرێ دراوە، ئامادەشە تاوانەکان ئەنجام بدات ئەگەر توانای هەبێت، ئەمەش لە گەورەترینو نزیك ترین ئەخۆشییەکانە بۆ تیاچوونی مرۆڤ .

تاوانیش نهێنیو ئاشکرای هەیە، کردارەکانی دڵ شاراوەنو دڵیش سەرپێچی خۆی هەیە، وەکو خۆ بەگەورە زانینو حەسودیو مەراییو دووڕووی، کردارەکانی لەشی مرۆڤیش بریتین لە کردارو تاوانە ئاشکراکان، وەکو کوشتنو دزیو زیناو خواردنی مەیو ستەمو سنور بەزاندن .

خوێنەری ئازیز: ئەوە بزانە کە کۆچکەر ئەو کەسەیە کە لە تاوان هەڵبێتو خۆی بپارێزێت لە ئەنجام دانی گوناهی ئاشکراو نهێنیو پەنا بۆلای خودا بەرێت، خودای گەورەش هیدایەتی شوێن کەوتوانی ئەدات بۆ شوێن کەوتنی پێغەمبەری ئازیزو پاشان ڕەزامەندی خودا بە دەست ئەهێنێت، پشت بەخودا .

**هێرشی سیهەم: لەکاتی ڕوو بەڕووبونەوە لە جەنگدا :**

خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْاْ مِنكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُواْ وَلَقَدْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٥٥﴾ ﴾ آل عمران . واته: ( بێگومان ئەوانەی پشتیان هەڵکرد لە ( **غەزای ئوحد**) دا لە ڕۆژی بەیەك گەیشتنی هەردوو سوپاکە ( **سوپای ئیمانداران و سوپای بێباوەڕان** ) ئەوانە تەنها شەیتان تووشی هەڵەی کردن و لە خشتەی بردن، بەهۆی هەندێك گوناهەوە کە ئەنجامیان دابوو، بە ڕاستی خودا لێیان خۆشبووەوخودا ئارامگرو خۆڕاگرە ( **زوو تۆڵە لە یاخی بوان ناسێنێت** ) .

بۆ چوونی زانایانوایە کە پشت هەڵکردن لە کاتی ڕووبەڕووبونەوەدا، بە ڕاکردن لە کوشتاری بێباوەڕان کارێکی حەرامە، شیاو نیە بۆ مسوڵمانێك کە لە ڕیزی جەنگاوەراندا بێت و پاشان ڕابکات و هەڵبێت، ئەمەش بە پێی ئەم ئایەتە پیرۆزە کە ئەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلْأَدْبَارَ ﴿١٥﴾ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٦﴾ ﴾ الانفال. واته:(ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، کاتێك ڕووبەڕووی بێباوەڕان بوونەوە، ئەوا پشت هەڵمەکەن و ڕامەکەن ★ هەر کەس لەو ڕۆژەدا ڕابکات بەرەو دواوەو پشت هەڵبکات، ئەوە بە ڕاستی لەگەڵ خەشم و قینی خودادا گەڕاوەتەوەوسەر ئەنجامیش جێگەو ڕێگەی دۆزەخە کە ناخۆشترین جێگەو سەرئەنجامە، تەنها ئەگەر مەبەستی لەو پشتهەڵکردنە، هونەری جەنگ بێت، یاخود مەبەستی شوێن و جێگە گۆڕین بێت بۆ لای دەستەیەکی تر) .

لەم ئایەتە پیرۆزەدا خودای گەورە ڕاکردنی قەدەغە کردووەو پێویستە مسوڵمانان لەکاتی جەنگداوەکو دیوارێکی پۆڵاین بەرامبەر دوژمنان بوەستن .

**هێرشی سی و یەك: لە کاتی پەنا بردن بۆ دادگەری غەیری خودا :**

خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓاْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن

يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾ ﴾ النساء. واتە:(ئایا ئەو دووڕوانە نابینی کە لافی ئەوە لێئەدەن‌و بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە گوایە بە ڕاستی باوەڕیان بەوە هێناوە کە بۆ تۆ ڕەوانە کراوەو بەوانەش کە بۆ پێغەمبەرانی پیش تۆ ڕەوانە کراوە، کە چی ئەیانەوێت ڕووبکەنە زۆردارو جادووگەرو خودانەناسان، بۆ ئەوەی دادوەریان لە نێواندا بکەن‌و چارەسەری کێشەکانیان بکەن، لە کاتێکدا بە ڕاستی فەرمانیان پێکراوە کە باوەڕیان بە (طاغوت) نەبێت، شەیتانیش ئەیەوێت گومڕایان بکات، بە گومڕاییەکی دوورو بێ سنوور).

هەروەها خودای گەورە ئەفەرموویێت:﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ المائدة. واتە:(هەر کەس حوکم بەو بڕیارانە نەکات کە خودای گەورە ناردوویەتیە خوداروە، ئا ئەوانە بێباوەڕن‌ومسوڵمان نین) .

هەروەها خودای گەورە لە دوو ئایەتی تردا دەفەرموویێت: ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾المائدة. واتە:(هەر کەس حوکم بەوە نەکات کە خودا ناردوویەتییە خوارەوە، ئەوا ئەو کەسانە ستەمکاری تەواون) .

﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾ المائدة. واتە:(هەر کەسێ حوکم بەوە نەکات کە خودای گەورە ناردوویەتییە خوارەوە، ئا ئەوانە بە تەواوی یاخین‌و لە فەرمانی خودا دەرچوون) .

**هێرشی سی‌و دووهەم: لە کاتی هەڵگەڕانەوە لە دین‌و بێ باوەڕی بە خودا:**

خودای گەورە ئەفەرموویێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى ٱلشَّيْطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ ﴿٢٥﴾ ﴾ محمد. واتە:(بە ڕاستی ئا ئەوانەی پاشگەزبوونەوەو بەرەو دوا گەڕانەوە، لە دوای ئەوەی ڕێگەی هیدایەت‌و ئیمانیان بۆ دەرکەوتبوو، شەیتان بە فێڵ‌و تەڵەکەو بەهیوای تەمەنی درێژو خۆشگوزەرانی فریوی دابوون) .

هەروەها ئەفەرموویێت: ﴿ كَمَثَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَٰنِ ٱكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ ﴾ الحشر. واتە:(وەکو شەیتان کە هانی ئادەمیزاد ئەدات‌و

لە ڕێگەی خەیاڵو وەسوەسەوە پێی ئەڵێت:وەرە کافرو بێباوەڕبە، جا کاتێك بێباوەڕ بوو پێی ئەڵێت: بە ڕاستی من لە تۆ بێبەریم‌و من لە پەروەردگاری جیهان ئەترسم) .

حوکمی هەڵگەڕانەوە بەبێ جیاوازی ئافرەت‌و پیاو ئەگرێتەوە، ئەگەر پیاوێك یان ئافرەتێك گەیشتبێتە تەمەنی بالغ بوون‌و خاوەنی ژیریش بێت، ئەوا یەکێك لەم حوکمانەی بەسەردا جێبەجێ ئەکرێت:

١ــ پێویستە یەکسەر تەوبە بکات‌و بگەڕێتەوە، ئەگەر پاشگەز بوونەوەکەی لەبەر تورڕەییەك یان لەبەر حاڵەتێکی نائاسایی بێت، ئەوا لە ڕێگەی تەوبە کردنەوە ئاگادار ئەکرێتەوە .

٢ــ ئاگادار بکرێتەوە لە سەر ئەنجامی بێباوەڕییەکەی، ئەگەر سووربێت لە سەر هەڵگەڕانەوەکەی، ئەوا ئەکوژرێت، لەسەر بێباوەڕیەکەی .

٣ــ ئەگەر سووربێت لەسەر پاشگەز بوونەوەکەی، پێویستە بکوژرێت بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ کە ئەفەرمووێت: ( **من بدل دينه فاقتلوه** ). (رواه البخاري: ٣٠١٧) .واتە:(هەر کەسێك دینەکەی گۆڕی ئەوا بیکوژن).

**هێرشی سی‌وسێیەم: لە کاتی سوێند خواردن بە غەیری خودا:**

( **سەعدی کوڕی عوبەیدە**) ئەگێڕێتەوە کە (**إبن عمر**) گوێی لە پیاوێك بوو ئەیووت: نەخێر سوێند بە کەعبە، (**إبن عمر**) ووتی: سوێند بە غەیری خودا ناخورێ، گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو﴿ﷺ﴾ ئەیفەرموو: ( **من حلف بغير الله فقد كفر أو أشرك**). (رواه أحمد والترمذي) .واتە: (هەر کەسێك بە غەیری خودا سوێند بخوات، کوفری کردووە، یان هاوەڵی بۆ خودا داناوە) .

هەروەها ( **أبو هورەیرە** ) (خودای لێ ڕازیبێت) ئەفەرمووێت: پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی: (**من قال في حلفه: واللآت والعزى، فليقل:لاإله إلا الله**) . واتە:(هەر کەس لە سوێند خواردندا بڵێ: بە (لات و عوززا)، با بڵێت: (لااله إلا الله).

هەروەها ( **موصعەبی کوڕی سەعد** ) ئەگێڕێتەوە لە باوکیەوە کەووتویەتی: باسی هەندێ شتمان ئەکردو باسەکەشمان پەیوەندی بەسەردەمی نەزانیەوە هەبوو، منیش سوێندم خوارد بە لات‌و عوززا، هاوەڵانی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ پێیان ووتم شتێکی خراپت‌ووت، بڕۆ

بۆلای پێغەمبەرو پێی بڵێ: ئێمەوائەزانین کوفرت کردبێ، منیش چووم بۆ لای و پێم‌وت، ئەویش پێی ووتم: سێ جار بڵێ: ( **لا إله إلا الله وحده لاشريك له** ) سێ جاریش پەنا بە خودا بگرە لە شەیتان، سێ جاریش تف بکە بەلای چەپداو جارێکی تر مەگەڕێرەوە سەری و دووبارەی مەکەوە . هەروەها دروست نیە سوێند بخۆی بە پێغەمبەرو بە کەعبەو بە باوک و باپیرو بە خاك ...... هتد.

**هێرشی سی و چوارەم: لە کاتی مردندا:**

ئەمەش ترسناکترین حاڵەتە، شەیتان هەوڵ ئەدات کە مسوڵمان و ئیماندار بەبێ ئیمانی گیانی دەربچێت، جارێك بەتەمای ئەکات و جارێکیش وەسوەسە ئەخاتە دڵیەوەو جارێکیش ئەیترسێنێ، بەڵام بەزەیی خودای گەورە لەم کاتەدا فریای مسوڵمان ئەکەوێت، خودای گەورە بڕوادار پایەدار ئەکات بە گوفتاری ڕێك و پێك، هەروەك چۆن ئەفەرمووێت:

﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّـٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾ ﴾ إبراهيم .واتە:(خودای گەورە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە پایەدار ئەکات لەسەر گوفتاری بەجێ و دروستیان لە ژیانی دوونیادا، هەروەها لەسەرە مەرگ و لە قیامەتیشدا، گوفتاریان ڕێك و پێك و دامەزراو ئەبێت و بەئیمانەوە ئەمرن، لەو لاشەوە هەر ئەو خودایە ستەمکاران گومڕا ئەکات و ئەوەی پەروەردگار بیەوێت، هەر ئەوەیش دێت و دەکرێت) .

لە خودا ئەپاڕێمەوە پایەدارمان بکات و یارمەتیمان بدات بۆ ئەوەی شەیتان نەتوانێت بەسەرماندا زاڵبێت - **أمین**.

هەروەها پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە فەرموودەیەکی تردا ئەفەرمووێت: ( **أحضروا موتاكم ولقونهم: لا إله إلا الله، وبشرهم بالجنة، فإن الحليم من الرجال والنساء يتحير عند ذلك المصرع وإن الشيطان أقرب مايكون من إبن أدم عند ذلك المصرع، والذي نفسي بيده لمعاينة ملك الموت، أشد من ألف ضربة بالسيف، والذي نفسي بيده لا تخرج نفس عبد من الدنيا يتألم كل عرق على حياله** ).

واتە:(لە کاتی مردنی مردووەکانتاندا ئامادەبن ووشەی (لا إله إلا الله) بدەن بە گوێیانداو مژدەی بەهەشتیان پێ بدەن، ئارام گران لە پیاوان و ئافرەتان سەرسام ئەبن

لەکاتی سەرەمەرگدا، لەو کاتەدا شەیتان لە هەموو شتێك لە نەوەکانی ئادەم نزیکترە، سوێند بەو خودایەی گیانی منی بەدەستە بینینی فریشتەی گیان کێشان بەهێز ترو کاریگەرترە لە بەرکەوتنی هەزار شمشێری تیژ، سوێند بەو خودایەی گیانی منی بە دەستە، گیانی هیچ بەندەیەك لەدونیادا دەرناچێت، هەتا هەموو دەمارەکانی لەشی ئەو مرۆڤە ئازاری پێ نەگات) .

کەواتە ئەم شەڕە بەشەوو ڕۆژێك کۆتایی پێ نایات، بەڵکو بەردەوام ئەبێت، هەتاساتی کۆتایی لە ژیانی بەندەکاندا، بەڵام جیاوازی هەیە لەیەکێکەوە بۆ یەکێکی تر، هەر کەسەو بەپێی ئیمانەکەی خۆی .

کوڕەکەی ئیمامی (**ئەحمەدی کوڕی حەنبەل**) بەم شێوەیە گیان کێشانی باوکی ئەگێڕێتەوە:

کاتێك باوکم لە سەرە مەرگدا بوو، پارچەیەك پەڕۆم پێبوو ڕیشیم پێ ئەسڕیەوە، لەو کاتەدا لە هۆش خۆی چوو، پاشان بە ئاگا هاتەوەو ئەیووت لەمەودوا نا .....

منیش ووتم: باوکە ئەمووشەیە چییە کەتۆ ئەیڵێیت؟

ئەویش ووتی: کوڕەکەم ئایا نازانی؟

ووتم: نەخێر.

ووتی: ئیبلیس دەستی بە قاچمەوە گرتبوو، ئەیووت ئەی ئەحمەد منت فەوتاندو لە دەستم دەرچوویت !

منیش ووتم: جارێ نا، هەتا ئەمرم لە دەستت ڕزگارم نابێت .

بەڵام ئەو کەسانەی باوەڕێکی پتەویان هەیە ئیبلیس ناتوانێت بەسەریاندا زاڵ بێت‌و خودای گەورەش نایەڵێت شەیتان دەسەڵاتی هەبێت بەسەریاندا .خودای گەورە خۆمان‌و دایك‌و باوك‌و منداڵ‌و خێزانمان بپارێزێ لە شەیتانی نەفرەت لێکراو ــ آمین ــ

بە کورتی: بە ڕاستی شەیتان خیانەتی کردو کڕنوشی بۆ باوکە ئادەم نەبردو دوژمنایەتی خودای گەورەشی کرد، هەروەها پڕو پاگەندەی ئەوەی کرد کە لە ئادەم باشترە، چونکە ئەو لە ئاگر دروست کراوەو باوکە ئادەمیش لە قوڕ، ئاگریش باشترە لە قوڕ بە قسەی خۆی .

بێگومان هەڵەی کردو سەرپێچی خودای کرد، خوداش لە ڕەحمەتی خۆی دووریخستەوەو لوتی شکاندو دەری کردو کردی بە یارو یاوەری دۆزەخ .

## مـــــــــــــوژدە

ڕاستە شەیتان بەهۆی وەسوەسەو ڕازاندنەوەی تاوانەوە زاڵ بووە بەسەر نەوەکانی ئادەمداو ڕاستە کەهەمووومان هەڵە ئەکەین...

بەڵام بزان کە خودای گەورە دەرگای گەڕانەوەو تەوبەکردنیواڵا کردووە بۆ نەوەکانی ئادەم (سەلامی خودای لێبێت) .

هەروەها بێ نومێدی نەکردوون لە ڕەحمو بەزەیی خۆی، بێ هیوای نەکردون لە لێخۆشبوونو لێبوردن .

هەر کەس بگەڕێتەوەو تەوبە بکات خودا لێی وەرئەگرێتو هەر کەسیش داوای لێخۆشبوون بکات، خودای گەورە لێیخۆش ئەبێت، هەروەك ئەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلُوا۟ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ ﴾ آل عمران. واتە:(ئەوانەی تاوان یان گوناهێك ئەنجام ئەدەن، یاخود ستەم لە خۆیان ئەکەن (پاشان بە خۆیاندا ئەچنەوەو سزای خودا دێتەوە یادیان) ئەوسا داوای لێخۆشبوون ئەکەن، کێ لە گوناهو تاوانەکانیان خۆش ئەبێت، جگە لە خودا؟! هەروەها ئەو کەسانە لەسەر گوناهو تاوان بەردەوام نابن، لە کاتێکدا کە زانیان ئەوە تاوانە).

هەروەها خودای گەورە ئەفەرموێت:﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا۟ لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ ﴾الزمر. واتە:(ئەی پێغەمبەر(ﷺ) پێیان بڵێ: خودا ئەفەرموێت:ئەی بەندەکانم .... ئەوانەی خۆتان گوناهبار کردووەو هەڵەتان زۆرە، نا ئومێد مەبن لە ڕەحمەتی خودا، چونکە بەڕاستی ئەگەر ئێوە تەوبەی ڕاستو ڕەوانو

دروست بکەن، خودا لە هەموو گوناهو هەڵەکانتن خۆش ئەبێت، چونکە بێگومان ئەو خودایە زۆر لێخۆشبوو لێبووردەیەو زۆر بەسۆزو میهرەبانیشە) .

لە فەرموودەیەکدا کە ئیمامی (ئەحمەد) ڕیوایەتی کردووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (**إن الشيطان قال:وعزتك يارب لا أبرح أغوي عبادك مادامت أرواحهم في أجسادهم . فقال الرب تعالى:وعزتي وجلالي لا أزال أغفرلهم ما أستغفروني**). (رواه احمد حديث صحيح) .واتە:(شەیتان ووتی: خودایە سوێند بە گەورەیت دەست هەڵناگرم لە گومڕاکردنو سەر لێشێواندنی بەندەکانت هەتا ڕوحو گیان لە لاشەیاندا بێت، خودای گەورەش فەرمووی: سوێند بە گەورەییو بەرزی خۆم بەردەوام لێیان خۆش ئەبم، هەتا بەندەکانم داوای لێخۆشبونم لێ بکەن) .

هەروەها (**ئەنەس**) (**خودای لێ ڕازیبێت**) ئەفەرمووێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خودا ﷺ ئەیفەرموو: (**قال الله تعالى:يا إبن آدم، إنك مادعوتني ورجوتني غفرت لك على ما كان منك ولا أبالي، يا إبن آدم، لو بلغت ذنوبك عنان السماء ثم استغفرتني غفرت لك ولا أبالي، يا إبن آدم إنك لو أتيتني بقراب الأرض خطايا، ثم لقيتني لا تشرك بي شيئا، لأيتك بقرابها مغفرة**). (رواه الترمذي، وقال حديث حسن) .واتە:(خودای گەورە ئەفەرمووێت:ئەی نەوەی ئادەم، ئەوەندەی تۆ داوام لێبکەیتو لێم بپاڕێیتەوە، لێت خۆش ئەبمو هەرچەندێك تاوانت هەبێت بەلاشمەوە ئاساییە، ئەی نەوەی ئادەم، ئەگەر گوناهەکانت بگاتە هەورەکانی ئاسمان، پاشان داوای لێخۆشبونم لێ بکەیت، لێت خۆش ئەبمو بەلاشمەوە ئاساییە، ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر بە قەد بارستایی زەوی بە گوناهەوەبگەڕێیتەوە بۆ لامو پاشان پێم بگەیتو هیچ هاوە ڵێکم بۆ بڕیار نەدەیت، منیش بەقەد بارستایی زەوی بە لێخۆشبونەوە دێم بۆ لات) .

بە ڕاستی مژدەیەکی زۆر زۆر خۆشەو لوت شکانێکی زۆر گەورەشە بۆ شەیتانو پێویستە سوپاسو ستایشی خودای گەورەی لەسەر بکەین کە ئەوەندە بە سۆزو میهرەبانە لەگەڵمان .

## شەیتان نا چێتە شێوەی پێغەمبەرەوە ﷺ

شەیتانەکان دەستەوەستانن، لەوەی خۆیان بکەنە شێوەی پێغەمبەر ﷺ لە خەودا .

(**ئەبو هورەیرە**) (خودای لێ ڕازیبێت) ئەفەرمووێت: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: (**من رأني في المنام فسيراني في اليقظه، أو كانما رأني في اليقظة، لا يتمثل الشيطان بی**). (رواه الترمذي وإبن الماجة، حديث صحيح) .واتە:(هەر کەس لە خەودا بمبینێ، ئەوا لە پاشەڕۆژدا لە بێداریشدا ئەمبینێ، یانوەك ئەوەوایە کە بەبێداری منی بینیبێ، شەیتان نایەتە شێوەی منەوە) .

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا ئەفەرمووێت:(هەر کەس لەخەودا من ببینێ، ئەوا بێگومان بە ڕاستی منی بینیوە، چونکە شەیتان نایەتە شێوەی منەوە) .

بە پێی ئەم فەرموودەیە، شەیتان ناتوانێت بچێتە شێوەی پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە پڕو پاگەندەی ئەوە نەکات کە پێغەمبەری خودایە، بەڵکو لەوانەیە بەناوی پێغەمبەرەوە بێتە خەوی خەڵکی، بەڵام ڕاست ناکات، چونکە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: شەیتان ناتوانێت بێتە سەر شێوەی من) .

# بـــــەشی هەشتـــەم

## چۆن ڕزگار ئەبیت لە فێڵەکانی شەیتان

براو خوشکی مسوڵمان: ئائەمە شەیتانە ....

دوژمنایەتیەکەشی هەر بەردەوام ئەبێت، هەتاوەکو خودای گەورە ئەم زەویە بهێڵێت، لەگەڵ ئەو کەسانەی لەسەری ئەژین .

شەیتان هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە نەخشە دائەڕێژێو کار ئەکات بۆ خراپ کردنی نەوەکانی ئادەم ...

بۆ ئەوەکار ئەکات کە مسوڵمان لە دین دوور بخاتەوەو تا مسوڵمانیش دوورتر بخاتەوە لە دین، بەردەوام هەوڵی بڵاو کردنەوەی بێ دینیو خراپەو بێ ئابڕووی ئەدات لە هەموو جێگایەك .

بەداخەوە کە سانێکی زۆر گومانیانوایە کە توانای ڕووبەڕوو بونەوەی شەیتانیان نیە، وە ئەگەر ئەم ڕووبە ڕووبونەوەیەش ڕوویدا، ئەوا سەرکەوتن بۆ شەیتان ئەبێت، لە بەر ئەوەی لایانوایە کە توانای شەیتان بەهێزەو دەسەڵات دارە بۆ گومڕاکردنی نەوەکانی ئادەم. بەڵام بەپشت بەستن بە خودای گەورەو پەیوەست بوون بە بەرنامەکەیەوەو ڕۆیشتن لەسەر ڕێنمایەکانی قورئانو سونەتی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ مرۆڤ ئەتوانێت خۆی ڕزگار بکات لە فێڵو تەڵەکە بازییەکانی شەیتان .

ئێستاش گرنگترین ئەو هۆکارانە باس ئەکەین کە پێویستە بیان گرینە بەر بۆ ڕزگاربوون لە فێڵو تەڵەو تۆڕی شەیتان کە ناویەتیەوە بۆ نەوەکانی ئادەم .

**١ـ باوەڕ بوون بە خودای گەورەی میهرەبان؛**

باوەڕی ڕاست بە خودای گەورە مرۆڤ ئەپارێزێت لە هەموو خراپەیەكو ڕزگاری ئەکات لە هەموو ترسو دەردەسەریەك، خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ فَمَنْ ءَامَنَ وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾الانعام. واتە:(هەر کەس بڕوای هێناو کردەوەی چاکی ئەنجامدا، ئەوە هیچ مەترسییەکیان لەسەر نابێتو غەمباریش نابن). هەروەها خودای گەورە

ئەفەرمووێت: ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَٱعْتَصَمُواْ بِهِۦ فَسَيُدْخِلُهُمْ فِي رَحْمَةٍ مِّنْهُ وَفَضْلٍ وَيَهْدِيهِمْ إِلَيْهِ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿١٧٥﴾ ﴾النساء. واتە:(ئەوانەی باوەڕیان بە خودا هێناوەو پشتیان پێ بەستوە، ئەوا بێگومان ئەیان خاتە ناو بەزەیی‌و بەهرەو چاکەی خۆیەوەو ڕێنماییان ئەکات بۆ لای خۆی، کە ڕێگەی ڕاستە). هەروەها لە بارەی ڕزگارکردنی باوەڕدار لە خراپە خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا هُودًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَنَجَّيْنَٰهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٨﴾ ﴾ هود. واتە:(کاتێ فەرمانی ئێمە هات (کە بڕیاری تیاچوونی هۆزی هود بوو) هوودو ئەوانەی بڕوایان هێنابوو لەگەڵیدا، ڕزگارمان کردن بە هۆی بەزەیی‌و لێبووردەیی خۆمانەوە لە سزایەکی زۆر قورس‌و گران) .

کەسانی ئیماندارو لە خودا ترس فێڵی شەیتان زیانیان پێ ناگەیەنێت بەهیچ شێوەیەك، چونکە گوێ ڕایەڵی خودای گەورە ئەکەن‌و شەیتان بە دوژمنی خۆیان ئەزانن، خودای گەورەش ئەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٥﴾ ﴾ یوسف. واتە:(بە ڕاستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکرای مرۆڤە) .

**٢ـ دڵسۆزی (الأخلاص) بۆ خودای گەورە:**

شەیتان دێتە ژێر دەستی مرۆڤی چاکە کارەوە بۆ ئەوەی نیەتی بگۆڕێت، کارەکانی بۆ ئە ڕازێنێتەوە بۆ ئەوەی بۆ غەیری خودا ئەنجامی بدات و لەبەر چاوی خەڵکی جوانی ئەکات، بەمەش ئەکەوێتە ڕووپامایییەوە، کە کاری مرۆڤ پوچەڵ ئەکاتەوەو توشی سزا ئەبێت‌و شەیتانیش بەسەریدا زاڵ ئەبێت‌و پاشان بەسەریدا سەر ئەکەوێت .

(**ابن جوزی**) لە کتێبی ( **تلبیس إبلیس**) دا ئەگێڕێتەوە کە دارێك لەبری خودا ئەپەرسترا، پیاوێك هات‌ووتی، ئەبێت ئەم دارە ببڕم، بە توڕەییەوە هات بۆ بڕینی دارەکە لەبەر خاتری خودا، ئیبلیس لە شێوەی مرۆڤێکدا هاتە سەر ڕێگەکەی‌و پێی‌وت چیت ئەوێت؟

ووتی: ئەمەوێت ئەم دارە ببڕم کە لەبری خودا دەپەرسترێت .

شەیتان ووتی: ئەگەر تۆ ناپەرستی، پەرستنی خەڵکی چ زیانێك بە تۆ ئەگەیەنێت؟

پیاوەکە ووتی: هەر ئەیبڕم.

شەیتان پێی ووت: ئایا شتێکت ئەوێ لەوە باشتر بێت؟ مەیبڕە، هەمو ڕۆژێك دوو دینارت لە پشتی سەرینەکەتەوە بۆ دائەنێم .

پیاوەکە ووتی: ئەوەم لە کوێ دەست ئەکەوێت؟

شەیتان ووتی: تۆ حەقت بەسەر ئەوەوە نەبێت .

پاشان گەڕایەوەو بەیانی دوو دینار لەلای سەرینەکەی دانرابوو، پیاوەکەش وازی لە بڕینی دارەکە هێنا .

بەیانی دووەم هەستاو هیچی نەبینی، تورە بوو هەستا بۆ ئەوەی بچێت بۆ بڕینی دارەکە، بەهەمان شێوەی پێشوو شەیتان هاتە سەر ڕێگەکەی‌و پێی‌ووت: چیت ئەوێت؟

ووتی: ئەمەوێت ئەو دارە ببڕم کە لەبری خودا ئەپەرستڕێت .

شەیتان ووتی: درۆ ئەکەیت‌و ناشتوانیت ئەو کارە بکەی .

پیاوەکە ڕۆی بۆ ئەوەی بیبڕێت، بەڵام ئەم شەیتانە دای بەزەویداو دەستی خستە سەر قوڕگی‌و خەریك بوو بیکوژێ، پاشان پێی‌ووت: ئەزانی من کێم؟ من شەیتانم، یەکەم جار کەهاتی لەبەر خاتری خودا توڕەبوویت، منیش هیچ دەسەڵاتێکم بەسەرتا نەبوو، بەڵام بە دوو دینار هەڵم خەڵەتاندی‌و وازت هێنا، کاتێك جاری دووەم هاتی لەبەر دوودینارەکە توورەبووی، منیش بەسەرتا زاڵ بووم .

### ٣ـ شوێن کەوتنی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾:

بەڕاستی لە گرنگترین‌و گەورەترین ئەو شتانەی کە ڕزگار ئەبی پێی لە فێڵ‌و فریودەری شەیتان، بریتیە لە شوێن کەوتنی ڕێنمایەکانی قورئان‌و فەرموودەکانی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ چونکە شەیتان سوورە لەسەر ئەوەی کە خەڵکی لەسەر ڕێگەی ڕاست لا بدات‌و دووریان بخاتەوە لە قورئان‌و سوننەت، هەر لەبەر ئەمەیە کە شتی داهێنراو (**بدعة**) لەلای شەیتان زۆر خۆشەویسترە لە سەرپێچی‌و تاوان .

(**بدعة**): بریتییە لەوەی شتێکی زیاد دابهێنرێت لە عیبادەت‌و خودا پەرستیدا، کە خوداو پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمانیان پێ نەکردبێت، یاخود زیاد کردنی ئەرکێکی دینی .

بۆیە (**سفیانی ثوري**) ئەفەرموێت: (**بدعة**) لەلای شەیتان خۆشەویسترە لە تاوان‌و سەرپێچی، چونکە تاوان‌و سەرپێچی تەوبەی لێ ئەکرێت بەڵام (**بدعة**) تەوبەی لێ ناکرێت .

(**فضيلي كوڕى عياض**) ئەفەرمووێت: هەر کەس خاوەنی (**بدعة**) یەکی خۆش بووێت، خودای گەورە کارەکانی لەناو ئەبات و ڕۆشنایی لە دڵیدا دەر ئەکات، هەرکەسیش یارمەتی خاوەن (**بدعة**) یەك بدات، ئەوا یارمەتی ڕووخاندنی ئیسلامی داوە .

**٤ ـ ئەنجام دانی خودا پەرستی بە چاکی بەتایبەت نوێژ:**

لەبەر ئەوەی نوێژ، لە گەورەترین پایەکانی ئیسلامە، شەیتانیش زۆر هەوڵی ئەوە ئەدات کە ڕێگری لە نوێژ بکات، لەبەر ئەمەشە لە قورئان و فەرمودەی پێغەمبەردا ﴿ﷺ﴾ زۆر گرنگی بە نوێژ کردن دراوە .

خودای گەورەش ئەفەرمووێت: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ﴿٢﴾ ﴾ المؤمنون . واتە: (بەڕاستی ئەو بڕوادارانە سەرکەوتوو سەر فرازبوون ٭ ئەوانەش ئەوانەن کە لە نوێژەکانیاندا مل کەچ و دڵ ئارام و دامەزراون و دڵیان لەلای خودایە) .

کاتێك (**عائیشە**) (خودای لێ ڕازیبێت) پرسیاری لە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کرد، لەبارەی ئاوڕدانەوە لە نوێژدا، پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: (**إنما هو لاختلاس يختلسه الشيطان من صلاة العبد**). (رواه البخاري). واتە: (بە ڕاستی ئەوە دزیەکە، کە شەیتان لە نوێژی بەندەکانی خودا ئەیکات) .

(**ئەبو سەعیدی خودری**) (خودای لێ ڕازیبێت) ئەفەرمووێت: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: (**إذا كان أحدكم يصلي، فلا يدعوا أحدا يمر بين يده، وليد رأه ما استطاع، فإن أبى فليقاتله، فإنما هو الشيطان**). (متفق عليه) . واتە: (ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژی ئەکرد، با نەیەڵێت کەس لە بەردەمیەوە بڕوات، چەندیش ئەتوانێت بارێگری بکات، ئەگەر یاخی بوو، با بەزۆر نەیەڵێت، بە ڕاستی ئەوە کرداری شەیتانە) .

**٥ ـ کڕنوش بردن:**

خوێنەری ئازیز بزانە مرۆڤی مسوڵمان کاتێك کە نوێژ زۆر ئەکات و کڕنوش زۆر ئەبات بۆ خودای گەورە، ئەوا گوێ ڕایەڵی بۆ خودا دەستەبەر ئەکات و ڕیسوایی و بێ هێزی و خەم و گریانیش بۆ شەیتان ئەمێنێتەوە .

(**ئەبو هورەیرە**) ئەفەرموێت: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: (**إذا قرأ ابن ادم السجدة فسجد، إعتزل الشيطان يبكى يقول: ياويله، أمر ابن ادم بالسجود فسجد فله الجنة، وأمرت**

**بالسجود فأبيت فلي النار**). (رواه مسلم). واته:(کاتێك نەوەی ئادەم سوجدەی خوێندەوەو کڕنوشی برد، شەیتان ئەچێتە لایەکەوەو دەست ئەکات بەگریانو ئەڵێت: هاوار بۆ من، فەرمان کرا بە نەوەی ئادەم بە کڕنوش بردن، کڕنوشی بردو بەهەشت بۆ ئەوە، بەڵام من فەرمانم پێ کرا بە کڕنوش بردن، یاخی بوومو کڕنوشم نەبردو ئاگر بۆمنە) .

هەروەها لە کڕنوشی هەڵەدا (**سجدة السهو**) شەیتان تووشی زەلیلی ئەبێت چونکە شەیتان سورە لەسەر تێك دانو خراپ کردنی نوێژی بەندەکانی خودا، کڕنوشی لێتێکچونیش ئەبێتە هۆی تەواوکاری بۆ کەمو کوڕیەکانی نوێژ ، شەیتان زۆر بەم کڕنوشە دڵتەنگ ئەبێت .

پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموویت: (**إذا شك أحدكم في صلاته فلم يدر كم صلى؟ ثلاث أم أربعا؟ فليطرح الشك وليبن على ما إستقين، ثم يسجد سجدتين قبل ان يسلم، فإن كان صلى خمسا، شفعن له صلاته، وإن كان صلى إتماما لأربع، كانتا ترغيما للشيطان**). (رواه مسلم) .

واته:(ئەگەر یەکێکتان لە نوێژەکەیدا گومانی بۆ دروست بوو، نەیزانی، ئایا سێ ڕکاتی کردووە یان چوار، با گومانەکە فڕێ بداتو وازی لێ بهێنێتو لای کەمی هەڵبژێرێو بچێتە سەر دڵنیایىو پاشان ڕکاتەکەی تری تەواو بکاتو دوایی پێش سەلام دانەوە دوو کڕنوش بەرێت، ئەگەر پێنج ڕکاتیشی کردبێت، ئەو زیادەیە ئەبێتە هۆی شەفاعەتو داوای لێخۆشبونی بۆ ئەکات، ئەگەر چوارەکەشی کردبوو ئەوا ملی شەیتانی کەچ کردووە) .

**٦ـ پارێزگاری لە نوێژەکان، بە تایبەت نوێژی بەیانی:**

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئاگادارمان ئەکاتەوەو ئەفەرموێت: شەیتان دێت بۆ لای کەسێك لە کاتی خەوداوای لێ ئەکات لەسەر خەوەکەی بەردەوام بێتو بێدار نەبێتەوە، هەروەها سێ گرێ لەسەر سەری ئەدات، کاتێك ئەو کەسە بیەوێت هەڵسێ بۆ نوێژ، شەیتان ڕێگری لێ ئەکات، بۆ ئەوەی پاداشتی شەو نوێژی دەست نەکەوێت .

هەروەها کاتێك گرێکان لەسەری مرۆڤ ئەدات، لەگەڵ هەر گرێیەکدا پێی ئەڵێت، شەوێکی درێژت لەپێشە، بخەوە، ئەگەر هەڵساو یادی خودای کرد، ئەوا گرێیەك لە گرێکان ئەکرێتەوە، ئەگەر دەست نوێژی گرت، گرێیەکی تریش دەکرێتەوە، ئەگەر نوێژی کرد، ئەوا گرێی سێیەمیش ئەکرێتەوەو کاتێك بەیانی ئەکاتەوە چالاکەو دڵو دەرونیشی خۆشە، وە

ئەگەر نا کاتێك بەیانی ئەکاتەوە تەمەڵەو دڵو دەرونیشی پیسو ناڕەحەتو ناخۆشە .
(البخاري: ١١٤٢ ومسلم ٧٧٦).

**٧ـ هانا بردن بۆ خودای گەورەو پەنا گرتن پێی لە شەیتان:**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ إِذْ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ ٱلشَّيْطَٰنِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلْأَقْدَامَ ﴿١١﴾ ﴾ الانفال.
واتە:(ئەو مژدەو ئارامی دڵە کاتێك بوو کە خودای گەروە بەوەنەوزو خەوە نوچکە دایگرتن، بۆ ئەوەی هێمنیەك بێت بۆتان لە لایەن خۆیەوەو، ئاوێکیشی لە ئاسمانەوە بەسەرتانا باراند، بۆ ئەوەی خاوێنو پاکتان بکاتەوەو پیسو پۆخڵی شەیتانتان لێ دوور بخاتەوە) .

خودای گەورە خۆی بەندەکانی ڕزگار ئەکات لەوەسوەسەو فێڵی شەیتان، پێویستە بەندەکانیش بەپەلە بگەڕێنەوە بۆلای خوداو داوای یارمەتیو سەرکەوتنو پشتیوانی لێ بکەن، بۆ ئەوەی بتوانن خۆڕاگر بن بەرامبەر ئەم دوژمنە پیسو چەپەڵە .

خودای گەورە زۆر فەرمانی بەوە کردووە کە هانای بۆ ببرێتو پەنای پێ بگیرێت لە شەیتان، هەروەك ئەفەرموێت: ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٠٠﴾ ﴾ الاعراف. واتە:(ئەگەر لە لایەن شەیتانەوە وەسوەسەیەکت بۆ پێش هاتو و یستی لە خشتەت بەرێتو تووشی هەڵەو تاوانت بکات، ئەوا تۆ پەنا بەخودا بگرەو پشتی پێ ببەستە، چونکە بە ڕاستی ئەو خودایە بیسەرو زانایە) .

٭ (قورتوبی) ئەفەرموێت: خودای گەورە فەرمان بە بەندەکانی ئەکات کە بەر لەوەسوەسە بگرن، بە پەنا گرتن بە خوداو هانا بردن بۆی .

لە هەندێك لە پێشینەکانی ئەم دینەوە ئەگێڕنەوە کە مامۆستایەك بە قوتابیەك ئەڵێت:
ئەگەر شەیتان ویستی هەڵەیەکت پێ بکات چی دەکەیت؟
ووتی: تێ ئەکۆشمو هەوڵ ئەدەم هەڵە نەکەم .
مامۆستاکە ووتی: ئەگەر هاتەوە؟
ووتی: جارێکی تر تێ ئەکۆشمو هەوڵ ئەدەم .
مامۆستاکە ووتی: ئەگەر هەر هاتەوە؟

قوتابیەکە ووتی: هەر تێ ئەکۆشم لە بەرامبەریدا .

مامۆستاکە ووتی: ئەمە درێژە ئەکێشێ.

ئایا ئەگەر بەلای ڕانە مەڕێکدا ڕۆیشتیو سەگی ڕانەکە پێتوەڕیو نەیهێشت بڕۆی چی دەکەیت؟

ووتی: خۆ ڕاگر ئەبمو بە هێزی خۆم ئەیگێڕمەوە.

مامۆستاکە ووتی: ئەمە درێژە ئەکێشێ، بەڵام ئەگەر داوای یارمەتی لە خاوەنەکەی بکەیت، ئەوا بەسە بۆ ئەوەی لێتی دووربخاتەوە .

پاشان دێینە سەر ئەو کاتو شوێنانەی پێویستە پەنای بەخودا تیا بگیرێ، بێگومان پێغەمبەریش﴿ﷺ﴾ بۆی ڕوون کردوینەتەوە لەوانەش:

أ- لە نوێژدا: (عوسمانی کوڕی عاص) هات بۆلای پێغەمبەرو پێیووت: ئەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ شەیتان دێتە نێوان منو نوێژەکەمەوەو قورئان خوێندنەکەم لێ تێك ئەدات، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ئەوە شەیتانێکە ناوی (خنزب)ە، هەر کاتێك هەستت پێ کرد، پەنا بە خودا بگرە لێیو سێ جار تف بکە بەلای چەپدا، ئەڵێت: منیش ئەوەم کردو خودای گەورە لەسەری لابردم . (رواه مسلم).

ب - لە کاتی قورئان خوێندندا: خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ ﴾ النحل. واتە:(ئەگەرویستت قورئان بخوێنی، پەنا بە خودا بگرە لەوەی کە شەیتان ڕێگریت بکاتو نەیەڵێت بە تێگەیشتنەوە بیخوێنیو کاری پێبکەیت) .

ج - لەکاتی چوونە سەر ئاودا: (ئەنەس) (خودای لێ ڕازیبێت) ئەفەرمووێت: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کاتێك ئەچووە سەر ئاو ئەیفەرموو:( أللهم إني أعوذبك من الخبث و الخبائث ). (متفق علیه). واتە:(خودایە پەنا بە تۆ ئەگرم لە شەیتانی نێرو مێ) .

د - لە کاتی تووڕەبووندا: تووڕەبوون بە شێکە لە شێتی، پشکۆیەکە لە دڵدا دا ئەگیرسێت، ئەگەر تووڕەبونەکە لەبەر خودا نەبێت .

پێغەمبەر فەرمانمان پێ ئەکات لە کاتی تووڕەبووندا بڵێین: ﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾. هەروەها دەست نوێژو دانیشتن تووڕەیی کەم ئەکەنەوە .

هـ ـ لە کاتی ئێواران‌و بەیانیاندا: (**ئەبو بەکر**) (خودای لێ ڕازیبێت) بە پێغەمبەری ﴿ﷺ﴾ فەرموو: ئەی پێغەمبەری خودا فێرم بکە لە بەیانیان‌و ئێواراندا چی بڵێم، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی بڵێ: (**أللهم فاطر السموات والأرض، عالم الغيب والشهادة، لا أله إلا أنت رب كل شيء ومليكه، أعوذبك من شر نفسي، ومن شر الشيطان وشركه، وأن اقترف على نفسي سوءاً أو أجره إلى مسلم**) .

(**عبداللەی کوڕی خوبەیب**) ئەفەرمووێت: لە شەوێکی زۆر تاریک‌و باراناویدا، داوام لە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ کرد نوێژمان بۆ بکات، گەیشتمە پێغەمبەرو پێی فەرمووم (**بڵێ**) بەڵام هیچم نەووت، فەرمووی (**بڵێ**) بەڵام هیچم نەووت، فەرمووی بڵێ، منیش‌ووتم: چی بڵێم؟ فەرمووی: (**قل هو الله أحد**) بڵێ، لەگەڵ هەردوو سورەتی (**معوذتين**) واتە: سورەتی (**الفلق**و **الناس**) بەیانیان‌و ئێواران سێ جار بیان خوێنە، بەستە بۆ هەموو شتێك). (رواه الترمذي) .

(**عوثمانی کوڕی عەفان**)، فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بوو ئەیفەرموو، هەر کەس ئێواران سێ جار بڵێ: (**بسم الله الذي لا يضر مع إسمه شيء في الأرض ولا في السماء وهو السميع العليم**). (رواه أبو داود والترمذي وابن الماجة). هیچ بەڵایەکی تووش نابێت هەتا بەیانی، ئەگەر لە بەیانیشدا سێ جاروابڵێ، هیچ بەڵایەکی لە ناکاوی توش نابێت هەتا ئێوارە .

و ـ لەکاتی چوونە ماڵەوەدا: (**خەولەی کچی حکیم**) ئەڵێت: گوێم لێ بوو، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەیفەرموو، هەر کەس چووە ماڵێکەوەو بڵێت: (**أعوذ بكلمات الله التامات من شر ما خلق**). (مسلم: ٢٧٠٨). هیچ زیانێکی پێ ناگات هەتا لەو ماڵە دەرئەچێت .

ز ـ لە کاتی بیستنی دەنگی گوێ درێژو وەڕینی سەگدا: (**ئەبو هورەیرە**) ئەفەرمووێت: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: (**إذا سمعتم صياح الديكة، فسألوا الله من فضله، فإنها رأت ملكا، وإذا سمعتم نهيق الحمار، فتعوذوا بالله من الشيطان، فإنها رأت شيطاناً**).بە واتای:(هەر کاتێك گوێتان لە دەنگی کەڵەشێر بوو، ئەوا داوای خێرو بەرەکەت لە خودا بکەن، چونکە ئەوە فریشتەی بینیوە، هەر کاتێکیش گوێتان لە زەڕینی گوێ درێژ بوو، ئەوا پەنا بەخودا بگرن لە خراپەو شەڕی شەیتان، چونکە ئەوە چاوی بە شەیتان کەوتوە) .. پەنا گرتن بە خودا لەکاتی بیستنی دەنگی گوێ درێژووەربڕینی سەگدا، فەرمانی پێکراوە لە لایەن پێغەمبەرەوە﴿ﷺ﴾ .

ح ـ له کاتی پەیدا بوونی دوو دڵیوگومان له بیرو باوەڕدا: له فەرمودەیەکی صەحیحدا پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾ ئەفەرمووێت: ( **لا یزال الناس یتساءلون حتی یقال: هذا خلق الله، فمن خلق الله؟ فمن وجد من ذلك شیئا فلیقل: أمنت بالله ورسوله** ). (متفق علیه). واته:(بەردەوام خەڵکی پرسیار ئەکەن، هەتاوەکو ئەڵێن: ئەمە دروستکراوی خودایە، ئەی باشه کێ خودای دروست کردووه، هەرکەس ئەمەی بەدی کرد با بڵێت: باوەڕم به خوداو پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ هێناوه) .

ط ـ له کاتی خەوتندا: (**عائشه**) (خودای لێ ڕازیبێت) ئەفەرمووێت: پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾ کاتێك، بچوایەته سەر جێگەی خەوتن، فوی ئەکرد به دەستیداو سورەتی (**الفلق والناس**) ی دەخوێندو پاشان ئەیهێنا بەسەر جەستەی خۆیدا). (متفق علیه).

له گێڕانەوەیەکی تردا هاتووه، هەموو شەوێك کاتێك پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەچووه سەر جێگەکەی بۆ خەوتن، دەستی کۆ ئەکردەوەو پاشان فووی پێدا ئەکردو سورەتی ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾ و سورەتی ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴾ و سورەتی ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴾ ی ئەخوێندوو پاشان ئەیهێنا بەسەر جەستەیداو لەسەریەوه دەستی پێ ئەکردو پاشان ڕوخساریو چەندێك بیتوانیایەو دەستی بگەیشتایەته هەر شوێنێکی لاشەیو سێ جاریش دووبارەی ئەکردەوه.

ی ـ له کاتی بینینی خەوی خراپدا: له فەرموودەیەکدا که ئیمامی بوخاریو موسلیم گێڕاویانەتەوه پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾ ئەفەرمووێت:(خەوی باش له خوداوەیەو خەوی خراپ له شەیتانەوەیە، ئەگەر یەکێك خەوێکی ناخۆشی بینی، با سێ جار بەلای چەپدا تف بکاتو پەنا به خودا بگرێت له خراپەی ئەو خەوه، ئیتر ئەو خەوه زیانی پێ ناگەیەنێت) .

***تێبینی**:(زۆربەی فەرموودەکان دەقه عەرەبیەکەی له پێشەوه نوسراوەو به پێویستمان نەزانی دووبارەی بکەینەوه ).

**٨ ـ یادی خودای گەورە:**

به ڕاستی یادی خودا له گەورەترین ئەو چەکانەیه که بەندەی مسوڵمان، خۆی پێ ئەپارێزێت له شەیتان، خودای گەورەش ئەفەرمووێت: ﴿ فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ ﴾البقرة . واته:

( ئەی ئیمانداران ئەگەر یادی من بکەن، منیش یادتان ئەکەم).

خوێنەری ئازیز: ئەو کەسە چەندە بەختەوەرە کە خودای گەورە یادی بکاتو لە بیری نەکاتو سەری بخاتو پاڵ پشتی بێتو ئاگاداریو چاودێری بکاتو لە گەڵی بێت، بێگومان خودای بەسە بۆ ئەوەی دڵی تەنگ نەبێتو لە خراپە دوور بێت .

یادکردنی خودا لە هەموو کاتێکدا پێویستو زەرووره، وەکو کاتی چوونە سەر ئاوو هاتنە دەرەوە لێی، هەروەها لە کاتی جلو بەرگ لە بەرکردن داو لە کاتی سەرکەوتن بۆولاخو بۆ ناو سەیارەو چوونە ژوورەوەو هاتنە دەرەوە لە ماڵو ..... هتد .

زۆربەی نەخۆشیە دەروونیەکانی وەك وەسواسەو شێتیو پەرکەمو .... هتد، هۆیەکانی بریتین لە دوورکەوتنەوە لە یادی خوداو بێ ئاگایی لەم چەکە بەهێزە .

**٩ـ تەقواو ترسان لە خودای پەروەردگار:**

ترسان لە خودای پەروەردگار، لە گەورەترین ئەو هۆکارانەیە کە شەڕی شەیتانی پێ دوور ئەخرێتەوە .

خودای گەورە بۆمان ڕوون ئەکاتەوە کە ڕزگاربوونی ئێمە، لە خودا ترساندنماندایە، خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ١٢٠ ﴾ آل عمران. واتە:(ئەگەر خۆگرو پارێزکاربن، پیلانو تەڵەکەی ئەوان، هیچ زیانێکتان پێ ناگەیەنێت). هەروەها ئەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ١٢٨ ﴾النحل . واتە:(بە ڕاستی خودا لەگەڵ ئەو کەسانەدایە کە خۆیان پاراستووە لە گوناهو هەروەها ئەوانەش کە چاکەکارو چاکە خوازن).

هەرکەسیش خودای لەگەڵ بێت، جنۆکەو مرۆڤ ناتوانن خراپەی پێ بگەیەنن، تەنها شتێك نەبێت کە خودا لەسەری نووسیبێت .

(عبداللەی کوڕی عباس) ئەفەرمووێت:(ڕۆژێك لە دوای پێغەمبەرەوە بووم، پێی فەرمووم: (یاغلام إني أعلمك كلمات، إحفظ الله يحفظك، إحفظ الله تجهده تجاهك، وإذا سألت فسأل الله، وإذا استعنت فاستعن بالله، واعلم: أن الأمة لو اجتمعت على أن ينفعوك بشيء، لم ينفعوك إلا بشيء قد كتبه الله لك، وإن اجتمعوا على أن يضروك بشيء لم يضروك إلا بشيء قد كتب الله عليك، رفعت الأقلام، وجفت الصحف). (الترمذي، ٢٥١٨) . واتە:(ڕۆڵە

چەندووشەیەکت فێر ئەکەم، حەقی خودا بپارێزە، خوداش تۆ ئەپارێزێت، حەقی خودا بپارێزە، خوداش ئاگای لێت ئەبێت، ئەگەر داوات کرد، داوا لە خودا بکە، ئەگەر داوی یارمەتیو پشتیوانیت کرد، تەنها داوا لە خودا بکە، باش بزانە، ئەگەر هەموو خەڵکی کۆببنەوە بۆ ئەوەی سودێکت پێ بگەیەنن، ناتوانن، تەنها ئەوە نەبێت کە خودا لەچارەی نوسیوی، ئەگەر هەموو خەڵکی کۆببنەوە بۆ ئەوەی زیانێکت پێ بگەیەنن، ناتوانن، تەنها ئەو زیانە نەبێت کە خودا لە چارەی نوسیوی، قەڵەم هەڵگیراو بەرزکرایەوەو نوسراوەکەش وشك بۆوەو پێچرایەوە (مانای ئەوەیە، ئەوەی نوسرابێ هەر ئەوەیەو شتێکی تر نیەو خوداهەموو شتێکی لە قەدەر دا دیاری کردووە) .

هەروەها خودای گەورە ئەفەرموویێت: ﴿ فَاصْبِرْ إِنَّ الْعَاقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٤٩﴾ ﴾هود. واتە: ( خۆڕاگرو بە ئارامبە بە، چونکە بەڕاستی پاشەڕۆژ بۆ خوداناسان و پارێزکارانە) .

١٠- خوێندنی قورئان:

بزانە کە قورئان خوێندن یەکێکە لە گەورەترین جۆرەکانی یادی خودا، هەروەها یەکێکە لە هۆکارەکانی پاراستنی موسڵمانان لە شەیتان، خودای گەورە ئەفەرموویێت: ﴿ وَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ حِجَابًا مَسْتُورًا ﴿٤٥﴾ وَجَعَلْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَنْ يَفْقَهُوهُ وَفِي آذَانِهِمْ وَقْرًا وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِي الْقُرْآنِ وَحْدَهُ وَلَّوْا عَلَى أَدْبَارِهِمْ نُفُورًا ﴿٤٦﴾ ﴾ الإسراء. واتە:(کاتێك کە قورئان ئەخوێنیت، ئێمە بەربەستێکی نادیارو شاراوە ئەخەینە نێوان تۆو ئەوانەی باوەڕ بە ڕۆژی دوایی ناهێنن، (چونکە مەبەستیان نیە تێبگەن) ئێمەش پەردە ئەهێنین بەسەر دڵیاندا، تا هەر تێی نەگەن، گوێشیانوا لێ ئەکەین، تا نەیبیستن، وە کاتێك لە قورئاندا تەنها ناوی پەروەردگارت ئەبەیت، ئەوا پشت هەڵئەکەنو ڕوو وەرئەگێڕنو بێزاری دەرئەبڕنو ئەڕۆن، هەروەها لەبەر ئەوەی قورئان بانگەواز بۆ باوەڕو هیدایەت ئەکات، شەیتانیش شوێن کەوتوانی خۆی دوور ئەخاتەوەو وایان لێ ئەکات پشت هەڵبکەنو گوێ نەگرن) .

هەروەها خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموویێت: ﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾ فصلت. واتە:(بێ باوەڕان ئەیانووت: گوێ بۆ ئەم قورئانە

مەگرنو بیکەن بە گاڵەو هەراو هوریا، بۆ ئەوەی ئێوە زاڵ ببنو بیبەنەوە).هەروەها ئەفەرمووێت: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ ﴾ الإسراء. واتە:(ئێمە لە قورئانەوە، ئایەتو سورەتانێك دائەبەزێنین، کەببێتە هۆی شیفاو چارەسەر بۆ نەخۆشیە دەروونیو جەستەییەکانو ڕەحمەتو میهرەبانیشە بۆ ئیمانداران، بۆ ستەمکارو خودا نەناسانیش تەنها زیاد کردنی زەرەرو زیان نە بێت، هیچی تر نیەو هیچ بەهرەو سودێکی لێ نابینن) .

هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێت: (هەر کەس دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی (البقرة) لە شەودا بخوێنێت ئەوا بەسیەتی، یاخودوەك ئەوەوایە کە شەو نوێژی کردبێت ).

**١١ـ دەست نوێژ گرتنو دانیشتن لە کاتی توڕەبووندا:**

لە بەرئەوەی شەیتان لە ئاگر دروست بووە، دەستنوێژ کاریگەری زۆری هەیە لە دوور خستنەوەی شەیتانو کوژاندنەوەی ئاگری فێڵەکانیو لابردنی ستەمی شەیتان لەسەر بەندەکان.

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێت: (**إن الغضب من الشيطان، وإن الشيطان خلق من النار، وانما تطفأ النار بالماء ، فإذا غضب أحدكم فليتوضأ**). (رواه أبو داود (ضعيف) .واتە: (بە ڕاستی تووڕەبوون لە شەیتانەوەیە، شەیتانیش لە ئاگر دروست کراوە، ئاگریش بە ئاو دا ئەمرکێتەوە، هەر یەکێك لە ئێوە تورە بوو با دەست نوێژ بگرێت) .

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا ئەفەرموێت: (**إذا غضب أحدكم وهو قائم فليجلس، فإن ذهب عنه الغضب وإلا فليضطجع**). (رواه أحمد). واتە:(ئەگەر یەکێك لە ئێوە توڕەبوو، ڕاوەستا بوو با دانیشێ، ئەگەر توڕەیەکەی لەسەر لاچوو باشە، ئەگەرنا با ڕابکشێت) .

**١٢ـ تەوبەکردنو داوای لێخۆش بوون:**

لە میهرەبانی خوداوەیە دەرگای تەوبە کردنی واڵا کردووە بۆ بەندەکانی، هەروەها بێ هیوای نەکردوون لە ڕەحمەتو بەزەیی خۆی وازی لێ نەهێناون بۆ ئەوەی ببنە نێچیری شەیتان بە هۆی تاوانو سەر پێچیەکانیەوە، خودای گەورە پەشیمانیو ئەسرینی تەوبەکارانوەرئەگرێت هەروەك ئەفەرمووێت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَعْفُوا۟ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾الشورى. واتە:(خودای گەورە ئەو زاتەیە کە پەشیمانیو

تەوبە لە بەندەکانی وەرنەگرێت و چاو پۆشیش لە هەڵەو گوناهەکانیان نەکات، ئاگاداری ئەو کردەوانەشە کە ئەنجامی ئەدەن) .

بەڵام شەیتان گومڕایی پێیە بۆ بەندەکان و ئەیەوێت هەڵیان بخەڵەتێنێ بە ئارەزووبازی، خودای گەورەش ئەفەرمووێت: ﴿ وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُوا۟ مَيْلًا عَظِيمًا ﴿٢٧﴾ ﴾النساء. واتە:(بێگومان خودا ئەیەوێت تەوبەو پەشیمانیتان لێوەربگرێت و لە هەڵەکانتان خۆش بێت، بەڵام ئەوانەی شوێن هەوەسبازیو ئارەزووەکانیان ئەکەون، ئەیانەوێت لاتان بدەن، بەلادانێکی گەورە).

بێگومان ئەم لێخۆشبوونەی خودای گەورە ئەبێتە هۆی زەلیلیو لوت شکاندنی شەیتان.

١٣ــ پاککردنەوەو پاراستنی ماڵەکان:

پێویستە لەسەر مسوڵمان کە ماڵەکەی پاك بکاتەوە لە ئامێرووێنەی خراپو پەیکەرو سەگو ..... هتد، هەروەها پاك کردنەوەی ماڵەکان لە گۆرانی، بەشێکە لەم پارێزگاری کردنە.. (**مجاهد**) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ﴿ وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ وَعِدْهُمْ ۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿٦٤﴾ ﴾ الإسراء. ئەفەرمووێت: دەنگی شەیتان، گۆرانیە لە فەرموودەیەکدا کە ئیمامی (بوخاری) گێڕاویەتیەوە پێغەمبەر ئەفەرمووێت: ( **ليكونن من أمتي أقوام يستحلون الحر والحرير والخمر والمعازف، ..... .** ) .واتە:(کەسانێك لە ئوممەتی من پەیدا ئەبن، کە زیناو ئاوریشمو مەیو مۆسیقا حەڵاڵ ئەکەن ....).

هەروەها پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرمووێت: ( **لا تصحب الملائكة رفقة فيها كلب أو جرس** ). (رواه مسلم) .واتە:(فریشتەکان هاوڕێیەتی کاروانێ ناکەن کە سەگو زەنگی تێدا بێت).

هەروەها پارێزگاری کردنی ماڵەکان بە ئەنجامدانی نوێژە سونەتەکان تیایدا، هەروەها بە قورئان خوێندن، چونکە شەیتان لەو ماڵە دوور ئەکەوێتەوە کە قورئانی تێدا بخوێنرێت.

پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: (هەموو شتێك چڵوپۆپەیەکی هەیە، چڵوپۆپەی قورئانیش سورەتی (البقرة) یە، هەر کەس شەوان لە ماڵەکەیدا بیخوێنێت، شەیتان ناچێتە

ماڵەکەیەوە بۆ ماوەی سێ شەو، هەر کەسیش بە ڕۆژ لە ماڵەکەیدا بیخوێنێتەوە شەیتان نا چێتە ماڵەکەیەوە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ ). (رواه إبن حبان).

**١٤ـ قەڵا بەندی کەس و کارو منداڵ:**

(**عبداللەی کوڕی عباس**) (خودا لێیان ڕازیبێت) ئەفەرمووێت: (**کان النبي ﴿ﷺ﴾ یعوذ الحسن والحسين ويقول: إنّ أباكما كان يعوذ بها إسماعيل وإسحاق: أعوذ بكلمات الله التامة، من كل شيطان وهامةومن كل عين لامة**) . (رواه البخاري). واتە: (پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پەنای بە خودا ئەگرت لە شەیتان بۆ حەسەن و حوسەین و دوعای بۆ ئەکردن و ئەیفەرموو: باوکە ئیبراهیمتان بەم دوعایە پەنای بە خودا ئەگرت لە شەیتان بۆ إسماعیل و إسحاقی کوڕی: (**أعوذ بكلمات الله التامةومن كل شيطان وهامة ومن كل عين لامة**).

هەروەها بۆ پاراستنی منداڵ لە شەیتان ئەوەیە کە بانگ بە گوێی منداڵی تازە لە دایک بوودا بدرێت لە ڕۆژی حەوتەمی لە دایک بوونیدا، هەروەك پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کاتێك (**فاطمة**) ی کچی حەسەنی بوو، بانگی دا بە گوێیدا .

* (**إبن القيم**) ئەفەرمووێت: (نهێنی بانگ دان بە گوێی منداڵدا ـ **والله أعلم** ـ ئەوەیە کە یەکەم شت ئەدرێ بە گوێیدا کۆمەڵە ووشەیەك بێت، هەڵگری گەورەیی و بەرزی پەروەردگاری بێت، هەروەها شەیتان کە گوێی لە بانگ ئەبێت ڕائەکات، چونکە شەیتان لە بۆسەدایە بۆ منداڵ کاتێك لە دایك ئەبێت، بۆ ئەوەی زەرەرێکی پێ بگەیەنێ) .

هەروەها بۆ ئەوەی بانگی بکرێت بۆ ڕێبازی خوداو ئیسلام و دەست پێشخەری بکرێت لە بانگەوازی شەیتان .

هەروەها پێویستە نەیەڵین منداڵ لەسەر شەقام و ڕێگاکان بمێنێتەوە، کاتێك کە شەو دادێت و دنیا تاریك ئەبێت.

**١٥ـ چاو پاراستن:**

شەیتان چاوی مرۆڤ بەکارئەهێنێت بۆ ڕوانینی ئەو شتانەی کە حەرامە، وەکو سەیرکردنی ئافرەتان، ئەمەش ئەبێتە هۆی تووش بوون بە تاوانی گەورەتر، مرۆڤی ژیر ئەو کەسەیە کە ئەم دەرگایە دابخات و چاوی بپارێزێت لە سەیرکردنی ئافرەتان لە ڕێگاو بان و بازاڕەکان، هەروەها پێویستە دوور کەوێتەوە لەو شوێنانەی کە تێکەڵی ئافرەت و

پیاوی تێدایەو هەروەها خۆی بپارێزێت لە زۆر چوونە بازاڕ، چونكە شەیتان ئاڵای خۆی لە بازاڕەكاندا هەڵكردووە .

ئەوەش بزانە كە زمانی چاو بە هێزترین زمانەو لە زارو ئاخاوتن دەوڵەمەنترو كاریگەرترە .

زمانی چاو، زمانێكی بێ دەنگەو كاریگەریەكی جادوویی هەیە لەسەر مرۆڤ .

بەڵێ چاو قسە ئەكات، بەڵام بە شێوازی جیاواز، سەیركردن هەیە بۆ سەر سوڕمانە، هەیە بۆ گاڵتە پێ كردنە، هەیە بۆ توڕەبوونەو شێوازی تر هەیە كە خەڵكی تێی ئەگەن و پێویستی بە ڕوون كردنەوە نیە .

هەروەها خۆشەویستی و ڕق لێ بوونەوە هەر لە ڕێگەی چاوەوە ئەزانرێت، هەروەها ئەزانرێت كە كام چاو بە تەمای خیانەتە، هەروەك خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ يَعْلَمُ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي ٱلصُّدُورُ ﴿١٩﴾ ﴾ غافر. واتە:(ئەو خودایە هەمیشە چاوە خیانەتكارو ناپاكەكان ئەناسێت و ئەزانێت چی لە دڵ و دەروونیاندا حەشاردراوە).

زمانی چاو بەوە جیادەكرێتەوە كە زۆر بە خێرایی لە كەسی نێرەرەوە ئەگاتە كەسی وەرگرو شوێنەواری بەهێز بە جێ ئەهێڵێت، هەروەها كاتەكەشی زۆر كەمەو تەنها چەند چركەیەك ئەخایەنێت و نیشانەكە ئەپێكێت و هەڵە ناكات، هەر بۆیە ئاینی پیرۆزی ئیسلام چەند بنەمایەكی داناوە بۆ تەماشاكردن، هەر كەسیش ئەو بنەمایانە ببەزێنێت تووشی ڕیسوایی و شەرمەزاری ئەبێت . خودای گەورە داوا لە پیاوان و ئافرەتان ئەكات و فەرمانیان پێ ئەدات كە چاویان بپارێزن لە تێڕوانینی خراپ، هەروەك ئەفەرموێت: ﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَٰرِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ﴾النور.
واتە:(ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بە پیاوانی ئیماندار بڵێ: با چاویان بپارێزن لە سەرەنجدانی ئافرەتانی نامەحرەم، هەروەها ناموس و عەورەتی خۆیان لە حەرام بپارێزن، بێگومان ئەوە پاكترو پوخت ترە بۆیان، بە ڕاستی خودا ئاگادارە بەو هەڵس و كەوت و ڕەفتارانەی كە ئەنجامی ئەدەن * بە ئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ: چاوتان بپارێزن لە تەماشاكردنی

نامەحەرەمو داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناهو تاوانو جوانی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی کەدیارە ((وەك دەستو دەمو چاو)) .

هەروەك چۆن پێویستە لەسەر پیاوان کە نە ڕوانن بۆ ئافرەتی نامەحرەم، بەهەمان شێوە پێویستە لەسەر ئافرەتان، چاویان بپارێزنو سەیری پیاوی نامەحرەم نەکەن ،بەلام ئیسلام سنوری تەماشاکردنی کتوپڕی دیاری کردووە، چونکە تەماشاکردنی کتو پڕی یەکەم بۆ تۆیەو تاوانبار نابیت، بەلام سەیرکردنی دووەم لەسەرتە، واتە تاوانبار ئەبیت پێی .

پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێت: (**یاعلي لا تتبع النظرة النظرة، فإن لك الأولى،وليست لك الأخرة**). (رواه أبو داود، حديث حسن) .واتە:(ئەی عەلی، لە دوای سەیرکردنی یەکەم، دووەم جار سەیر مەکە، چونکە یەکەم بۆ تۆیە بەلام دووەم بۆ تۆ نیە).

* (قورتوبی) ئەفەرمووێت:(چاو هەرە دەرگای گەورەیە بۆ دڵو ئاوەدان ترین ڕێگای هەستە بۆ دڵ، لەبەر ئەوە ئاگاداربوونی چاو زۆر پێویستە).

پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێت: (**إياكم والجلوس في الطرقات**) **قالوا: يا رسول الله، ما لنا من مجالسنا بدّ نتحدث فيها، قال: (فاما إذا أبيتم إلا المجلس، فاعطوا الطريق حقه) قالوا: يارسول الله، فما حق الطريق؟ قال: (غضّ البصر، وكفّ الأذى، وردّ السلام، والأمر با لمعروف و النهى عن المنكر)**. (أخرجه البخاري و المسلم) .واتە:(نەکەن لەسەر ڕێگاوبان دابنیشن) ووتیان: ئەی پێغەمبەری خودا چارەمان نیەو شوێنی دانیشتمانەو ووتوێژی تێدا ئەکەین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(ئەگەر هەر ئەتانەوێت دابنیشن لە ڕێگەکاندا ئەوا مافی ڕێگا بدەن) ووتیان: مافی ڕێگاو بان چیە؟ فەرمووی: (چاو داخستن لە ئاستی حەرام، ئازار نەدانی خەڵکی، وەلام دانەوەی سەلام، فەرمان کردن بەچاکەو ڕێگری کردن لە خراپە).

* (ئەوزاعی) ئەفەرمووێت: هارونی کوڕی ڕیئاب بۆی گێڕامەوە کە غەزوانو ئەبو موسای ئەشعەری لە یەکێك لە جەنگەکاندا بەیەکەوە بوون، کچێك دەرکەوتووەو غەزوان سەیری کردووە، پاشان دەستی بەرز ئەکاتەوەو ئەکێشێ بەچاوی خۆیدا هەتا دوور ئەکەوێتەوەو بە خۆی ئەڵێت: تۆ کارێك ئەنجام ئەدەیت، کە زەرەرت پێ ئەگەیەنێتو سودی بۆت نیە، پاشان ئەبو موسای بینیو پرسیاری لێکرد لەوبارەیەوە، ئەویش پێی ووت:

داوای پەشیمانیو لێخۆشبوون لە خودا بکە، چونکە تەنها سەیرکردنی یەکەمت بۆ هەیەو لە دوای ئەوە تاوان بار ئەبیت.. (ئەوزاعی) ئەفەرمووێت: (غەزوان) نەفسی خۆی گرتو پێنەکەنی هەتا مرد .

هەروەها لە (صەحیحی موسلیم) دا هاتووە کە (جەریری کوڕی عبدالله) ئەفەرمووێت: پرسیارم لەپێغەمبەر﴿ﷺ﴾ کرد، سەبارەت بە تەماشاکردنی لەناکاو، فەرمانی پێکردم کە رووی لێوەرگێڕم.

★ (**شەعبی**) لەلای باش نیە کە پیاو زۆر بڕوانێ بۆ کچو دایکو خوشکی خۆشی، بێگومان زەمانەکەی ئەو زۆر لەم زەمانەی ئێمە باشتر بووە، هەروەها حەرامە پیاو بەچاوی ئارەزوو بۆ مەحرەمی خۆی بڕوانێ .

هەندێ جۆری (**نقاب**) پەیدا بووە کە چاوی ئافرەتەکە بە دەرەوەیەو ئەبێتە هۆی گەورەترین فیتنەو بڵاوبوونەوەی ناشەرعیو خراپە، لەبەر ئەوەی مەجال ئەڕەخسێنێت بۆ ئەوەی ئەم ئافرەتە سەیری خەڵکی بکاتو خەڵکیش بۆی بڕوانن . ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە، ئەوەیە کە هەندێ لە خەڵکی ڕێگە نادەن ئافرەتەکانیان قسە لەگەڵ پیاوی بێگانە دا بکەن ! ئەی چۆن ڕێگە ئەدەن لە ڕێگەی چاوەوە ئەو قسە کردنە ڕووبدات؟! شاعیر ڕاستیووتوە کە ئەڵێت:

**نظرة، فابتسامة، فسلام**

**فكلام، فموعـــد، فلقاء**

واتە: سەرەتا تەنها سەیرکردنێك، پاشان زەردەخەنەیەك، پاشان سڵاو کردنێك، دواتر گفتوگۆو پاشان کات دیاری کردنو دواتریش لە کۆتایدا بەیەك گەیەشتن .

**١٦ــ بە تەنها بوون لە گەڵ ئافرەتی بێگانەدا:**

ئەگەر سەیرکردنی ئافرەتی بێگانە حەرام بێت، بێگومان مانەوە بە تەنها لەگەڵیدا زۆر خراپە، لەبەر ئەوەی شەیتانیش ئامادە ئەبێتو دێتە نێوانیانەوە، هەروەك پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ قەدەغەی کردووەو ئەفەرمووێت: (**لا يخلون رجل بامرأة إلا كان ثالثهما الشيطان**). (رواه الترمذي) .واتە:(ئەگەر ژنو پیاوێکی نامەحرەم لە جێگەیەکدا بە تەنها بوون، ئەوا بێگومان سێیەمیان شەیتانە) .

( **عوقبەی کوڕی عامر** ) ئەفەرمووێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( **إياكم والدخول على النساء** ) **فقال رجل من الأنصار: أفرأيت الحمو؟ قال: ( الحمو الموت )**. واتە:(دەخیلتان بم، بە تەنها مەچنە لای ئافرەتان).. پیاوێکی ئەنساری ووتی: ئەی ئەگەر شوبرا، یان ئامۆزا، یان خزمی نزیکی مێردەکەی بوو؟ فەرمووی:(ئەو کەسانە هەر مردنە).

لە بەر ئەوەی تێکەڵی‌و هاتووچۆ بۆ ئەو کەسانە ئاسانترو کەم گومانترە لە کەسانی تر.

هەروەها (جابیر) ئەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( **من كان يؤمن بالله واليوم الاخر، فلا يخلونّ بامرأة ليس معها ذو محرمٍ منها، فإن ثالثهما الشيطان** ). ( رواه احمد، حديث حسن ). واتە:(هەر کەس باوەڕی بە خوداو ڕۆژی دوایی هەیە با بە تەنها نەبێت لە شوێنێکدا لەگەڵ ئافرەتێکدا کە مەحرەمی خۆی لەگەڵ نەبێت، چونکە سێیەمیان شەیتانە).

* ( **عوبەیدەی ڕەحمانی کوڕی زیاد** )، ئەڵێت: کاتێك موسا دانیشتبوو، ئیبلیس هات بۆ لای، موسا پێی فەرموو: ئەو شتە چیە ئەگەر مرۆڤ بیکات بەسەریدا زاڵ نەبیت؟ ئیبلیس ووتی: ئەگەر دڵی بە خۆی خۆش بێت‌و کارەکانی بەزۆر بزانی‌و تاوانەکانی لە بیر بکات، وەسێ جاریش ئاگادارت ئەکەمەوە، لەگەڵ ئافرەتێکدا مەبە کە حەڵاڵی خۆت نەبێت، چونکە ئەگەر پیاوێك لەگەڵ ئافرەتێکی نامەحرەم بوو، ئەوا من ئەبم بە هاوڕێی، هەتا بە فەتارەتی ئەدەم‌و تووشی تاوانی ئەکەم.

**١٧ـ هاوسەرگیری:**

خوێنەری ئازیز بزانە کە هاوسەرگیری لە گرنگترین ئەو هۆکارانەیەکەوەسوەسەی شەیتان لا ئەبات‌و مرۆڤ لە ئارەزوو بازی ئەپارێزێت.

پێغەمبەریش(ﷺ) ئەفەرمووێت: ( **يا معشر الشباب من آستطاع منكم الباءة فليتزوج، فإنه أغض للبصر، وأحصن للفرج، ومن لم يستطع فعليه بالصوم، فإنه له وجاء** ). ( متفق عليه ) واتە: (ئەی کۆمەڵی گەنجان، هەر کەس لە ئێوە توانای هەیە، با ژن بهێنێت، چونکە ژن هێنان باشترین هۆکارە بۆ چاوپارێزی‌و داوێن پاکی، هەر کەسیش نەیتوانی‌و توانای نەبوو ژن بهێنێت، ئەوا با بەڕۆ ژوو بێت، چونکە ئەبێتە قەڵغان بۆی).

**١٨ـ هەڵس‌و کەوت کردن بە پێچەوانەی شەیتانەوە:**

**جوڵانەوە بە پێچەوانەی شەیتانەوە، دەرخستنی دوژمنایەتیە بۆ شەیتان، هەروەك خودای گەورە فەرمانی پێکردووەو ئەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ﴾ فاطر. واتە:(بە ڕاستی شەیتان دوژمنتانەو ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی دابنێن، بێگومان شەیتان بانگی تاقمو دارو دەستەی خۆی ئەکات بۆ ئەوەی ببنە نیشتە جێی دۆزەخ).**

**پێغەمبەری خوداش ئامۆژگاریو ڕێنمایمان ئەکات بۆ چەند کارو کردەوەیەك، کە پێچەوانەی کردارەکانی شەیتانە، لەوانەش:**

**أ ـ خواردنو خواردنەوە بە دەستی ڕاست:**

**( عبداللەی کوڕی عومەر) (ڕەزای خودایان لێ بێت). ئەفەرمووێت: پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: ( لا يأكلنّ أحدكم بشماله ولا يشربنّ بها، فإن الشيطان يأكل بشماله و يشرب بها ) .**

**واتە:(بە دەستی چەپ مەخۆنو مەخۆنەوە، چونکە شەیتان بە دەستی چەپ ئەخواتو ئەخواتەوە) .**

**ب ـ خەوتنی پێش نیوەڕۆ یان دەمەو نیوەڕۆ (القيلولة ):**

**(ئەنەس) ئەفەرمووێت: پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمویەتی: (قيلوا، فإن الشيطان لا تقيلوا ) (رواه الطبراني) . واتە: دەمەو نیوەڕۆ یان پێش نیوەڕۆ بخەون، چونکە شەیتانەکان لەو کاتەدا ناخەون).**

**ج ـ واز هێنان لە دەست بڵاوی:**

**خودای گەورە دەست بڵاوی قەدەغە کردووەو باسی دەست بڵاوان ئەکات، بەوەی کە برای شەیتانەکانن، هەروەك ئەفەرمووێت: ﴿ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓا۟ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِ ۖ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا ﴿٢٧﴾ ﴾ الإسراء. واتە:(مافی خزمو کەس بە جێ بهێنەو هەروەها مافی ڕێبوارانیش جێ بەجێ بکە، دەست بڵاویش مەبەوماڵو سامانت بە فیڕۆ مەدە * چونکە بە ڕاستی ئەوانەی ماڵو سامانیان بە فیڕۆ ئەدەنو لە ڕێگەی خراپە دا سەرفی ئەکەن، ئەوانە هەمیشەوەك برای شەیتانەکانوان، شەیتانیش لە بەرامبەر نازو نیعمەتەکانی پەروەردگاردا زۆر ناشکورو بەدنمەکە) .**

پێغەمبەریش﴿ﷺ﴾ ئاگادارمان ئەکاتەوە لە ماڵ بە فیرۆ دانو ئەفەرمووێت: (**فراش للرجل، وفراش لأمرأته، والثالث للضيف، و الرابع للشيطان**). (رواه مسلم) .واتە: (ڕاخەرێك بۆ پیاوەکەو، ڕاخەرێ بۆ خێزانەکەیو سێیەم بۆ میوانەو چوارەمیش بۆ شەیتانە) .

د ـ لە سەرخۆیی لە کاردا:

پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەفەرموویێت: (**التاني من الله، والعجلة من الشيطان**).(رواه البيهقي) .

واتە:(لە سەرخۆیی لە خوداوەیە، پەلە کردنیش لە شەیتانەوەیە) .

ه ـ ڕەتکردنەوەو ڕێگرتن لە باوێشك:

شەیتان پێی خۆشە مرۆڤ زۆر باوێشك بدات، چونکە نیشانەی تەمبەڵیو سستیە، لەبەر ئەمەشە پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾ فەرمانمان پێ ئەکات بە بەر گرتن لە باوێشكو ڕەتکردنەوەو خواردنەوەی، هەروەك لە فەرموودەیەکدا ئەفەرموویێت: (بە ڕاستی خودای گەورە پژمینی پێ خۆشە، باوێشکیشی پێ ناخۆشە، ئەگەر یەکێکتان پژمیو سوپاسی خودای کرد، پێویستە لەسەر هەموو مسوڵمانێك کە گوێی لێ بێ، بڵێ: خودا ڕەحمت پێ بکات، بەڵام باوێشك لە شەیتانەوەیە، ئەگەر یەکێکتان باوێشکیدا، بارەتی بکاتەوە، ئەوەندەی کە ئەتوانێت، چونکە کاتێك کە یەکێك باوێشك ئەدات شەیتان پێی پێ ئەکەنێت). (البخاري: ٦٢٢٣) .

ڕەت کردنەوەی باوێشکیش بە دەست خستنە سەر دەم ئەبێت، ئەگەر لە نوێژیشدا بێت، ئەوا ئەم کارە زیاتر پێویستە، بۆ ئەوەی نوێژەکەی لێ تێك نەچێت .

هەروەها یەکێك لە سیفەتەکانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەوە بووە کە هەرگیز باوێشکی نەداوە.

ی ـ دوور کەوتنەوە لەووشەی (**ئەگەر**):

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموویێت: (ئیمانداری بەهێز باشترو خۆشەویست ترە لەلای خودا لە ئیمانداری بێ هێز لە هەموو خێرو چاکەیەکدا، سووربە لەسەر ئەوەی سوودت پێ ئەگەیەنێتو پشت بە خودا ببەستەو تەمبەڵ مەبەو ئەگەر شتێکت تووش بوو مەڵێ: ئەگەر فلانە کارم بکردایە فلانە شتو فلانە شتم دەست ئەکەوت، بەڵکو بڵێ: خوداویستی لەسەر بوو، ئەوەشی پێی خۆش بێت ئەیکات، چونکەووشەی (**ئەگەر**) دەرگای شەیتان ئەکاتەوە) . (مسلم: ٢٦٦٤).

**١٩ـ پەیوەست بوون بە کۆمەڵی مسوڵمانانەوە:**

پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموویت: (**إن الشيطان ذئب الأنسان، كذئب الغنم، يأخذ الشاة القاصية والناحية، فإياكم والشعاب، وعليكم بالجماعة، والعامة والمسجد**). (رواه أحمد والطبراني).

واتە:(بە ڕاستی شەیتان گورگی مرۆڤە، هەروەکو گورگی مەڕ، ئەو مەڕە ئەبات کە دابڕابێتو پەڕاگەندە بێت، نەکەن پارچە پارچە بن، بەڵکو لەگەڵ کۆمەڵو گشتیو مزگەوت دابن).

**٢٠ـ پاڕانەوە:**

نزاو پاڕانەوە لەگەڵ پشت بەستن بە خودا، لە بەسوود ترین دەرمانەکانە بۆ تێکشکانو مل شکانی شەیتان، بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) زۆر دوعاو پاڕانەوەی هەبووە بۆ ڕزگاربوون لە شەڕی شەیتان.

پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێك ئەچووە سەر جێگە بۆ خەوتن ئەیفەرموو: (**بسم الله وضعت جنبي، اللهم أغفرلي ذنبي، وخسأ شيطاني، وفك رهاني وجعلني في الندي الأعلى**). (رواه أبو داود). واتە: (بە ناوی خودا تەنیشتم خستە سەر زەوی. خودایە لە گوناهم خۆش بی، شەیتانەکەم دەم کوت بکەی، گەردنم ئازاد بکەیو لە کۆڕی پایە بەرزانم بگێڕی).

## گفتوگۆیەك لەگەڵ شەیتان

﴿ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴾

**د.عائض القرني**

واتە: (بە ڕاستی شەیتان دوژمنی ئێوەیە دەی کەواتە ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی دابنێن، بێگومان ئەو تاقمو کۆمەڵەکەی بانگ دەکات بۆ ئەوەی ببنە هاوەڵانی ئاگری هەڵگیرساوی (دۆزەخ)) .

**هبْ الشّبيبةُ تُبدي عُذرَ صاحِبها**

**ما بالُ أشيبَ يستهوِيه شيطـــانُ**

**ئەگـــەر گە نجێتیو لاوێتی بیانویەك بێت بۆ ئە نجامدانی تـاوان**

**ئەی پیری چ بیانویەکی هەیە، جگە لە هەڵخەڵەتاندنی شەیتان**

ئەوەیەك لە ئەوەکانی ئادەم ئەڵێ: گفتوگۆم لەگەڵ شەیتانی ئەفرین کراودا کرد لە شەوێکی دەیجوردا، تا کاتێك گوێم لە بانگی بەیانی بووووویستم هەستم بۆ مزگەوت بچم.

پێیووتم: شەوێکی درێژت لە پێشەوەیە بخەوە .

ووتم: ئەترسم فەرزەکەم لە دەست بچێ .

ووتی: کاتەکان زۆر زۆرن .

ووتم: ئەترسم نوێژی جەماعەتم لە دەست بچێت .

ووتی: ئەوەندە تاعەتو عیبادەت لەسەر خۆت قورس مەکە .

هەڵنەستام تا خۆر هەڵات، بەهێواشی پێی ووتم: خەفەت لەوەی چوو مەخۆ ئەمڕۆ هەمووی کاتە بۆ تۆ .

دانیشتم بۆیادی خودا، پەڕاوی یادەوەری بۆ کردمەوە .

ووتم: خەریکت کردم نە پاڕامەوە .

ووتی:وازی لێبێنە بۆ ئێوارە .

ویستم تەوبە بکەم.. ووتی چێژ لە گەنجێتیوەربگرە .

ووتم: ئەترسم لە مردن .

ووتی: زوو تەواو نابێت تەمەن.. هەستام قورئان لەبەر بکەم .

ووتی: دڵت ئاسوودە بکە بە گۆرانی .

ووتم: حەرامە .

ووتی: هەندێ زانا لە بارەیەوە قسەیان هەیە.

ووتم: فەرموودەکانی حەرام بوونی ئەوەتا نوسراوە لام .

ووتی: لاوازە ( **ضعیفە** ) هەمووی .

ئافرەتێکی قەشەنگ ڕەت بوو چاوم داخست .

پێیووتم: سەیرکردن چی تیایە؟

ووتم: ترسناکە .

ووتی: بیر لە جوانیەکەی بکەرەوە، بیرکردنەوە حەڵاڵە .

چووم بۆ ماڵی خودا (کەعبە) لەسەر ڕێگەکەم ڕاوەستا .

ووتی: ئەم سەفەرە چییە؟

ووتم: ئەچم بۆ عومرە .

ووتی: ژیانت ئەخەیتە مەترسیەوە، بەهۆی ئەم عومرەیەوە، ڕێگەی خێرو چاکە زۆرە .

ووتم: هەر ئەبێت خۆم پاك بکەمەوە لە گەردی گوناه .

ووتی: بەکردەوەت ناچیتە بەهەشت .

ویستم بچم ئامۆژگارییەك پێشکەش بکەم .

ووتی: خۆت تووشی ئابڕو چوون مەکە .

ووتم: سودی خەڵکی تێدایە .

ووتی: ئەترسم مەبەستت ناوبانگ بێت، ئەمە سەری هەموو خراپەیەکە .

ووتم: بۆ چونت چییە لە بارەی هەندێ کەسەوە .

ووتی: لە بارەی تاك و کۆوە بۆت ئەدوێم .

ووتم: ئەحمەدی کوڕی حەنبەل؟

ووتی: کوشتمی ئەوەندەی ووت، دەست بگرن بە قورئانی پیرۆزو سوننەتەوە .

ووتم: ئەی ئیبن تەیمیە؟

ووتی: هەموو ڕۆژێ ئەکێشێ بەسەرما .

ووتم: ئەی بوخاری؟

ووتی: ئاگری بەردایە ماڵەکەم بە پەرتووکەکەی ( **صحيح بخاري** ) .

ووتم: ئەی حەججاج؟

ووتی: خۆزگە لە نێو خەڵکا هەزاران حەججاج هەبوایە، دڵمان بە ژیانی ئاسوودەیە، ڕێبازەکەی چارەسەرە .

ووتم: ئەی فیرعەون؟

ووتی: لە ئێمەوەیە سەرخستن و یارمەتیدانی .

ووتم: ئەی سەرکردەی ئازا ( **صلاح الدين** )، قارەمانی ڕۆژی ( **حطين** ) .

ووتی: لێی گەڕێ، ئێمەی هەڵکێشا لە قوڕێ .

ووتم: ئەی ئەبو جەهل .

ووتی: لە گەڵیدا براو کەسین .

ووتم: ئەبو لەهەب؟

ووتی: بۆ کوێ بڕوا ئێمەی لە گەڵین .

ووتم: ئەی لینین؟

ووتی: ڕستمان کردووە لە ئاگردا لەگەڵ ستالین .

ووتم: ئەی گۆڤارە بێ ئابڕووەکان؟

ووتی: ئەوانەیە شەریعەتمان .

ووتم: ئەی سەتەلایت؟

ووتی: خەڵکی پێ دەکەین بە ئاژەڵ .

ووتم: ئەی چاپخانە؟

ووتی: لە پێشوازیداین بۆ هەموو بێ ئاگایەك .

ووتم: ئەی زیکری ئێوە چییە؟

ووتی: گۆرانیە .

ووتم ئەی کردارتان؟

ووتی: بەهیوا کردنی خەڵکی .

ووتم: ئەی بۆ بازاڕ چی ئەڵێی؟

ووتی: ئالأمان لەوێدا دەشەکێتەوەو هاورێیانمانی تێدا کۆ دەبێتەوە .

ووتم: ئەی چۆن خەڵکی گومرا دەکەیت؟

ووتی: بە گومانو گۆرانی، لە گەڵ بێ ئاگایی‌و هیواو ئاواتو ئارەزوو.

ووتم: ئەی کاربەدەستان چۆن گومرا دەکەیت؟

ووتی: بە تینوبوون بە رژاندنی خوێن، لەگەڵ سەرزەنشتو رەتکردنەوەی ئامۆژگاری دانایان، بروا کردن بە کاڵفامان ..

ووتم: ئەی چۆن ئافرەتان گومرا دەکەیت؟

ووتی: بە خۆرازاندنەوەو لادانی پۆشاكو گوێ نەدان بە فەرمانی خوداو ئەنجامدامی تاوان .

ووتم: ئەی زانایان چۆن گومرا دەکەیت؟

ووتی: بە خۆدەرخستن، خۆ بەگەورە زانین، لەگەڵ حەسودی بە یەکتر بردن .

ووتم: ئەی خەڵکی ئاسایی؟

ووتی: بە غەیبەت کردنو قسەهێنانو بردن .

ووتم: ئەی بازرگانەکان؟

ووتی: بە (ربا) سوو، لە کرینو فرۆشتنو نەبەخشینی ماڵو خێر نەکردن، لەگەڵ زیادە رۆیی لە سەرفکردنی پارە بۆ ماڵو منداڵ .

ووتم: ئەی گەنجان چۆن گومرا دەکەیت؟

ووتی: بە رابواردنو شەیدایی‌و چاوبرکێو گوێ نەدان بە یاسای خوداو بە جێهێنانی کاری حەرام .

ووتم: ئەی چی ئەڵێی بۆئیسرائیل؟

ووتی: تکایە غەیبەت مەکە، چونکە غەیبەت بەلایە، ئیسرائیل‌ولاتێکی خۆشەویستە، لە دڵمانەوە زۆر نزیکە .

ووتم: ئەی **جاحظ**؟

ووتی: پیاوێکە لە نێواندایەو کاریشی زۆر روون نیە .

ووتم: ئەی ئەبو نەواس؟

ووتی: لە سەر سەرو سەرچاو، هەڵبژاردنمان هەیە لە شیعرەکانیدا .

ووتم: ئەی خەڵکانی تازەگەر؟

ووتی: زانستیان لە ئێمەوە بە میرات وەرگرتووە .

ووتم: عەلمانیەت؟

ووتی: بیرو بڕوامان عەلمانیە، ئەوانن خەڵکانی فریودەرو هەڵخەڵەتێنەر، ئەوەی ناویان بێنێ ناوی منی هێناوەو ئازاری منی داوە .

ووتم: چی ئەڵێی لە بارەی واشنتنەوە؟

ووتی:وتاربێژی من لەوێدایە، لەوێوە سوپای من بەڕێ دەکەوێ هەر ئەوێش نیشتیمانی منە.

ووتم: بۆ چوونت چۆنە بەرامبەر بانگ خوازان؟

ووتی: ئازارم ئەدەن، ماندووم دەکەن، ئابڕوویان بردووم، پیریان کردووم، ئەوەی من بینای دەکەم ئەوان ئەیڕوخێنن، من گۆرانی ئەڵێم ئەوان قورئان دەخوێنن، ئەچم بۆ لایان پەنا بە خودا دەگرن .

ووتم: چی ئەڵێی لە بارەی ڕۆژنامەکانەوە؟

ووتی: کاتی خەڵکی پێ بە فێرۆ ئەدەین، تەمەنی ئارەزوو بازانی پێ بەڕێ دەکەین، بە داخەوە پارەشی پێوەرئەگرین .

ووتم: چی ئەڵێی لە بارەی (**هيئة الأذاعة البريطانية**) وە؟

ووتی (**هەنگوینو ژەهری پێ تێکەڵ دەکەین**)و کوشتاری پێ دەکەین لە نێوان عەرەبو عەجەمداو بە شانو باڵی ستەمکاردا هەڵئەدەین .

ووتم: ئەی چیت کرد بە قەلەڕەش؟

ووتی: زاڵمان کرد بەسەر براکەیداو کوشتیو لە خاکی نا، تادیار نەما .

ووتم: چیت کرد بە قارون؟

ووتی: پێمووت: خەزێنەکەت بپارێزە ئەی کوڕی پیرێژن، تۆ یەکێکی لە هێماکانمان .

ووتم: ئەی چیتووت بە فیرعەون؟

ووتی: پێمووت: ئەی گەورەی کۆشکو تەلار بڵێ: ئایا موڵکی میسر هی من نییە؟ ئەوسا سەردەکەوی .

ووتم: چی ئەڵێی بە مەی خۆرەکان؟

ووتی: پێیان ئەڵێم بخۆرەوە شەراب، بەڕاستی خەفەت لائەبات، خەم ناهێڵێ، دەرگای تەوبەش كراوەیە .

ووتم: چی دەتكوژێ؟

ووتی: (أية الكرسي) دڵم تەنگ دەكات، ماوەی بەندكردنم زیاد ئەكات .

ووتم: كێ خۆشەویست ترین كەستە؟

ووتی: گۆرانی بێژەكان‌و شاعیرە لادەرەكان‌و ئەوانەی تاوان ئەنجام ئەدەن‌و بێ ئابڕوون .

ووتم: زۆر ڕقت لە كێیە؟

ووتی: ئەوانەی هاتوچۆی مزگەوت ئەكەن‌و هەموو كڕنۆش بەرو سوجدەبەرێك‌و ئەو خودا پەرستەی دنیا بەكەم دەگرێ‌و ئەو كەسەی تێكۆشەرە لە ڕێی خودا .

ووتم: پەنا دەگرم بە خودا لە تۆ، ون بوو دیار نەما، وەكو چوو بێت بە زەویدا، ئەمەیە پاداشتی درۆزن .

# بەشی نۆیەم

## بنیادەمە شەیتانەکان

ئەبو زەڕ (ڕەحمەتی خودای لێبێت) ئەفەرمووێت: پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لە مزگەوت بوو منیش چوومە خزمەتیو دانیشتمو پێی فەرمووم: (**یا أبا ذر، هل صلیت؟**) **قلت: لا . قال: (قم فصل) قال فقمت فصلیت ثم جلست، فقال:(یا أبا ذر، تعوذ بالله من شر شیاطین الإنس والجن) قال: قلت: یا رسول الله، وللإنس شیاطین؟ قال: (نعم)**. (رواه احمد والبزار).واتە:(ئەی ئەبو زەڕ نوێژت کرد؟ووتم: نەخێر . ئەویش فەرمووی: (هەستە نوێژ بکە) ئەبو زەڕ ئەڵێ: هەستام نوێژم کردو پاشان دانیشتمەوە، ئەوجا پێغەمبەر فەرمووی ( ئەی ئەبو زەڕ، پەنا بە خودا بگرە لە شەڕی مرۆڤە شەیتانەکانو جنۆکە شەیتانەکان) ئەڵێ:ووتم: ئەی پێغەمبەری خودا، مرۆڤی شەیتانیش هەیە؟! فەرمووی: (بەڵێ).

جا موسڵمانی بەڕێز: بزانە کە ئەم چەشنە شەیتانانە زۆر خراپترن لە ئیبلیس چونکە ئیبلیس ووتی: ﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾ص واتە: (شەیتان ووتی: خودایە سوێند بەگەورەییت، هەموویان لەخشتە بەرم*تەنها ئەوانەیان نەبێ کە بەندەی پاکو هەڵبژاردەی تۆن)، هەروەها ووتی: ﴿ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٢﴾ ﴾الإسراء .واتە:(بە ڕاستی زاڵ ئەبم بەسەر نەوەکانیدا (بە گومڕا کردن) کەمێك لەوان نەبێ (**کەبەندە تایبەتیەکانی خودان** ) .

لێرەدا دەرئەکەوێ کە ئیبلیس بەسەر هەمووانداا زاڵ نابێ، بەڵام مرۆڤە شەیتانەکان تەنها بە گومڕایی ڕازی نابن بەڵکو دەسەڵاتی خۆیان لە ڕێی خراپەو چەوسانەوەوە زاڵ ئەکەن، هەروەها ئەیانەوێت هەمووومان لە ڕێی ڕاست لابدەنو گومڕاو سەرلێشێواومان بکەن، ئەم جۆرە شەیتانە لێ ناگەڕێ قسە بکەیت ئەگەر هاوڕا نەبیت لەگەڵیدا، هەوڵو کۆششیش ئەبێ بە ئارەزووی ئەو بێ .

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ ﴾النحل واتە:(پەنا بە خودا بگرە لە شەیتانی بە نەفرەت کراو) نافەرمووێت پەنا بە خودا بگرە لە ئیبلیس،

ئەمەش لەبەر زۆری جۆری ڕەگەزی شەیتانەکانە، کەبەربەست دائەنێن بۆ بانگەوازی خودای پەروەردگار، ئەگەر تەماشا بکەیت مرۆڤە شەیتانەکان چەندێ زۆرن کە دوژمنایەتی پێغەمبەران دەکەن، جا ئەوانە لە هەموو کاتو جێگاو سەردەمێکدا دەرکەوتوون، بێگومان زیانیشیان زۆر زیاترە لە جنۆکە شەیتانەکان . هەروەها شێوازی ئەمانە بۆ گومڕا کردنی خەڵکی زۆر جۆراو جۆرە، ئەم چەشنە شەیتانە زۆر توند ترن لەوانی تر .

زاناکانووتویانە:

* هەرکەسێك هاوکاری ئیبلیسو سەربازەکانی بکات، بۆ گومڕاکردنی خەڵكو داوێن پیسیو خراپەکاری پێ خۆشبێ، ئەوە شەیتانە، هەرکەسێك هەوڵو کۆشش بدات بۆ بەرگرتن لە ئایینی پاکی پەروەردگار ئەوە شەیتانە .

* هەر مرۆڤێ بانگەواز بکات بۆ ڕێچکەی درۆو ناڕەوا بەهەرچەشنێكو لە ژێر هەر ناوێکدا بێت ئەوە شەیتانە .

* ئەو کەسەی بەربەستو ڕێگری ئەکات لە فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە ئەوە شەیتانە .

* ئەو کەسەی خراپە خۆشەویست دەکات بە هەر دەستەواژەو دروشمێ بێ .. شەیتانی نەفرەت لێکراوە .

* ئەو کەسەی هەوڵ بۆ نەمانی شەرمو شکۆ ئەدات لە کۆمەڵگەدا .. شەیتانی بە نەفرەت کراوە .

* ئەو ڕۆژنامەوانو کەسانەی دژی یەکتا پەرستیو شەریعەتی موحەممەدی دەوەستن شەیتانن .

* ئەو نووسەرەی شتگەلێك بڵاودەکاتەوە، کە تێکدەری ڕەوشتو شەرمو شکۆیە، شەیتانە .

* ئەو بنیادەمەی خەڵکی فریو ئەدات بەووتەو کردارەکانی، تا لاسایی دوژمنانی خوداو پێغەمبەر بکەنەوە لە جلو بەرگدا، لە ڕەوشتدا، لە جەژنو ئاهەنگدا .. ئەوە شەیتانی بە نەفرەت کراوە .. چونکە بە زمانی حاڵو بە ڕاشکاوی ئەڵێن: ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ أَهۡدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ

ءَامَنُوا۟ سَبِيلًا ﴿٥١﴾ ﴾ النساء. واتە:(ئەوانە ڕێبازیان ڕاسترە لەوانەی کە باوەڕییان هێناوە) . پەنا بەخودا !!

★ لە هەموو ئەوانە شەیتان تریش، ئەوانەن کە لە کاردان بۆ لادانی بەندەکان لە خودا پەرستیو ئاینی پیرۆزی ئیسلام .

★ مرۆڤی شەیتان ئاسایوا هەیە ئەی بینی کە شەکەتو ماندووە، چەشنی ئاژەڵ زمانی دەرکردووە، بۆ بڵاوکردنەوەی پڕو پاگەندەکانی، بۆ ڕازاندنەوەی بۆ چوونەکانی . هەروەها پارەو سامانی زۆر بە فیڕۆ ئەدات بۆ دانانی بەربەستو ئاستەنگ بۆ دینی خودا:

﴿ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ وَالَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ الانفال. واتە:(ماڵو سامانیان لە ئایندەدا بۆ ڕێگری لە بەردەم ئاینو دین خەرج ئەکەن ! پاشان دەبێتە پەشیمانیو داخو حەسرەت لە سەریانو لە دوایدا شکست ئەهێنن، بێگومان ئەوانەش کە بێباوەڕن بۆ دۆزەخ کۆدەکرێنەوەو ڕاپێچ دەکرێن) .

ئەو مرۆڤە شەیتانانە میراتگری ئیبلیسن، ئەوانەی لە سەر ڕێچکەی ئەو دەڕۆن، بۆ لە خشتە بردنی بنیادەمەکانو خۆشەویست کردنی خراپە کاری، لەناوبردنی چاکە، پەسەند کردنی خیانەت لە دینی خوداو قورئانی پیرۆز .

ئا ئێستا لەم سەردەمەدا ئەو جۆرە شەیتانانە دەبینین، کە بە فەساد دەڵێن چاکسازی، هەروەها بە گەلە کۆمەکیو ئاژاوەو بێوەفایی ئەڵێن ئازادی!

بە خیانەتو تاوانی گەورە ئەڵێن مەدەنیەت!

بە خراپەکاری ئەڵێن پێشکەوتنو شارستانیەت!

لای ئەوانە فەرامۆشکردنی قورئان پایە بڵندیو تازەگەرییە!

بەم جۆرە زمانی پیسو پۆخڵیان بادەدەن، لە کەناڵە جۆر بە جۆرەکانی ڕاگەیاندندا، دەستیان گرتووە بەسەر کتێبەکانی ئەم سەردەمەو بڵاوکراوەو ڕۆژنامەکاندا، هەموو ئەمانەش خراپەیەکی ڕەهان بۆ بەرەو هەڵدێر بردنی مرۆڤەکان.

تاوانی ئەمانە لەسنوور بەدەرە، پشتیوانو سەربازیان یەکجار زۆرەو خراپەشیان گشتگیرە، زەرەریان بێ ئەندازەیە، دەستیان بەسەر زۆر شوێندا گرتووە، عەقڵی خەڵکی بە پارە دەکڕن، هزر تێك دەدەن، ڕاستیەکان ئاوەژوو دەکەن، ناڕەوایی دەجۆرێننو بە جۆرەها ڕەنگو ڕووکەش بڵاوی دەکەنەوە.

**موسڵمانی ئازیز**: پێویستە بێدارو ئاگاداربیت لەو شتانەی ئەدرێت بە گوێتدا، جا بە ئاشکرا بێت یان نهێنی، دەرەکی بێت یان ناوەکی، لەم کاتەدا ئەتوانی قورئانی پیرۆزو فەرموودەی پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾ بکەیت، بەو پێوەرەی کە هەموو شتێکی پێ دەپێوی، هەموو کەسێکی پێ هەڵدەسەنگێنی، جا ئەگەر سەرسام بوویت بەووتەی کەسێك کاتێك بانگەواز دەکات بۆ چاکسازی، یەکسەر بڕوای پێمەکە، هەتاوەکو سەیری ژیان‌و کردارەکانی نەکەیت، ئەوجا بەراوردێ بکە لە نێوان ووتەو کردارەکانی، ئەگەر ڕەفتارەکانی گونجاو بوو لەگەڵ قورئانی پیرۆزو فەرموودەی پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾، ئاڵای پەیامی پێغەمبەری پێبوو، هەوڵی ئەدا بۆ سەرخستنی دین، لە هەموو شوێنێك لەسەر کێشەی موسڵمانان هەڵی ئەدایە، ئەوا بزانە لە بەندە تایبەتیەکانی خودایەو چاکە کارە.

بەڵام ئەگەر ئاکارو کرداری وەکو دووڕوەکان بوو، کە لە قورئاندا باسکراوە، بزانە ئەوەشی کە ئەیڵێ تەنها پڕو پاگەندەیەو خەڵکی پێ لە خشتە ئەبات، یاری بە هەست‌و ئارەزووی مرۆڤەکان ئەکات، بیروباوەڕەکانی ڕۆژ هەڵاتی‌و ڕۆژئاوایی بوون. بەسەر بازەکانی ئیبلیس دەژمێردرێت .

جا بانگەوازکەرانی گومڕایی‌و تاریکی، هەرچەند شوێنیان فراوان بێت، کتێب‌و ووتاریان زۆر بێت، سەربازو شوێن کەوتویان بێ شوومار بێت، ئەوا هەر بەرەو تیاچوون دەتبەن، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِن تُطِعۡ أَكۡثَرَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ ﴿١١٦﴾ ﴾ الانعام .واتە:(ئەگەر تۆ گوێ ڕایەڵی زۆربەی ئەوانە بیت، کە لەسەر زەویدان لە ڕێگەی خودا گومڕات دەکەن).

بەڵێ ئاشوبی ئەو جۆرە شەیتانانە لەم سەردەمەدا زیادی کردووە، بە جۆرێك کە جنۆکە شەیتانەکان‌و داگیرکەرانیشیان تێپەڕاندووە لە زۆر بواردا، لادان‌و گومڕایی ئەوانە لە کوشتن سەختترە، چونکە چڵکاو خۆری داگیرکەران‌و دڵە پاکەکان پیس دەکەن‌و کۆمەڵە شتێك ئەڵێن، کە داگیرکەر ناوێرێ نە بەکردارو نە بە گوفتار بیانڵێت‌و ئەنجامیان بدات، یەکێکیش لەوانە (**نزار قەببانی**) یە، کە هۆنراوەکانی لەناو موسڵماناندا بڵاو بۆتەوەو هاوشێوەی نی یە لەتاوان‌و بێ باوەڕی دا .

دوعا خوازین کە پەروەردگار نێوانی ئێمەو ئەو جۆرە شەیتانانە دوورترو دوورتر بخاتەوە، رۆڵەی موسڵمانانیش پارێزراو بکات لە فرتو فێڵەکانیان .

## گەنجان و خووی نهێنی

خووی نهێنی یەکێکە لە دیاردە قێزەونەکان کە گەنجان پێی هەڵئەستن و ئەنجامی ئەدەن .

ئەمەش پێویستی بە هەڵوێستە لە سەر کردن هەیە، تا زیانی ئەم خووە بزانری و روون بێتەوە بۆ ئەو لاوانە کە چ زەرەرێکی بۆ خۆیان و کۆمەڵگەکەشیان هەیە، ئەوەی زیاتر جێی مەترسیە ئەوەیە کە هەندێ کەس ئەم خووەیان کردووە بە پیشەی هەمیشەییان و بە چارەسەری ئەزانن بۆ خۆپاراستن لە زینا .

ئەم جۆرە کەسانە بە هۆگر دائەنرێن و زۆر نەخۆشی جەستەیی و دەروونی هەرەشە لە ژیانیان دەکات، سەرەرای ئەو تاوانەی کە تووشیان دەبێت، هەروەها ئەو خووە ئارەزووی مرۆڤ تێر ناکات و جێی هاوسەری بۆ ناگرێتەوەو نابێتە بەربەست بۆ ئارەزووەکانی .

ئەوانەشی ئەم کارە دەکەن، زیاتر ئەو کەسانەن، کەسەیری دیمەنی رووت و نابرووبەر ئەکەن و بەکاری نابەجێوە سەرقاڵن و کەسایەتی خۆیان تێك دەشکێنن، جا برای موسڵمانی ژیر باشترین رێگاچارە بۆ رەها کردنی ئەم وەزیە ئەنجامدانی هاوسەرگیریە بە شێوەیەکی شەرعییانە .

شاعیر راستیووتوە کە ئەڵێ:

**کۆیلەیە خاوەن ئـــــــــــارەزوو**
**ئەگەر زاڵ بێت ئەبێت بە ئاغا زوو بە زوو**

## پەشیمانی‌و لاوازی

ئەم ڕەوشتە ـ خووی نهێنی ـ چەندەها کێشەی دەروونی‌و کۆمەڵایەتی‌و تەندروستی لێ ئەکەوێتەوە لەوانەش:

١ـ لاوازی سێکسی بە شێوەیەکی گشتی:

زانراوە هەندێ گەنج لە پرۆسەی هاوسەر گیری ئەترسن، سەردانی عەیادە پزیشکی یەکان ئەکەن بۆ چارەسەری کێشە سێکسێکانیان .

٢ـ لە دەست دانی ئاکارو ئیمان:

ئەو کەسە کە خوو بەم کارەوە ئەگرێت: کە سایەتی لاواز ئەبێت، حەزو ویستی پەل کێشی ئەکات بۆ بەزاندنی سنووری کارە حەرامەکان، ئەمەش دەبێتە خەراپ بوونی ناوبانگ‌و تەندروستی‌و ئایین‌و بیروباوەڕی.

٣ـ ماندوویی‌و کەم توانایی:

یەکێکی تر لە دەرئەنجامەکانی ئەم خووە ئەوەیە، کە هەست بە شەکەتی ئەندامەکانی جەستەی دەکات، هەبوونی ئازار لە ئەژنۆو جومگەکاندا، یەکێك لە توێژینەوە زانستیەکان سەلماندوێتی کە: ((یەکجار ئەنجامدانی (**خووی نهێنی**) یەکسانە بە ماندوێتی کەسێك کە چەند کیلۆ مەترێك بەسەر یەکەوە ڕابکات)) .

٤ـ لە بیرچوونەوە:

هەرکەسێك هۆگربێ بەم خووەوە، زوو شتی لەبیر ئەچێتەوەو لێکدانەوەشی بێهێز ئەبێت، ئەمەش کار ئەکاتە سەر بەرهەم‌و هەوڵ‌و کۆششەکانی، لەوانەشە تووشی شێتیەکی کاتی بکات .

٥ـ هەستکردن بە تاوان‌و پەشیمانی‌و دەردەسەری:

ئەو گەنجەی ئەم کارە ئەنجام ئەدات، چێژێکی کاتی‌وەردەگرێت، وە ماوەیەکی کورت خایەن سەرگەرم ئەبێت، بەڵام پاش کەمێك ئەم چێژو خۆشیە ئەگۆڕێت بۆ حەسرەت‌و پەشیمانی، پاشان وا هەست دەکات کە ئاگری ئارەزووی خامۆش نەبووە، بۆیە جارێکی تر ئەم کارە دووبارە دەکاتەوە .

٦ـ خەمۆکی‌و دڵتەنگی:

**ئەم خووە ڤێزەونە دەبێتە هۆی خەمۆكیو دڵ تەنگیو هەستكردن بەتاوان، لەگەڵ ئەوەشدا حەز ناكات كە خەڵك بە كارەكەی بزانن .**

## چارەسەر

**بۆ چارەسەر كردنی ئەم خووە پێویستە چەند ڕێگایەك بگیرێتە بەرلەوانەش:**

**١- هانا بردن بۆ خودای گەورەو نزیك بوونەوە لێی، بەجێ بەجێ كردنی فەرزەكانو ئەنجامدانی نوێژە سوننەتەكان، هەر كەسێ پەنا بەرێ بۆ لای خودا، جەستەو دەروونی دەپارێزێو ڕزگاری دەكات لەوەسوەسەی شەیتان ..**

**پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە فەرموودەیەكی صەحیحدا ئەفەرمووێت: (إن الله تعالى قال: من عادى لي ولياً فقد آذنته بالحرب، وما تقرب عبدي بشيء أحب إليّ مما افترضت عليه، وما يزال عبدي يتقرب إلي بالنوافل حتى أحبه، فإذا أحببته كنت سمعه الذي يسمع به، وبصره الذي يبصربه، ويده التي يبطيش بها، ورجله التي يمشي بها، وإن سألني أعطيته، ولئن استعاذني لأعيذنّهُ). (رواه البخاري). واتە: (خودای گەورە هەڕەشە ئەكاتو ئەفەرمووێت: هەركەسێك دوژمنایەتی بكات لەگەڵ دۆستێكی من دا ئاگاداری ئەكەمەوە كە خۆم جەنگی لەگەڵ ئەكەم، لە جیاتی دۆستەكەی خۆم، چونكە دوژمنایەتی لەگەڵ مندا ئەكا، بەندەی من ناتوانێ خۆی لە من نزیك بكاتەوە بەهیچ كردەوەیەك كە من پێم خۆش بێ‌وەك بەو شتانەی نزیك دەبێتەوە كەلەسەرم واجب كردووە، بەندەی من بەردەوام ئەبێت‌وواز ئەهێنێ بەرەبەرە خۆی لە من نزیك ئەكاتەوە، بە كردنی سوننەتەكان هێندە سوننەت ئەكات هەتا خۆشم ئەوێت، جا هەر كاتێ بەندەی خۆم خۆشویست بۆی ئەبمە ئەو گوێیەی كە پێی ئەبیستێ، بۆی ئەبمە ئەو چاوەی كە پێی ئەبینێ، بۆی دەبمە ئەو دەستەی هەڵمەتی پێ ئەبات، بۆی ئەبمە ئەو قاچەی كە پێی ئەڕوات.. هەر شتێكم داوا لێبكات بێگومان پێی ئەبەخشم، ئەگەر داوای پەنادانم لێ بكات، بێگومان پەنای ئەدەمو ئەی پارێزم) .**

**٢- (هاوسەرگیری) لە گرنگترین هۆكارەكانەو چارەسەرە بۆ وازهێنان لەم خووە، بەیارمەتی خودا ئەبێتە قەڵغان بۆ پاراستنی دینو دەروون، هەر لەبەر ئەمەشە ئاینی پیرۆزی ئیسلام گەنجانی موسڵمان هان دەدات بۆ پەلە كردن لە هاوسەرگیری، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەفەرمووێت: (إذا تزوج العبد فقد إستكمل نصف الدين، فليتق الله في**

**النصف البا قي**). (رواه البيهقي) . واتە:(ئەگەر مسوڵمانێ (بەندەیەك) هاوسەرگیری ئەنجامدا نیوەی باوەڕی دامەزراو دەبێ، با خۆی لە سزای خودا بپارێزێ بۆ تەواو کردنی نیوەکەی تری ) .. هەروەها پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لەفەرمووده‌یەکی تردا دەفەرموویێت: (**من كان منكم ذا طول فليتزوج، فإنه أغض للطرف، أحصن للفرج، ومن لا، فإن الصوم له وجاء**). (رواه أحمد ) . واتە:(کێ لە ئێوە توانای هەبوو، با ژن بهێنێ، چونکە بەڕاستی ژن هێنان چاوی نەپارێزێو پارێزگاری لە داوێنی نەکات، ئەگەر نەیتوانی ئەوا بەڕۆژوو بوون قەڵغانە بۆی) .

٣. بەسوود ترین چارەسەر:

دوورکەوتنەوە لە شوێنی ڕابواردنو شوێنی ئارەزوو بازیو تێکەڵی پیاوو ئافرەت، هەروەها خۆ پاراستن لەو جێگایانەی کە بە تێکەڵی خەڵکی تێدا کۆ دەبنەوە، وەکو بازاڕەکانو شوێنە گشتیەکان، تەنها لەکاتی پێویستدا نەبێت، وە ئەگەر چووشی پێویستە لەو کاتانەدا بچیت کە ئافرەت بە کەمی لەو جێگایانەدا هەیە، وەکو بەیانیان یان سەرەتای عەسر، ئەگەر یەکێکی خراپت بینی، پێویستە سەیری نەکەیو تێی نەڕوانی، بەڵکو ئەبێت چاوت بپارێزی، تاکو خودای گەورە ئەم شەرمت بۆ بگۆڕێ بە چێژی ئیمان .

٤. یەکێکی ترلە هۆکارەکانی ئەم خووە خراپە، تەماشاکردنی کەناڵە ئاسمانیەکانە، بوارێکی زۆر خراپە بۆ تێکدانی گەنجو پیرو نەزانو ڕۆشنبیر، ئەمەش لەبەر ئەو شتە خراپانەیە، کە ئەم کەناڵانە پەخشی ئەکەن بۆ لادانی خەڵی لە بیروباوەڕی ئاینی هەتاوەکو ئەگاتە فریودانی سێکسی، هەروەها باسکردنی ئازادیو پێشێلکردنی دەقە ئاینیەکانەوە لەناوبردنی شەرمو شکۆو داوێن پاکی .

٥. هۆکارێکی تر بۆ خۆپاراستن ئەوەیە کە دوور بکەوێتەوە لەو شتانەی کە ئەم خووەی بیر دەخەنەوە، ئەگەر شەیتان لە دەست بەتاڵیدا هانت ئەدات بۆ ئەم کارە، ئەوا خۆت بەشتی بەسوودەوە خەریك بکە، ئەگەر لە تەنیایدا حەزت بەم کارە ئەبێت، ئەوا خۆتی لێ بپارێزە، وە هەوڵ بدە بەتەنها نەبیت، خۆ ئەگەر بەڕێزت لەوانەی کەوازت لەو خووە هێناوە، ئەوا خودی بەرگریکردنەکەت مایەی شانازییە .. پاشان بەڕێزتان زۆر بەختەوەرو ئاسودەن، کەچەند هەفتەیەکتان بەڕێ کردووەو ئەو کارەتان ئەنجام نەداوە، خۆ ئەگەر هەستێکیشت بۆ هات بۆ کردنی ئەم کارە ئەوا بەخۆت بڵێ (ماوەیەکی درێژە بەرهەڵستیم کردووە.. ڕۆژ، هەفتە، مانگ، ئەگەر بدۆڕێم ئەوا هەموو شتێکم لەدەست ئەچێ).

له كۆتاییدا پشت به پەروەردگارت ببەستەو بێزار مەبە، خۆت ئامادە بکەو توندو تۆڵبە، بەڵام پێویستە بەردەوام نزاو پاڕانەوەت هەبێ له پەروەردگارو نەکەی شەیتان فریوت بدات .

## ( خوی نهێنی ) له گۆشه نیگای شەرعەوه

ئەم کردارە له گۆشه نیگای شەرعەوه حەرامە بەڵگەش ئەم ئایەتە پیرۆزەیە: ﴿ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٦﴾ فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ ﴿٧﴾ ﴾ المؤمنون . واته: (ئەوانەی پارێزەری داوێنی خۆیانن، جگه لەگەڵ هاوسەرانو کەنیزەکانیان نەبێت کە ئەوە جێگەی لۆمەو سەرزەنشت نییە * جا ئەوەی جگە لەو سنوورە دیاری کراوە، ڕێگەو ڕێبازی تر بگرێتە بەر بە کەسانی یاخیو لەسنوور دەرچوو دەژمێررێت) .

هەروەها بەڵگەیەکی تریش ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾ کە ئەفەرمووێت: (البر حسن الخلق والإثم ما حاك في صدرك، وكرهت إن يطلع عليه الناس). (رواه مسلم) .
واته:(چاکە ڕەوشت بەرزیە، خراپەش ئەوەیە دڵە ڕاوکێت بۆ دروست ئەکاتو پێشت ناخۆشە خەڵکی پێی بزانێت) .

بەڵام بۆ ڕوخسەتدان، له ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە هاتووە بۆ کەسێك بترسێ لەو کاتەدا تووشی زینا ببێت، جگە له ئەمەش حەرامەو گومانی تێدا نیە .

## چەند چیرۆکێك لە چیرۆکی قوربانیەکانی شەیتان

خوێنەری ئازیز: ئەم کۆمەڵە چیرۆکە ڕاستەقینەنو بەسەرهاتی ئەو کەسانەیە کە شەیتان فریوی داونو گوناهو تاوانیان دەرهەق بە خۆیانو دەوروبەریان ئەنجام داوە .

ئێمە بۆ ئەوە باسیان ئەکەین، تاکەسانیتر پەندو ئامۆژگاری لێوەربگرنو بە دوای هەنگاوەکانی شەیتاندا نەڕۆن .. ئەو قوربانیانەی لەم چیرۆکانەدا دەیان خوێنیتەوە، جۆراو جۆرن، وەکو قوربانی کەناڵە ئاسمانیەکان، ئەنتەرنێت، مادده بێهۆش کەرەکان، خزمەتکارو شۆفێرەکان .. هتد.

دوعا خوازین خودای گەورە بە کۆکردنەوەیان چاکەمان بۆ بنووسێو مایەی ڕەزامەندی پەروەردگار بێو لووت شکانی شەیتانی بەدوادا بێت، هەروەها خودای گەورە خۆمانو نەوەکانمانو ئیماندارانیش لە شەڕو ئاشووبی شەیتان بپارێزێو یارمەتیمان بدات بۆ بلاو کردنەوەی چاکەو چاکە کاری لە نێو مسوڵمانانداو سەرکەوتنو دڵسۆزیمان بۆ بنووسێ .. ـ آمین ـ

## چیرۆکەکان

### قابیل

یەکەم قوربانیە لە قوربانیەکانی شەیتان، کەشەیتان گومانی خستە دڵی قابیلەوە بۆکوشتنی براکەی، ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ إِذۡ قَرَّبَا قُرۡبَانٗا فَتُقُبِّلَ مِنۡ أَحَدِهِمَا وَلَمۡ يُتَقَبَّلۡ مِنَ ٱلۡأٓخَرِ قَالَ لَأَقۡتُلَنَّكَۖ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾المائدة. واتە: (بەسەرهاتو هەواڵی دوو کوڕەکەی ئادەم بۆ ئەو خەڵکە بخوێنەرەوە کەبەڕاستی ڕوویداوە، ئەوەبو کاتێك هەردووکیان قوربانییان کرد، لە یەکێکیان وەرگیراو لەوەی تریان وەرنەگیرا، ئەوەی کەلێی وەرنەگیرا، بەبراکەی ووت: هەر دەتکوژم ئەویش لەوەڵامی هەڕەشەکەیدا ووتی: خودای گەورە تەنها لەپارێزکاران قوربانیو چاکە وەردەگیرێت).

* ئیمامی قورتبی دەفەرموێ: ئیبلیس یەکەم کەسە کە بێ باوەڕی داهێنا، وەقابیلیش یەکەم کەسە کە کوشتنی داهێنا، وەبنەڕەتی ئەمانەش بێ گومان حەسودی بوو.

★ ئیبن کثیر لەتەفسیرەکەیدا ئەفەرموێت: خودای گەورە دەستورێکی بۆ ئادەم دانا کە کچەکانی شوو بەکورەکانی بکەن، لەبەر حاڵەتی پێویستی، بەشێوەیەك کە لەهەر سکێك کوڕێك و کچێکی ئەبوو، کچی ئەم سکەیان شووی ئەکرد بەکوڕی سکەکەی تر، خوشکەکەی قابیل جوانتر بوو لە خوشکەکەی هابیل، قابیل ئەیویست خوشکەکەی بۆ هابیل نەبێت و شوو بکات بەخۆی، ئادەم(سەلامی خودای لێبێت) بەمە ڕازی نەبوو، بۆیە بڕیاری دا هەر یەکەیان قوربانی یەك بکەن، هەرکەسیان قوربانی یەکەی وەرگیرا، ئەوە کچەجوانەکەیان بۆ ئەوە، لەهابیل وەرگیراو لە قابیل وەرنەگیرا.

★ (السدي) لە ئیبن عباسەوە ئەویش لەئیبن مەسعودەوە (خودایان لێ ڕازی بێت) ئەگێڕێتەوە، کە قوربانی یەکەیان بۆ خودای گەورە کرد، تابزانن کامیان شایەنی ئەو کچەن، هابیل مەڕێکی قەڵەوی کرد بەقوربانی، قابیلیش گیاندارێکی پەڕپووت وخراپی کردە قوربانی، هێشتا ئەوەشی بەزۆر ئەزانی و لێ ی خوارد، ئاگرێك هاتوو قوربانی یەکەی هابیلی بردو وازی لەوەی قابیل هێنا، ئەویش تووڕەبوو بە هابیلی ووت: ئەتکوژم، تا خوشکەکەم مارە نەکەیت، هابیلیش ووتی: ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾(رواه ابن جرير).

ئەو ووتەیەی خودای گەورە کە ئەفەرموێت: ﴿ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٍ يَدِيَ إِلَيْكَ لِأَقْتُلَكَ ۖ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ ﴾المائدة. واتە: ( سوێند بەخودا ئەگەر تۆ دەستت درێژ بکەیت بۆ من، بۆئەوەی بمکوژیت، من دەست درێژناکەم بۆ تۆ، بۆئەوەی بتکوژم، چونکە بەڕاستی من لە سزاو تۆڵەی خودای گەورە ئەترسم).

هەروەها هابیل پێی ووت: من هاوڕەفتارت نابم لەو کارە خراپەی دەیکەیت، چونکە من وتۆ یەکسان دەبین لەو تاوانەداو بەڵکو ئارام ئەگرم.

★ (ابن جرير) لە (عبدالله ی کوڕی عەمر)ەوە ئەگێڕێتەوە: کوژراوەکە بەهێزتر بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی تووشی تاوان نەبێت، دەست درێژی نەکردە سەر براکەی .. وەك ئەو ووتەیەی کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثْمِي وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ ۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُا۟ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾المائدة. واتە: (بەڕاستی دەمەوێت بە گوناهی من وگوناهی خۆشتەوە بگەڕێیتەوە، ئەوجا دەبیتە نیشتەجێی ناو ئاگر، هەر ئەوەشە پاداشتی ستەمکاران).

★ (ابن عباس)و(مجاهید) دەفەرموون: قابیل ئەبێتە هەڵگری گوناهەکانی خۆیوبراکەی، ئەگەر بووترێت: هابیل چۆن توانی گوناهی کوشتنەکەی بخاتە سەر قابیل؟وەڵام ئەمەیە: هابیل بەقابیلیووت: کە من ناتکوژم، ئەگەر تۆش بمکوژیت، بەڵکو دەستی هەڵگرت بەنیازی ئەوەی ئەگەر کوشتن ڕوویدا با لەبراکەیەوە بێت، ئەم وتەیەش هەڵگری ئامۆژگاریە، ئەگەر پەندوەربگریو قەدەغە کردنیشە ئەگەر دوور بکەوێتەوە..خودای گەورە دەفەرموێ:

﴿ فَطَوَّعَتْ لَهُۥ نَفْسُهُۥ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾ المائدة. واتە: (سەرەنجام نەفسی سەرکەشی هانی داو کوشتنی براکەی لاسادەو ئاسان کردوکوشتی، ئیتر خۆی خستەڕیزی خەسارەتمەندو زەرەرمەندانەوە).

★ (السدي) دەفەرموێ: قابیل داوای لەهابیل کرد کە بیکوژێ، بەڵام هابیل ڕووی لێوەرگێڕاو ڕۆیشت بۆسەر چیاکان. ڕۆژێکیان قابیل دێت بۆلای هابیل، هابیل شوانی ڕانە مەڕێك ئەبێت، قابیل بەردێك هەڵئەگریو ئەیدا بەسەریداو ئەمرێت، پاشان بەتەنها بەجێی دەهێڵێت.

★ (ابن جرير) گێڕاویەتی یەوەو دەفەرموێت: هەندێك لە ئەهلی کتاب ئەڵێن بەخنکاندنو لەت لەت کردن کوشتویەتی، هەروەك درندەیەك چۆن گیاندارێك دەکوژێت.

هەروەها ئەفەرموێت: کاتێكویستی بیکوژێت، ملی گرتبوو نەی ئەزانی چی لێ بکات، هەتا ئیبلیس ئاژەڵێکی هێناو ملی خستە سەر بەردێك، ئینجا بەردێکی تری ئەکێشا بەسەریدا، هەتا کوشتی، قابیل تەماشای کردو براکەی بەو شێوەیە کوشت.

ئایەتی ﴿فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٣٠﴾﴾المائدة. واتە: (لە دنیاو دوارۆژدا، چ خەسارەتمەندییەك لەمەگەورەترە)!!

★ عبداللەی کوڕی مەسعود (خودای لێ ڕازی بێت) لەپێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ ئەگێڕێتەوە:هیچ کەسێك بەزوڵم ناکوژرێ ئیللا مافی خوێنەکەی لەسەر قابیلە، چونکە یەکەم کەس بوو کە کوشتنی داهێنا.

ئایەتی: ﴿ فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابًا يَبْحَثُ فِى ٱلْأَرْضِ لِيُرِيَهُۥ كَيْفَ يُوَٰرِى سَوْءَةَ أَخِيهِ ۚ قَالَ يَٰوَيْلَتَىٰٓ أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَٰذَا ٱلْغُرَابِ فَأُوَٰرِىَ سَوْءَةَ أَخِى ۖ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ ﴿٣١﴾ ﴾ المائدة.

★ (السدي) دەفەرموێت: کە هابیل مرد قابیل بەتەنها مایەوە، نەیئەزانی چۆن براکەی بشارێتەوە، خودای گەورە دوو قەلە ڕەشی نارد، کەوتنە شەڕکردن هەتا یەکێکیان ئەوی تریانی کوشت، پاشان چاڵی بۆ هەڵکەندو قەلەڕەشە مردووەکەی تێ کردو بە خۆڵ دای پۆشی، قابیل کاتێك ئەمەی بینی ووتی:﴿ يَـٰوَيْلَتَىٰٓ أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَـٰذَا ٱلْغُرَابِ فَأُوَٰرِيَ سَوْءَةَ أَخِى ﴾ ماوەیەکی زۆر تەرمی براکەی بەسەر شانەوە بوو هەتا خودای گەورە دوو قەلەڕەشەکەی بۆناردوقابیلیش دوای پەشیمان بوونەوە، تەنها خەسارەت مەندی بۆ مایەوە.

## فیرعەون

بەڕاستی ئەوە خۆ بەزل زانین‌و یاخیبوونی فیرعەون بوو، کە شەیتانی دڵخۆش کردو کاری خۆی بە هەموو ئەو کەسانە کرد کە مەیلی لێ بوو، کوفری کرد بەرامبەر بەخوداو فەسادی‌و داوێن پیسی لە زەویدا بڵاوکردەوەو وتیشی: ﴿ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴾هەروەها ووتی:﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرِى فَأَوْقِدْ لِى يَـٰهَـٰمَـٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجْعَل لِّى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَـٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٣٨﴾ ﴾ القصص. واتە: (فیرعەون سەرکەشانەووتی: ئەی خەڵکینە من کەسی تر شك نابەم، کەشایستەبێت بەوەی کەخوداتان بێت جگە لەخۆم).

فیرعەون بوو نەوەکانی بەنی ئیسرائیلی سەر ئەبڕی‌و ئابڕووی ئافرەتەکانیانی ئەبردو خەڵکەکەی ئەکرد بەشوێن کەوتەی خۆی.

بەڵێ فیرعەونی زۆردارو یاخی بوو، خودای گەورە موساو هارونی(سەلامی خودایان لێبێت) بۆنارد بۆ ئەوەی خودای بیربهێننەوە، فەرمانی پێ کردن قسەیان نەرم بێت لەگەڵیدا، سا بەڵکو بترسێت‌وبگەڕێتەوە بۆلای خودا. خودای گەورە ئەفەرموێت:﴿ ٱذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِـَٔايَـٰتِى وَلَا تَنِيَا فِى ذِكْرِى ﴿٤٢﴾ ٱذْهَبَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾ ﴾ طه. واتە:( هەردوکتان بچن بۆلای فیرعەون، چونکە بەڕاستی ئەو لەبەندایەتی‌و لەسنوور دەرچووە، هەردوکتان بەنەرمی‌و بەجوانی قسەی لەگەڵ بکەن، بۆ ئەوەی بیربکاتەوە، یان بۆئەوەی ترسی سزای ئێمە لەدەروونیدا جێگیر بێت).

بەڵام فیرعەون بەردەوام لەسەر خۆ بەزل زانین و سەرکەشی و یاخیبوون بەردەوام بوو، خودای گەورەش خۆی وسەربازەکانی کرد بەپەندی دونیاو دواڕۆژ هەروەك ئەفەرموێ:

﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذْ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى ﴿١٦﴾ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿١٧﴾ فَقُلْ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَأَهْدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخْشَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَرَىٰهُ ٱلْـَٔايَةَ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿٢٠﴾ فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ ﴿٢١﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ ﴿٢٢﴾ فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلْـَٔاخِرَةِ وَٱلْأُولَىٰٓ ﴿٢٥﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰٓ ﴿٢٦﴾ ﴾ النازعات. واتە: (ئایا بەسەرهاتی موسات پێگەیشتووە، کاتێك پەروەردگاری لە دۆڵی(طوی)دا بانگی کردو گفتوگۆی لەگەڵ کردو پێی ووت:بچۆ بۆلای فیرعەون، بەڕاستی لەسنوور دەرچووەو ستەمی زۆرو بێ ئەندازەیەو پێی بڵێ: باشە ئەوەناکرێت دڵ‌ودەرون‌و کردارو ڕەفتارت جوان‌و پاك بێت؟ بۆئەوەی ڕێنمایت بکەم بۆ ناسینی پەروەردگارت؟ تاترسی سزای خودات هەبێت‌و ستەم نەکەیت، فیرعەون موعجیزەکەی موسای بەدرۆ زانی‌و یاخی بوو و پشتی هەڵکردو کەوتە دژایەتی موسا، پاشان خەڵکی کۆکردەوەو بەدەنگی بەرز هاواری کرد: من پەروەردگاری هەرەبەرزو بڵندی ئێوەم، ئەوسا خودا دوچاری سزای قیامەت‌و دونیای کرد، بەڕاستی ئالەو بەسەرهاتەدا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ هەر کەسێك کەلە خودا بترسێت) .

کاتێك موسا(سەلامی خودای لێبێت)پەیامەکەی بەفیرعەون گەیاند، فیرعەونیش ئیمانی نەهێناو بەڵکو هەڕەشەی لێکرد، خودای گەورە فەرمانی بەموسادا (سەلامی خودای لێبێت) کەبەنی ئیسرائیل لەگەڵ خۆیدا بەرەو دەریا بەرێت، کاتێك فیرعەون بەمەی زانی سەربازو دارودەستەکەی کۆکردەوەو کەوتنەڕێ تابیانگرن، هەتاگەیشتنە ئەو شوێنەی کەموساو بەنی ئیسرائیلیەکان پێیدا پەڕیبونەوە، فیرعەن‌و دارودەستەکەی ویستیان بەهەمان شوێندا بپەڕنەوە، کاتێك گەیشتنە ناوەڕاستی ناوەکە، بەنی ئیسرائیلیەکان پەڕیبونەوە، لەم کاتەدا فەرمانی خودای گەورە هات، کە هیچ شتێك لەئاسمان‌و زەویدا نەیتوانی ڕەتی بکاتەوە، ئاوەکە یەکی گرتەوەو فیرعەون‌و دارودەستەو سەربازەکانی هەموویان نقووم بوون، ساتی نقووم بوونەکە لەسەر فیرعەون زۆر تاڵ‌و ناڕەحەت بوو بۆیە هاواری کردو ووتی: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓا۟ إِسْرَٰٓءِيلَ

﴿وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ٩٠﴾ یونس. واته: (فیرعەون خەریك بوو نەخنكا، ئالەو كاتەدا وتی:وا باوەرم هێنا بەوەی كە هیچ خودایەك نیە جگە لەو خودایەی نەوەی ئیسرائیل باوەریان پێهێناوەو من لەموسوڵمانانم).

بەڵام خودای گەورە تەوبەكەی لێ وەرنەگرت، چونكە بەناچاری تەوبەی كرد، بۆیە لەناودا خنكاندیو لاشەكەشی فرێ دایە كەنار دەریا، تا بەفیرعەونو هەموو یاخیو ستەمكاران بڵێت: ﴿فَٱلۡيَوۡمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنۡ خَلۡفَكَ ءَايَةٗۚ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنۡ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ٩٢﴾ یونس . واته: (ئەمرۆ ئیتر لاشەی تۆ رزگار ئەكەین، تا ببێتە موعجیزەو پەندو ئامۆژگاری بۆ ئەوانەی دوای تۆدێن، بەڵام بەراستی زۆربەی خەڵكی لە ئایەتو موعجیزەكانی ئێمە غافڵو بێ ئاگان).

* ئیمامی (أحمدو ترمذی) لە (عبدالله ی كوری عباس)ەوە ئەگێرنەوە، كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: جبرائیل پێی ووتم: ئەی محمد(ﷺ) كاتێك فیرعەون ویستی ئیمان بهێنێت، بەشێك لەناوی دەریام كرد بەدەمیدا نەوەك رەحمەتی خودا بیگرێتەوە.

## شارۆن ( بەزیندوی بۆگەنی كردووە )

دەنگوباسەكانوا رادەگەیەنن كە پزیشكەكانی نەخۆشخانەی (هداسا)كە شارۆنی لێ خەوتووە ئەڵێن: شارۆن لە بێ ئاگاییەكی تەواو دایە، خستویانەتە ژووری نەشتەرگەرییەوە، لەرۆژی هەینی١٠/٢/٢٠٠٦ بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەریەكی خێرا بۆ ئەوەی بەشێك لە ریخۆڵەی لێبكەنەوە، كە بۆگەنی كردبوو.. بەم شێوەیە ئەبینین كە دوژمنی خوداو ئیسلام چی بەسەر هاتووە.

شارۆنی بكوژی شێخ أحمد یاسینو دكتۆر رەنتیسیو پێشەوا صلاح شحادەو چەندانی تر، ئەنجامدەری قەسابخانەی جەنینونابلس، خودا كردوویەتی بە پەندو عیبرەت بۆ هەموو خەڵكی، ئەو كەسەی بەدرێژای ژیانی گوێرایەڵی شەیتانو دوژمنی خوداو پێغەمبەر(ﷺ)و ئیمانداران بوو، هەموو رۆژێك خودای میهرەبان نیشانمان ئەدات كە كۆتاییو سەرەنجامی ستەمكاران چۆنە؟!

بەراستی لە ترسناكترینو ناشیرینترین حاڵەتدان، كە تۆ گومانیان پێ ئەبەی.

لە سەرەتادا ئەم تاوانبارە خودای گەورە توشی جەڵدەی دەماغی کرد، ئەو دەماغەی کە ڕەنگ ڕێژی پێ ئەکرد بۆ ئەنجامدانی تیرۆر، هەروەها بۆ لەناوبردنی ئومەتی محمد(ﷺ)، پاشان بۆ ئیفلیجییەکی تەواو لە هەموو گیانیدا، تەنانەت ناتوانێت پێڵوی چاویشی بجوڵێنێت، لەکاتێکدا سیناو لوبنانی ڕانەماڵی، دیلە میصریەکانی سەرئەبڕی، بەڵام ئێستا لە بێ ئاگاییەکی تەواو دایە، تەنانەت نازانێت لەدەوروبەری چی ڕوونەدات.

شارۆن بوو بەویستو ئارەزووی خۆی دەستی وەرئەدا لەکاروباری وڵاتانو یاری بە فەرمانڕەواکانیان ئەکرد، هەروەك چۆن منداڵ یاری بەتۆپ ئەکات، پزیشکەکان بێ ئومێد بوون لەچارەسەرکردنی ئەم ستەمکارە خوێن مژە.. خودای گەورە گەورەترین بەڵگەو نیشانەمان لە ژیانی شارۆندا پیشان ئەدات کە، هێشتا لەژیاندایە، بەڵام لاشەکەی بۆگەنی کردووە.

## شەیتان پەرستان

لە میسر لە کوتوپڕێکدا کۆمەڵەی شەیتان پەرستان دەرکەوتن، لەبەرئەوەی هیچ پێشەکیەکیان نەبوو، لەپڕ دەرکەوتن، کاتێك (٨٦)گەنجیان لێ دەست گیرا کە(٧)یان ئافرەت بوون..خەڵکی توشی سەرسامی بوونو پرسیاریان دەکرد مەبەست چیە لەشەیتان پەرستان؟ ئەم بیرۆکەیە لەکوێ دەرکەوتووە؟ کەی هاتە میسر؟ لە ڕاستیدا هەروەك لێکۆڵەری ئەمەریکی(ئەلیزا بێث) لەزانکۆی (إیلینوی)دەڵێت: سەرەتای دروست بوونی ئەم کۆمەڵەیە دەگەڕێتەوە بۆیەکێك لەو عەشیرەتانەی کەبت پەرست بوونو هەموو دابو نەریتێکیان بریتی بوو لەپێشێل کردنی تەواوی یاساکان، وەکو (بەکارهێنانی مادە بێ هۆشکەرەکان، خواردنی مەی، سێکسی بەکۆمەڵ، دزی). ئەم لێکۆڵەرە، پێ داگری ئەکات لە سەر ئەوەی کەشەیتان پەرستان لەسەرەتای سەدەی سیازدەیەمی زاینیدا لە ئەوروپادا دەرکەوتوون، ئەندامەکانی هەستاون بەئەنجامدانی (سیحری ڕەش) تا گەیشتوونەتە چڵەپۆپە لەکارەکانیاندا، هەتاوای لێ هاتووە کەنیسە بۆ ڕیشەکێش کردنی ئەم کۆمەڵەیە بڕیاری سوتاندنی ئەندامەکانی بدات، بەڵام دەرکەوتنی کۆمەڵەی شەیتان پەرستان لەم سەردەمەدا، دەگەڕێتەوە بۆ جولەکەیەك کەبەرەچەڵەك ئەمریکیە..(ئەنطوان لیفي) کەهەستا

بەدامەزراندنی پەرستگایەك بۆ شەیتان لە(سان فرانسیسکۆ) لە ساڵی ١٩٦٦، ئەم جولەکەیە بانگەوازی بۆ شەیتان پەرستی ئەکرد، تاوای لێهات بڵاوبووەوە بە ئەوروپاو ئوسترالیادا، بەڵام دەسەوەستان مایەوە، کە بتوانێت ئەم بیروبۆچوونە بڵاوە پێ بکات بە جیهانی ئیسلامیو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، هەتاوەکو ئەم بیروبۆچوونە لە ڕێی کۆمەڵەی(هیبز)، کە هاوشێوەی کۆمەڵەی شەیتان پەرستانە بەسوود وەرگرتن لە مۆسیقای (ڕۆك) کە گەنجانی ڕۆژهەڵات حەزیان بە گوێگرتنی ئەم جۆرە مۆسیقایە هەیە، توانیان بیری شەیتان پەرستی لە ڕۆژهەڵاتدا بڵاو بکەنەوە.

ئەو دەوڵەتانەی ئەوروپاش کە کۆمەڵەی شەیتان پەرستانی تێدایەو ئەم پەرستنە ئەنجام دەدەن، وەك: ئەڵمانیا لەناوچەی (بروآکن بابك) لەشاری (هیرتس).. ئەم ناوچەیە لای شەیتان پەرستان، بە شوێنێکی پیرۆز دادەنرێت، لەبەرئەوەی بڕوایان وایە ئەو پەیمانەی لە نێوان شەیتانو ڕابەری ڕوحییان دکتۆر(فاوست) لەم شوێنەدا مۆرکراوە.

لەم جێگایەدا لەسەرەتای هەموو ساڵێکدا، دوو ئاهەنگی گەورە ساز ئەکرێو شەیتان پەرستان لە هەموو شوێنێکەوە ئامادەی ئەبن، حکومەتی ئەڵمانیاش هیچ ڕێگرییەك لەبەردەم ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیەدا ناکات، بۆ ئەنجامدانی ڕێوڕەسمەکانیان، تاوەکو تۆمەتبار نەکرێت بە پێشێل کردنی ئازادییەکان، هەتاوەکو حکومەتی ئەڵمانیا هەستی بە بوونی قوربانی زۆر کرد بەدەستی ئەم کۆمەڵەیە، کاتێك شەیتان پەرستان هەڵ دەسان بەکوشتنی منداڵان بۆ خواردنەوەی خوێنەکانیانو بۆیەکردنی لاشەو ڕوخساریان، هەروەها تاوانی گەورەیان ئەنجام ئەدا، لە ژێر کاریگەری مادە بێ هۆشکەرەکاندا، لەبەرئەوە حکومەتی ئەڵمانیا هەستا بەدەرکردنیان.. لە ئەمریکایش پۆلیس ژمارەیەکی زۆری لێ دەست گیر کردن.

## پێناسەو حەقیقەتی شەیتان پەرستان

کۆمەڵێکن ئیبلیسیان کردووەتە پەرستراوو پەروەردگاری خۆیان، بەجۆرەها شێوە لێی نزیك ئەبنەوە، هەندێك هەڵسوکەوتیان داهێناوەو ناویان ناوە(عیبادەت)، خۆشەویستی بۆ دەرئەبڕنو داوای ڕەزامەندی لێ ئەکەن. ئەم بیروبۆوچوونە، بیروبۆچونێکی کۆنە، بەڵام مێژوونوسان هاوڕانین لەسەر سەرەتای پەیدابوونی، هەندێکیان لایان وایە کەلە سەدەی

یەکەمی زاینی پەوە سەری هەڵداوە. (غەنوجیەکان)سەیری شەیتانیان نەکرد وەکو خودا لە هێزو دەسەڵاتدا، پاشان گەشەی کردووەو (بۆلجیەکان) بڕوایان وابوو شەیتان دروستکەری ئەم بوونەوەرو گەردوونەیە.

هەروەها ئەم پەرستنە هەبووە، لە هەندێك لە(فرسان الهیکل)کە کەنیسە دروستی کرد، بۆ ئەوەی شەڕی خاچ پەرستی پێبکەن، لە ساڵی ١١١٨ز، بەڵام سەلاحەدینی ئەیوبی لەساڵی(١٢٩١ز)لە ناوی بردن و سەرۆکەکەیان لە سێدارە درا، کە ناوی (جاك دی مولی) بوو، لە گەڵ شوێن کەوتوانی.

ئەمانەوێنەی شەیتانیان کێشابوو، لە سەر شێوەی پشیلەیەکی ڕەش، هەندێك هێماو ئامرازیان هەبوو، وەك ئەستێرەی پێنج لا، کەلەناوەڕاستیدا سەری بەرانێك هەبوو.

(دانی أوشم) ئەڵێ: ئەم شێوازی پەرستنە، بۆ ماوەیەکی زۆر دیارنەما، بەڵام لەسەردەمی نوێدا بەگڕوتینێکی زۆرەوە سەری هەڵدایەوە، تەنانەت ڕێکخراوهەیە بۆ پەرستنی شەیتانوەك ڕێکخراوی(ONA)لە بەریتانیاو (OSV)لەئێرلەنداو شەش پەرستگا لەئەمریکا، وەکەنیسەی شەیتان کە ترسناکترین جۆری ئەم ڕێکخراوانەیە، کەجولەکەی جادوگەر(ئەنطوان لیفي)دایمەزراندووە، لەساڵی (١٩٦٦ز)کە ئەندامەکانیان بە پەنجا هەزار دەژمێررێت و لقیان لەئەوروپاو ئەمریکاو ئەفریقیا هەیە.

## بانگەوازی شەیتان پەرستان

بەوتەی (تراولی)، دوای ئەویش (لیفی)، شەیتان شایستەی ڕێزەو دەبێت وا سەیری بکرێت کە لەلایەن خوداوە ستەمی لێکراوە (پەنابەخودا)، کاتێك دەرکراوە لەبەهەشت. وە ئەڵێن: شەیتان لەوپەڕی یەکتاپەرستیدا بووە، چونکە ڕەتی کردوەتەوە کڕنوش بۆ ئادەم بەرێت، هەروەها ئەڵێن: شەیتان واز لەشوێن کەوتوانی دێنێت، کە بۆ خۆیان لەدونیادا بەئارەزووی خۆیان ڕابوێرن و سوود لە ژیانی دنیایان ببینن، لەگەڵ هەر کەسێکدا پێت خۆشەوهەرچۆنێکت ئەوێت سێکس ئەنجام بدەو بەرامبەرەکەشت لەسەری پێویستە خۆی بەدەستەوەبدات و ئەتوانیت ڕابوێرێت هەرچەندێك خۆت ئەتەوێت، بەم جۆرە بانگەشە بۆ کاری ناشەرعی ئەکەن، تەنانەت لەگەڵ نزیکترین کەسیشدا، واتە (محارم)، هەروەها

ئەنجامدانی کاری ناشەرعیان لەگەڵ (مەحرەم)دا، لەلا پەسەندو شیاوە، وەك ئەنجام دانی کاری سێکسی باوك لەگەڵ کورو کچی خۆیدا، چونکە لە لای ئەمان هیچ سنوورێك نیە.

لە شوێنی چۆڵو خانوی کۆنو وێرانە کۆئەبنەوەو لەسەر دیوارەکانیوێنەی ترسناك ئەکێشن، وەك:(مارو جمجمەو وێنەو شێوەی نامۆ) ئەم کۆبونەوانە ئەنجام ئەدەن بە هاوڕێیەتی مۆسیقایەکی بەرزو هاوارکەرو هەندێكووشە ئەڵێنەوە لەسەر شێوەی گۆرانی، کە سرودی مەرگو خۆکوژی لەخۆ ئەگرێت، لەگەڵ بەکارهێنانی ماددەی بێ هۆشکەرو سەرخۆشکەر بە شێوەی زیادەڕەوی، لەم حاڵەتەدا لەوانەیە خوێنی یەکتر بلێسنەوە، یان پشیلەیەك یان سەگێك هەڵ درنو خوێنەکەی بلێسنەوەو ئاژەڵێکش هەڵدەبژێرن کەرەنگی رەش بێتو گاڵتە بەخوێنەکەی دەکەنو سێکسی لەگەڵ ئەنجام ئەدەن.

بەوتەی خۆیان مرۆڤ ئەم ئازادییەی لەلایەن شەیتانەوە بەدەست هێناوە، هەرلەبەرئەمەشە باوەڕیانوایە مرۆڤ ئازادە چی لەبەرئەکاتو چی ئەخواتو ئەخواتەوە، چی ئەوێت ئەتوانێت بیکاتو هەرکاتێکیش بیەوێت بمرێت.. لەلای ئەمان خۆکوشتن ئەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی مرۆڤ و هیچ کێشەیەك نابینن لە خۆکوشتندا.

## فەلسەفەی ژیان لەلای شەیتان پەرستان

شەیتان پەرستەکان کۆمەڵێکن باوەڕیان بەخوداو رۆژی دوای نییە، هەروەها باوەڕیان بەپاداشتو بەهەشتو دۆزەخ نییە.. لەبەرئەوە یاسای بنەڕەتییان لەژیاندا بریتییە لەوەی زۆرترین ڕابواردنوخۆشی ئەنجام بدەن پێش مردنیان، هەروەك(لاڤی)جولەکە ئەڵێت:ژیان شەهوەتو ئارەزوو بینینە، مردنە کەبێ بەشمان دەکات لەخۆشییەکان، لەبەرئەوە، ئەم هەلە هەڵکەوتووە لەژیاندا، بۆ ڕابواردن، دوای مردن نەژیان هەیەو نە بەهەشتو دۆزەخ، سزاو خۆشی تەنها لێرەیە.

## سروتو پەرستشەکانیان

سروتی ئەم کۆمەڵەیە لەنێوان دوو شتدایە، یان سروتی سێکسی بێ ئەندازە تا ئەگاتە پلەی مەست بوون، یان سروتی خوێناوی کەلە سروشتی مرۆڤ دەرئەچن، بۆ ئاستێك کەوەسف ناکرێتو ئاسانترین کاریان لەوانەیە خواردنی خوێنی مرۆڤ بێت، وە گەورەترین

کاریان پێشکەش کردنی مرۆڤە (بەتایبەت منداڵ) دوای بریندارکردنیان یان داغ کردنیان بەئاگر، پاشان سەربڕینیان بۆ نزیك بوونەوە لە ئیبلیس(نەفرتی خودای لێبێت) پاشان نغرۆ دەبن لە شەهوەتێکی ڕیسواکەردا، پاشان کۆتایی ئەم سروتو پەرستشە ئەهێنن بە ئەنجامدانی سێکسی بێ سنوور.

نوسەری بەریتانی (جویا فرانکلین) باسی ڕێورەسمی (قەدیسی ڕەش )ئەکاتوئەڵێت: (قەدیسی ڕەش) لەنیوەشەوداو لە کەنیسەدا، هەڵئەسێت بە سەرۆکایەتی مالومێکی لەدین هەڵگەڕاوەو هاوکارە داوێن پیسەکانیو قوربانییەکیش ئەهێنن بە پاشەڕۆی مرۆڤ پیس ئەکرێت، مالومەکە جلی ڕەشی لەبەردایەو دەست ئەکات بەسوتاندنی مۆمە ڕەشەکان، لەگەڵ بەکارهێنانی ئاوێکی پیرۆز بۆ لەناوهەڵکێشانی ئەو منداڵە زۆڵانەی کە تازە لەدایك بوون.

پەیکەرێك ئەڕازێننەوە، بە کوندە پەپووو شەمشەمە کوێرەو بۆقو ئەو دروست کراوانەی کەزەرەرمەندن، ئینجا مالومەکە قاچی چەپی درێژ ئەکات بۆ پێشەوەو کۆنوێژی کاسۆلیکی ڕۆمانی بە پێچەوانەوە ئەخوێنێتەوە، دوای ئەوەی ئامادەبوان ڕۆئەچن لە ئەنجامدانی جۆرەها خورەوشتی خراپو هەموو شێوە لەڕێ دەرچوونێکی سێکسی لەبەردەم پەیکەرەکەدا.

(فرانکلین)ئەڵێ: بەدڵنیاییەوە زۆرێك لەخەڵکی ئەم سەردەمە کۆ ئەبنەوە بۆ ئەنجامدانی (قەدیسی ڕەش).

دادوەر(ایرشایر)ئەوەی دۆزیەوە کە لەسکۆتلەندە، لەسەدەی حەڤدەی زاینیدا لەکەنیسەیەکی چۆڵکراودا، کە پایەکانی ڕوخابوو، ئەنجام دراوە.. لەو بەڵگانەش کە دەست کەوتوون، (نوسخەیەك لە ئینجیلی شێوێنراو، شوشەی شکاوی مەیو وێنەی خاچێکی هەڵگەڕاوە کە لەسەر پەیکەرەکە کێشراوە).

لە ساڵی (١٩٦٣)ز یەکێك لەخانزادەکان چیرۆکێکی سێکسی بۆ گۆڤارێکی بەریتانی نوسی، دەربارەی (قەدیسی ڕەش) کە بەچاوی خۆی بینیبوی.

لە حەفتاکاندا شەپۆلێك فیلمی سینەمایی بڵاوبوەوە، لە ئەوروپاو ئەمریکا، کە باس لەهەڵسوکەوتی ئەمانە ئەکات، لەوانە ئەنجامدانی سێکس لەگەڵ شەیتاندا.

## شەیتان پەرستەکان و مۆسیقا

شەیتان پەرستەکان شاعیری تایبەت بەخۆیان هەیە، بۆ نووسینی ئەو ووشانەی کە شەیتان بەرز ڕائەگرێت و بۆ جنێودان بەخودای گەورەو هەروەها بۆنوسینی ئەو ووشانەی کە ئارەزووی پێ ئەجولێت، هەروەك چۆن ئاوازدانەری تایبەتیان هەیە بۆ گونجاندنی ئەووشانە لە گەڵ مۆسیقایەکی هاوارکەر، کە ڕیتمێکی خێرای هەیە. ئەو مۆسقایانەی کەشەیتان پەرستان گوێی لێ ئەگرن، پەیوەستە بەهەندێك تاوانەوە کە چەند لاوێك پێی هەستان و تەمەنیان لەنێوان(١٥-١٧)ساڵیدابوو، هەندێکیان چاوەڕێی لەسێدارەدانیان ئەکرێت، لەسەر ئەو تاوانانەی کە ئەنجامیان داوە، کۆمەڵە تاوانێك، کە مرۆڤ توشی ڕاچەنین ئەکەن.. شەیتان پەرستەکان بەم مۆسیقایانە ئاهەنگی گشتی سازئەکەن و گۆرانیەکانیان لەبازاڕدا بڵاو ئەکەنەوە، کە بانگەشەی تێدایە بۆ سێکس و کوشتن و خۆکوشتن.

## شەیتان پەرستان و سێکس

مەبەستی سەرەکی شەیتان پەرستان بریتییە: لە تێرکردنێکی تەواوی شەهوەت و ئارەزووەکانیان، لای ئەمان ئەنجامدانی سێکس بەهەموو شێوەیەك ڕێگە پێدراوە، بە شێوەی گونجاو یان نەگونجاو، بەشێوەی پەسەند یان ناپەسەند، تەنانەت لەنێوان هاوڕەگەزەکانیشدا، واتە: نێر لەگەڵ نێر، مێ لەگەڵ مێ، هەروەها چوونە لای ئاژەڵ، یان ئەجامدانی داوێن پیسی لە گەڵ لاشەی مردوودا، پەنا بەخودا!!

هەروەها زەوت کردنی ئافرەت و منداڵ بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانیان هیچ کێشەیەك نیەو ئەوانەی ئەم کارانە ئەنجام نەدەن بەکەسێکی نائاسایی دائەنرێن.. ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە باوەڕیان وایە هەموو ئافرەتێك دروست وحەڵاڵە بۆ هەموو نێرینەیەك، ئەگەر ئافرەتەکە مەحرەمیش بێت، وەك ئەنجامدانی داوێن پیسی لەنێوان کوڕو دایك، کچ و براو باوك، گومانی تێدا نیە کە ئیبلیس بە تەواوی زاڵە بەسەریاندا.

## چۆنیەتی ژیانی منداڵی شەیتان پەرستەکان

شەیتان پەرستەکان بەپێی پلانو تەرزێکی تایبەت منداڵەکانیان پەروەردە ئەکەن، هەر لەسەرەتاوەو لەهزریاندا ئەوە ئەچەسپێنن کە ئەم منداڵانە شەیتانن، وە شەیتانی گەورەیش پەروەردگاریانە، وەچەند ڕێگەیەك بەکارئەهێنن بۆ چاندنی ئەم بیروبۆچوونە لە هزری منالەکانیان.

بانمونەیەك وەرگرین لەم بارەیەوە: ئەویش دان پێدانانی کیژۆڵەیەکە، کە لەکۆمەڵی شەیتان پەرستان ڕایکردووە بۆ لای پزیشکێکی دەروونیو دەڵێت: دایكو باوکم لەشەیتان پەرستان بوون، بەردەوام ئەیاندا بەگوێمدا کە من شەیتانم، بەڵام لەشێوەی مرۆڤدا، پاشان گەورەبووەمو باوەڕم بەم قسانە هەبوو، ڕۆژێکیان بۆ ئەوەی هیچ گومانێکم بۆ دروست نەبێت پێیان ڕاگەیاندم کە ئاوێکی پیرۆز ئەرژێنین بەسەرتا، ئینجا شێوەی ڕاستی خۆت دەرئەکەوێت، چاوەڕێی ئەم ڕووداوەم ئەکردو ئارامم لێ بڕابوو، دوای چەند ڕۆژێك دایكو باوکم ئاوەکەیان هێنا، جلەکانیان لەبەرم داناو ئاوەکەیان ڕژاند بەسەر ڕوخسارو لەشمدا، دوای چەند چرکەیەکی کەم هەستم کرد بووم بە بڵێسەیەك ئاگرو لەهۆش خۆم چووەمو ڕوخسارو هەندێك شوێنی جەستەم توشی شێواوی بوو، دوای ئەوەی سەیری ئاوێنەم کردو دەموچاوی خۆم بەشێواوی بینی، زیاتر دڵنیابووم کەئەمە ڕوخساری شەیتانە بەڕاستی.. دوای ئەوەی گەورە بووم، زانیم کەئەم ئاوە پیرۆزە، لەڕاستیدا یەکێکە لەگیراوە ترشەڵۆکە زۆر سەختەکان، وەکو (ئەسید).

بەپێی ئەو ڕاپۆرتانە بێت کە پۆلیسی ویلایەتە جیاوازەکانی ئەمریکا لەعەیادە دەروونیەکانەوە کۆیان کردوەتەوە، ئەوە دەرئەکەوێت، لێکچوونێکی زۆر هەیە لەنێوان قسەی ئەوکەسانەی کەلە شەیتان پەرستەکان ڕزگاریان بووە. شەیتان پەرستەکان تەرزی جۆراوجۆریان هەیە بۆ کوشتنی هەستونەست لای ئەو منداڵانە وەك:

- پێدانی چەند دڵۆپێك لەماددە سڕکەرەکان بەمنداڵ.
- بەکارهێنانی خەواندنی موگناتیسی. (**التنويم المغناطيسي**).
- لێدانو دڵ ڕەقی بەرامبەریانو بەسووك تەماشاکردنیان.

- ❖ فێڵ کردن لەچاویان، کەچەند شتێکیان پیشان ئەدەن کەلەڕاستیدا نیە.
- ❖ کەنارگیرکردنیان بۆ ماوەیەکی زۆر، ئەویش بەدانانیان لەناو تابوت، یان سندوقێك کەدوور بێت لێیانەوە.
- ❖ پێنەدانی خواردنو خواردنەوە بەدرێژایی ڕۆژ.
- ❖ هەڵواسینیان بەدەست، یان قاچەکانیان.
- ❖ زۆر لێکردنیان بەلێدانی هەندێك ئاژەڵی زیندوو، بە چەقۆ یان خەنجەر، بۆ ئەوەی لەناخیاندا تۆوی دوژمنایەتی بچێنن‌و بەئاسانی بچنە ژێر ڕکێفیان.

## سڕینەوەی خوڕەوشت‌و نەریت لای منداڵان

منداڵەکانیان ناچار ئەکەن بە ئەنجامدانی داوێن پیسی‌و کاری خراپ، وەك: نێربازی (**لواطة**)و چوونە لای ئاژەڵ‌و بەشداری پێ کردنیان لەئاهەنگی سێکسی پڕهاواردا.

یەکەم جار منداڵەکە سەگێك یان پشیلەیەکی بچوکی ئەدەنێ، بۆئەوەی پەیوەندیەکی بەهێز لەنێوان منداڵەکەو ئاژەڵەکە دروست ببێت، ئەمەش بۆ ئەوەنیە خۆشی بخەنە دڵی منداڵەکەوە، بەڵکو بۆ هەڕەشەکردنە لە منداڵەکە، بۆئەوەی ئەم ئاژەڵە لەبەردەمیدا سەربڕن، ئەگەر ئەو کارە ئەنجام نەدات کە داوای لێ ئەکەن، لەبەر ئەوە دەستەمۆ دەبێت‌و جڵەوی بەدەست ئەوانەوە دەبێت.. هەندێکیان باس لەوە ئەکەن کەناچارکراون لەسەر خواردنی گۆشتی مرۆڤ، شتی بۆگەن، خواردنی خوێن، خەوتن لەقەبرسان بەشەو، ئەنجامدانی سێکس بەئاشکرا.....هتد.

## شەیتان پەرستان لە ڕۆژهەلات

واگومانمان ئەبرد کەشەیتان پەرستەکان تەنها لە ڕۆژئاوادا هەبن، بەهۆی ئەو بۆشاییە ڕوحییەی کە لە ناویاندا هەیە، لەگەڵ ئەو لادانەی کەلە ئاینەکەیاندا هەیەو بەهۆی پچڕانی پەیوندیان لەگەڵ خودای گەورەدا.

وامان هەست ئەکرد کە موسوڵمانان‌و ڕۆڵەکانیان دوورن لەو بەڵایە، بەڵام هەندێك ڕۆژنامە بەشێوەیەکی کت‌وپڕ پێیان ڕاگەیاندین، کە ئەم بەڵاو مەینەتیە بەسەر هەندێك ڕۆڵەی موسوڵمانیشدا هاتووە.

ڕۆژنامەی(**كل الأسرة**)ی لوبنانی ڕوداوی خۆكوشتنی هەرزەكارێكی ١٦ساڵی بڵاوكردەوە، بە ئاگرتێ بەردانی سەری خۆی، هەروەها دۆزینەوەی شتی هەڵواسراوو وێنەی ئەندامانی تیپی(ڕۆك)و چەند وێنەیەكی ئێسكەپەیكەر.. لەشیكردنەوەی سەرەتاییدا دەركەوتووە، كە ئەم لاوە پەیوەندی لەگەڵ یەكێك لەكۆمەڵە شەیتانیەكاندا هەبووە، بەڵام لەمیسری شوێنی ئەزهەرو ئیسلام، ئەم كارەساتە گەورەیە لە مانگی پیرۆزی ڕەمەزانی ١٤١٧ی كۆچی دەركەوت، كاتێك كۆمەڵێك لاو دەستگیر كران بەهۆی ئەم بیروبۆچوونە سەر لێ شێواوەوە خۆشەویستی خۆیان بۆ شەیتان دەربڕیوەو مەبەستیان نزیك بونەوە بووە لێی، لەبەردەم دادگاشدا دانیان بەم كارەدا ناوەو دادگاش تاوانباری كردونو موفتیش حوكمی هەڵگەڕاوەی دینی بەسەردا داون، بەڵام بەداخەوە ئەم مەسەلەیە داخراو تاوانبارەكانیش بەبێ هیچ سزایەك دەرچوون.

## هۆكارەكانی ئەم دیاردەیە

گومانی تێدا نییە ئەم بیرە پوچەڵە، كە لەنێوان هەندێك ڕۆڵەی موسوڵمانانو بەتایبەت لەمیسردا هەیە، هۆكاری هەیەو ئێمە لێرەدا هەندێكیان باس ئەكەین:

١. ڕاگەیاندنێكی بەربڵاوی ترسناك بەبێ هیچ بەندو كۆسپێك، پەرەپێدانی خەیاڵ پڵاوی، بڵاوكردنەوەی بیروبۆچوونی تێكشكاو، لە گۆرانی بێنابڕوو، هەروەها فیلمی ڕووهەڵماڵراو، كتێبو ڕۆژنامەی بەدڕەوشتیو دەست كەوتنیان بەئاسانیو بە نرخێكی كەم.

٢. سیاسەتی وشككردنی سەرچاوە ئیسلامیەكان، بچوك كردنەوەی ڕۆڵی بانگەوازخوازانو قەدەغەكردنی گەیشتنی بیروبۆچونە شەرعیەكان بۆ خەڵكی.

٣. تێكەڵاوی نێرومێ، كە هەموو وڵاتمانی گرتوومەتەوە، لەگەڵ ڕووتییەكی زۆرو نەمانی ڕەوشت.

٤. ئەو بانگەشەیەی بۆ ئازادی بیروبۆچوون ئەكرێت، لەكاتێكدا موسوڵمانان لێپرسینەوەیان لەگەڵ ئەكرێت، لەسەر نیەتی ناو دڵیان.

**يقاد للسجن من سَبَّ الزعيم ومن سَبَّ الإله فكل الناس أحرار**

## هێما شەیتانیەکان

ئاسان نیە هەموو ئەو کتێبو هێمایانەی کەشەیتان پەرستەکان بەکاری دێنن لەیەك جێگادا بخرێنە ڕوو، چونکە پێویستی بە جادو گەرێکی لێزان هەیە، کەشارەزایی تەواوی هەبێت لەزمانی سیحردا، چونکە پیتوهێماکان بە نهێنی نوسراونو جگە لەساحیرەگەورەکان کەسی تر شارەزا نین، گرنگترینیشیان ئەمانەن:

١- بازنەی جادوویی: لەرێوڕەسمی جادویدا بەکارئەهێنرێتو هێمایەکی جیهانیە بۆ سیحری ڕەشو سپی، بریتیە لەسەری بەرانێك کە هێمای شەیتان خۆیەتیو ئەم هێمایە ئەتوانرێت دەور بدرێت بەبازنەیەكو ئەشتوانرێ بازنەکەی پێوەنەبێ، کە ناسراوە بەبازنەی شەیتان، ئەم بازنەیە لەکاتی جەنگی جیهانی دووەمدا بڵاوبوەوە، کەبەرجەستەی ئەوبەڵگەنامەیە ئەکات، کە ئەتوانرێ لەگەڵ شەیتاندا ببەسترێو بەخوێن ئیمزا بکرێت.

٢- پێنج ئەستێرەیی: بریتیە لە هێمای بەرزبونەوەو پێشکەوتنو وێنەی خەیاڵاتی داهێنان ئەکێشێت، ئەم هێمایە لای ڕاگەیاندنەکان بەکاردەهێنرێت، هەروەها لەکاتی جادوگەریدا بەکاردەهێنرێتو لەم کارانەدا بەبەرزترین هێما دائەنرێت.

٣- مانگو ئەستێرە: دروشمێکی هاوبەشە لەنێوان ماسۆنیەتو شەیتاندا، هێمایە بۆ پەروەردگاری مانگ (دیانا)و پەروەردگاری خۆشەویستی(ڤینۆس).

٤- چاوی سێیەم (العين الثالثة): دروشمێکی هاوبەشە، لە نێوان ماسۆنیەتو شەیتان پەرستەکان، لەسەر دۆلاری ئەمریکی هەیە.

٥- ناوچەو شوێنی سێکسی: ئەم دروشمە هێمایە بۆئەوەی کەئەم شوێنو ناوچەیە تایبەتە بەرێوڕەسمی سێکسیو بەس.

٦- شوێنی قەدیسی ڕەش: خاچی ڕاستو چەپ، دروشمێکی هاوبەشە، لەنێوان نازیەکانو شەیتان پەرستەکان، هێمای خۆرو هەر چوارلای باکوورو باشوورو ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوای لەسەرە.

٧- بروسکە (هەورە تریشقە): دروشمێکی هاوبەشی نێوان نازیەکانو شەیتان پەرستەکانە.

٨- ئەستێرەی داود: دروشمێکی هاوبەشە لەنێوان جولەکەو شەیتان پەرستەکانو لەبواری جادوگەریشدا بەکاردێت.

## کوشتارگە ( قەسا بخانە )

بەزۆری لەمەرمەڕو گرانیت دروست ئەکرێتو چاڵێك لەناوەڕاستیدا هەڵدەکەنرێ، لەسەر شێوەی پێنج ئەستێرەییداو بازنەیەك بەدەوریدا هەیە، کەچەند ئامرازێکی وەك: خەنجەرو شمشێری دەسك ڕەشی پێوەیە، بۆ سزادانو پەرداغی لەزیو دروست کراوی لێیە بۆ خواردنەوەی خوێن.

## هەڵسو کەوتی نامۆ

نامۆترینو سەیرترین ڕێوڕەسمی کۆمەڵەی شەیتان پەرستەکان کەلە میسر دەرکەوتو ئەندامەکانیشیان دەست گیرکرانو سەرزەنشت کرانو یەکێکیشیان کە قوتابی بوو، ئەگێڕێتەوە کەهەستاون بە ڕێوڕەسمەکانیان، لەیەکێك لە پەرستگا کۆنەکانی ئەووڵاتەداو پاشان چونە بۆگۆڕستانێکو لاشەی مردویەکیان دەرهێناوە، هەروەها هەستاون بە سەربڕینی پشیلەیەك، یاخود سەگێكو ڕوخسارو دەستیان لە خوێنەکەی هەڵکێشاوەو لێشیان خواردۆتەوە. پاشان بەدەوری بازنەیەکدا سوڕاونەتەوە، بۆ ئەوەی شەیتان لێیان ڕازی بێت.. ئەگەر هاتوو ئەم ئاژەڵانەیان دەست نەکەوت، ئەوا دەستی خۆیان ئەڕوشێنن، تا خوێنی لێبێتو دوای ئەمەش ماددەی بێ هۆشکەر دەخۆنو لەسەر ئاوازی مۆسیقای (ڕۆك) هەڵدەپەڕن.

کارێکی تری نامۆ، کە ئەنجامیان داوە، کە لە فایلی لێکۆڵینەوەی شەیتان پەرستەکاندا هاتووە، بریتیە لە ڕۆیشتنی چوار گەنج لە شەیتان پەرستەکان بۆ گۆڕستانی (البساتین)و هەڵدانەوەی یەکێك لەگۆڕەکان بێ ئەوەی کەس پێیان بزانێ، پاشان چوونەتە ناوگۆڕەکەوەو هەریەکەیان لە سوچێکدا بۆ ماوەی چوار کاتژمێر ماوەنەتەوەو هەندێك ووشەو گۆرانییان وتووە کە یارمەتی دەرە بۆ ئامادەبوونی شەیتانو مامەڵە لەگەڵیدا، هەروەها کتێبێکی تایبەتیان بۆ پەرستنی شەیتان پێ بووە، کە لە ئەمریکاوە بۆیان هاتووە.

شەیتان پەرستەکان هەندێك وەسیەتیان هەیە، بۆ شوێن کەوتوانیان، لەوانە: سەربەستی تەواو بۆ مرۆڤ لە ئارەزووو شەهوەتو حەزەکانیاندا. شەیتان بەرجەستەی هەموو ئەوانە ئەکات کە پێیان ئەوترێ گوناهو تاوان، چونکە ئەبێتە هۆی تێربوونی عەقڵو سۆز، هەروەها وەسیەت ئەکەن بۆ ئەوەی کە شەیتان وەك ئازیزترین هاورێ وایە بۆ بەندەکەی، لەبەرئەوەی مانەوە بۆ ئەوە.(خودا بمان پارێزێو موسوڵمانانیش دووربخاتەوە)، ئەمە چ هاورێیەتیەکە لەگەڵ ئەو شەیتانەی دوژمنێکی ئاشکرای ئادەمیزادەکانەو بانگی کۆمەڵەکەی خۆی ئەکات تاببنە یاوەری لە دۆزەخدا .

## ئەو هۆکارانەی پێویستە ڕەچاوبکرێ لە پێناو خۆپاراستن لەشەیتان پەرستەکان

چەند هۆکارێك هەیە لەوانە:

١. بەهێزکردنی گیانی باوەڕداری لای گەنجان و تازەپێگەیشتوان.

٢. بەرپرسیاریەتی کەس‌وکار لەبواری پەروەردەیدا، هەروەها چاودێری منداڵەکانو بەئاگابوون لە ڕەفتارو کردارو خورەوشتیان.

٣. بەرەوباش بردنی دەزگاکانی ڕاگەیاندن، بە جۆرێك کە خراپەکاری بڵاو نەکەنەوە تانەبنە هۆی ڕووخانی نەوەیەك، لەژێر دروشمی ئازادیدا.

## وەسیەتی مەنار

ڕاسپاردەی مەنار، ئەو کیژۆڵەیەی توشی نەخۆشی ئایدزبوو، ڕاسپاردەی خۆی نوسیوە بۆ هەموو کچێکی لاوی موسوڵمان، بۆ ئەوەی لەسەر ئەو ڕێگەیەی ئەو نەڕۆنو ڕزگار بن لەوەی کە ئەمی تێکەوتووە... منیش بۆتانی ئەگێڕمەوە، سا بەڵکو بتوانم نامەی ئەم کیژۆڵە گەڕاوەیە بۆ دینتان بۆ باس بکەم.

بۆ هەموو ئەوکەسانەی خۆشەویستی ساختەو سێبەری ئارەزووی دڵەڕاوکێی شەیتان لەخشتەی بردبێ.. ئەمەش نامەکەیە بۆ گۆڤاری ( **شهد الفتيات**)ی ناردووە.

بۆ: نوسەران و بەرێوەبەرانی ئەم گۆڤارە پربەهاو قەشەنگە.. نازانم لەکوێوە دەست پێ بکەمو چۆن کۆتایی پێبهێنم؟! ساتەوەختی تاڵ بەرێ ئەکەم.... ناخۆشی لەناخمدا شەپۆل ئەدات.. ناخۆشترین قۆناغی ژیانم بەرێ ئەکەم، ئەگەر نامەکەم بخوێننەوە، بێ گومان

ناخۆشیو نەهامەتیەکانم ئەزانن‌و نهێنی ناو دڵم ئاشکرا ئەبێت.. ئەبێت هێزی خۆم کۆبکەمەوە، بۆ ئەوەی نەهامەتی‌و دەردەسەری ئەسرینەکانی خۆم بنوسمەوە..

دوای ئەوەی بابەتێکم خوێندەوە، کە لە ژمارە پێنجی گۆڤارەکەتاندا بڵاو کرابۆوە بەناونیشانی(ئایدز لە سعودیە....هۆکارو ڕاستیەکانی).. ئەم بابەتە چەندێك هەژاندمی؟! لە کاتی خوێندنەوەی ناونیشانەکە، کە لەسەر بەرگی گۆڤارەکە نوسرابوو، باوەڕم وابوو کە مەبەستتان لە من بێت.

بەڵێ.. نازانم چۆن چوار نوسخەم بەبێ ئاگاداری کڕی، سا بەڵکو ناوم بدۆزمەوە لەبابەتەکەدا.

لاتان سەیر نەبێت‌و سەرتان سوڕنەمێنێت، کە من توشی نەخۆشی ئایدز بووم‌و چاوەڕێی ساتەوەختی دوایین ماڵئاوای ئەکەم، نەخواردنم هەیەو نەخواردنەوە، هیچ خۆشیەك نازانم، جگە لە نزیك بوونەوە لەخودا. لە بێ ئاگاییدا ئەژیم، جگە لەو کاتانەی بەبەردەوامی دوعا ئەکەم‌و ئەپاڕێمەوە، کە خودا بەبەهەشتم شاد بکات، سا بەڵکو ژیانی دوایم لەبەهەشتدا بێت‌و ئەو ئاسوودەییەم بێتە دی کە بەدوایداوێڵم.....

بەڵێ.. من توشی ئایدز بووم، لەوانەیە تاقی کردنەوەیەکی خودایی بێت، بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ ڕێگەی ڕاست‌و ڕەوان. هۆکاری توش بوونم بەم نەخۆشیە باس ناکەم، چونکە خۆم بەخەجاڵەت ئەزانم لەم بارەیەوە بدوێم‌و من لەگەنجانی موسڵمان بم.

بگەڕێنەوە بۆلای پەروەردگارتان.....

بزانن هەموو شتێك کۆتایی دێت، پێویستە لەسەر لاوان کەدوور کەونەوە لە ڕابواردنی حەرام، دوورکەونەوە لە سەرپێچی کردنی خودای گەورە.

بەڵێ، داواتان لێ ئەکەم ئاوڕ بدەنەوە لە دینەکەتان، ئاوڕ بدەنەوە لەکەس‌و کارتان، لەهاوسەرەکانتان، دڵنیابن کە هەرکەسێك لەبەر خاتری خودای گەورە، واز لەشتێك بهێنێت، بێ گومان خودای گەورە تۆڵەی بۆ ئەکاتەوەبە شتێکی باش تر.

لاوانی ئیسلام......... ئاگادار بن.....

دەست گرتنتان بەم دینەوە ڕێگای ڕزگاریتانە.....

دوعام بۆبکەن، دوعام بۆ بکەن، بە میهرەبانی لێ خۆشبوون.....

خوشکی ئامۆژگاریکەرتان (مەنار)

## پیرۆزە! کچەکەت دوو گیانە

ئەویش یەکێکی ترە لەقوربانیەکانی خۆشەویستیو شەیتان، کیژۆڵەیەکە لەهەرمتی لاوێتیدایە، شوی کردووە بەکوڕی مامەکەی، ئەویش ستەمکارو دڵ ڕەق بوومو هیچ هەستو شعورێکی بەرامبەری نەبووە، هەروەها مەیو مەشروب خۆربووە، کاتێکیش داوای تەلاقی کردووە دەستی کردووە بەلێدانی .

تەلاق کۆتایی هات، دوای ئەوەی تەنها شەش مانگ پێکەوە بوون، جیا بوونەوە لەیەکتر، بەڵام دوو گیان بوو بە کۆرپەلەیەك لە ئامۆزاکەی، پاش ماوەیەك ئەو خۆشییەی لێ تێك چوو، کە بەهۆی جیابوونەوەی لە مێردەکەی بەدەستی هێنابوو، بەهۆی مامەڵەی خراپو دڵ ڕەقانەی خێزانەکەیەوە (واتە ماڵی باوکی)، بۆیە پەیوەندی کرد بەیەکێك لەهاوڕێ کانیەوە، بۆ ئەوەی هاوخەمی بێتو کەمێك لە ناخۆشیەکانی کەم کاتەوە، بەڵام پەیوەندی بەخودای پەروەردگارەوە نەکرد.

کاتێك پەیوەندی بەهاوڕێ کەیەوە کرد، لەژمارەکەیدا هەڵەی کردبوو، بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکات، گەنجێك وەڵامی دایەوەو پێ ی ووت: هەڵەت کردووە لەپەیوەندیەکەتدا.

ئەم گەنجە ئەم هەلەی قۆستەوە، بۆ دووبارە پەیوەندی کردن بەم ئافرەتەوە، دەستی کرد بە قسەی فریو دەر، بۆ هەڵخەڵەتاندنی ئەم ئافرەتە .

دڵەکان یەك ئەبینن‌و لەگەڵ یەکدا ئاشنا ئەبن، پاشان بۆ ڕۆژی دوایی پەیوەندی پێوە کردەوە، تا ئەهات پەیوەندیەکانی زیاتر ئەکرد لەگەڵیداو هەواڵی هەڵبەستراوو درۆی پێدەدا، لەبارەی هەندێك لەو شتانەی کە لەژیانیدا توشی هاتووە، بەتایبەت لەبارەی ئەوەی کە ژنەکەی تەلاق داوەو ئێستا بەدوای ژنێکدا ئەگەڕێت کە دڵی شاد بکات.

ئەمە چ بەڵایەکە کە هەردوکیان هەمان دەردەسەریان توش هاتووە.. دڵی کچەکە لێی ئەدا بۆی، قسەی لەگەڵیدا نەرم بوو، ئافرەتەکەش لەگەڵ بەردەوامی پەیوەندیەکاندا ناخۆشیەکانی خۆی بۆ ئەگێڕایەوە. لەگەڵ ڕۆیشتنی ڕۆژگارو پەیوەندیە یەك لەدوای یەکەکاندا، ئەو ووشانەی باسی خەم‌و پەژارەیان تێدابوو، گۆڕا بۆ وشەی خۆشەویستی‌و شەیدایی‌و ئەوین‌و دڵداری.

ڕۆژێکیان پێی ووت: پێی خۆشە مارەی بکات، بەتایبەت، کە ئەو ئەو ئافرەتەیە ئەم چاوەڕێی ئەکات، داوای کرد بیبینێ‌و ئەمەی بۆ هاتە دی، دوای ئەمە پەیوەندیان بەهێز تربوو، تەنانەت هەندێك لە ئاڵتونەکانیشی پێدا، بۆ ئەوەی هەندێك لەقەرزە درۆیینەکانی پێ بداتەوە.

هەرکەسێك ئەهات بۆ داوای، ڕەتی ئەکردەوە، بە هیوای ئەوە بوو ئەو شەیتانە داوای بکات، هەتاوەکو منداڵێکی بوو ناوی بەناوی دڵدارەکەیەوەنا.

دوای ماوەیەك پەیوەندی پێوەکردو بۆی ڕوون کردەوە، کە ئەیەوێ داوای بکات، بەتایبەت کە ئێستا ئەتوانێت مارەییەکەی بداتێ، داوای کرد کە ئەیەوێت بیبینێ‌و بچن بۆ بازاڕو ڤاتێك‌و ئەڵقەیەکی بۆ بکرێت، ئافرەتەکەش یەکسەر ڕازی بوو. پاشان چوون بۆ باڵەخانەیەکی نیشتەجێ بوونی ئامادەکراو.. کاتێك ڕۆیشتن داوای کرد ڤاتەکەی تاقی بکاتەوە، لەجێگایەکی حەرام‌و هاوڕێ لەگەڵ سەیرکردن‌و چاوتێبڕینی شەیتان، بەڵێ شەیتان سێیەمیان بوو. گومانت چیە بەدوو کەس سێ یەمیان شەیتان بێت؟!

پێشبینی چی ئەکەیت لەنێوانیاندا؟

بێگومان داماڵینی ئیمان.. پاشان سەرپێچی خودای گەورە کرا.. داوێن پیسی کرا لەگەڵ ئەو ئافرەتە پاکەدا، پاکی‌و پوختەییەکەی لەناوبراو و داخکرا بەناگری سزا.

ئالەم کاتەدا، لەخەوی بێ ئاگایی خەبەری بووەوەو هەستاو هاواری کردو گریا... بەڵام بێ سوودبوو.. کەڵکی نەبوو، داوای کرد بیگەڕێنێتەوە بۆ ماڵەوە، خەم‌و تاڵی ئەنۆشی، پیاوەکە بەڵێنی پێ ئەداو پێنج شەممە لەدوای پێنج شەممە دەستی دەستی پێ ئەکرد، ئافرەتەکە مانگ لەدوای مانگ چاوەڕێی ئەکرد، بەڵام ڕووناکی مانگی نەبینی، لەگەڵ ئەوەی مانگەکەی ئەبینی، تاوای لێهات ئافرەتەکە پەیوەندی پێوەئەکردو پیاوەکە لەدەستی ڕای ئەکرد، تاوەکو بەدەنگێکی بەرزوتوند بە ئافرەتەکەی ووت:

باش گوێم بۆ بگرە: ئافرەتێکی هاوشێوەی وەکو تۆ ناگرێت ببێتەخێزانی من، چونکە بەهیچ شێوەیەك متمانەت پێ ناکرێت‌و تکائەکەم ئەمە دواپەیوەندی نێوانمان بێت‌و تەلەفۆنەکەی داخست.. لەگەڵ بیستنی ئەم قسەیەدا، ئافرەتەکە لە هۆش خۆی چوو، ڕووپۆشکراوەکە دەرکەوت، لەکوێیە ووشە شیرینەکانی خۆشەویستی؟ کوا سۆزو بەزەیی؟ کوا

ئەو بەڵێنانەی لە پەیوەندیە تەلەفۆنیەکاندا بە ئافرەتەکەی ئەدا؟ کوا ئەو جل‌وبەرگانەی بەڵێنی دابوو لەکاتی بوکێنیدا بۆی بکرێت؟

بەم شێوەیە مایەوەو مانگ‌و نیوێك لەسەر جێگا کەوت، لەبەر توندی بارودۆخەکە، وای لێهات ڕقی لەژیان بوو، بەڵکو ڕقی لە منداڵە بچوکەکەشی بوو، چونکە ناوی ئەو بێ وەفایەی بیرئەخستەوە.. کاتێك چاك بۆوەو هەستی بەحەسانەوە کرد، ڕۆژێکیان تووشی سەرگێژبوون ودڵ تێکهەڵهاتن بوو، لەهۆش چوو، باوکی بردی بۆ نەخۆشخانەیەکی بچوك، دوای تەواوبوونی پشکنینی پزیشکی، هەواڵێك وەکو هەورە بروسکە لە باوکی بدات وابوو، کاتێك پزیشکەکە بەباوکی ووت: پیرۆزە.. پیرۆزە.. کچەکەت سکی هەیە، ئالەم کاتەدا دنیا لەپێش چاوی باوکی تاریك بوو، بیروهۆشی شڵەژا، زمانی بەسترا، لە سەرسوڕمانا نەیزانی چی بڵێت‌و چۆن هەڵس‌وکەوت بکات.

لەکوێ کچەکەم سکی پڕە، کە مێردی نیە؟! بەڵام بەسەر خۆیدا زاڵ بوو داوای لەپزیشکەکە کرد کە ئەم هەواڵە بەکچەکەی نەڵێت.

باوکی کە دڵی وەك ئاگرێك بڵێسەی ئەدا، هەر لەگەڵ گەیشتنی بۆ ماڵەوە ئەیویست ئەو ئاگرە دابمرکێنێتەوەو لەژورێکدا یەکسەر ئەم هەواڵەی بەکچەکەی ووت، چونکە دڵی ئارامی نەگرت ئەم هەواڵەی تێدابێت .

کچەکە کاتێك ئەم هەواڵەی لەباوکی بیست، توشی شڵەژان بوو، زمانی لەقسەکردن وەستا، سەری خوێنی تێزا، گریانێکی تاڵ گرتی، توشی سەرسوڕمان بوو، باوکی لێیداو بەسەریدا هاواری کرد: چۆن سکت پڕبووە، ئەی داوێن پیس؟چۆن سکت پڕبووە، ئەی سۆزانی؟ بەڕاستی پێم بڵێ: چۆن سکت پڕبووە؟

ئینجا هەواڵی بەباوکیدا کە پەیوەندی چۆن بووە لەگەڵ ئەو پیاوەدا...

باوکی کاتێك ئەو قسانەی بیست خۆی پێ نەگیراو کەوتە لێدانی بەشەق‌و پیاکێشان، چونکە کچەکەی ناموسی فرۆشتووە بەشەیتان.. کچەکەش هاواری ئەکردو ئەگریاو ئەپاڕایەوە کە لێی ببورێ‌و لەترسی باوکی ڕایکردو بەرەودەرگاکە هەڵهات، تا بۆی دەرچێ، باوکی بەمە شێت گیربوو..پارچە ئاسنێکی هەڵگرت، کە لە تەنیشتیەوە بوو، تێی گرت‌و کێشای بەسەری کچەکەیداو یەکسەر کەوت‌و بورایەوە، خوێن لەسەری ڕۆیشت...

لەم كاتەدا براكەی هاتە ژوورەوە، خوشكەكەی بینی كەوتووەو خوێن لەسەری ئەڕوات، بەخێرایی گەیاندیە نەخۆشخانەو چەند پشكنینێكی سەرەتایی بۆ ئەنجامدراو پیشانی پزیشكی تایبەتیان دا، دەركەوت توشی پچڕانی دەمارێك بووە، كە لكاوە بەچەقی ئەو بینینەی كە لە دەماغیدا هەیەو چاوی بەتەواوی لە دەست داوە!!

بەهۆی لێدانی باوكی یەوە كوڕەكەی سكیشی مرد.

ماوەی دە ڕۆژ لەنەخۆشخانە مایەوەو پاشان دەرچوو، بەڵام بەكوێری، هیچی نابینی‌و دارێكی بەدەستەوە بوو، وەك ڕێ نیشاندەرێك، لەماڵەوەیش وەكو مردوو لەسەر جێ یەكەی ئەمایەوە. خەم لەهەموو لایەكەوە دەوری دابوو، خەفەتیش هەموولایەكی گرتبوو.

هەموو شتێكی دۆڕاند...باوكی لەدەست چوو.. منداڵە بچوكەكەی ناوسكیشی لەدەستدا.. منداڵی یەكەمیشی بەهۆی ڕووداوێكەوە مرد.. كاتێك ئەو قسەیەی باوكی بیردەكەوتەوە، خەم‌و خەفەتەكانی زیاتر ئەبوو، كە بەبە ردەوامی بە كچەكەی ئەوت: خودایە بەدەستی خۆم بیخەمە گۆڕەوە.. خودایە بەدەستی خۆم بیشارمەوە لە خۆڵدا، بۆ ئەوەی نابرووچون‌و ڕیسواییەكەی لەگەڵدا بشارمەوە.

دوای ئەمە براكەی خزمەتی ئەكرد، لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا مامەڵەی لەگەڵ ئەگۆڕا، هەتا تێگەیشت چی لە پشت ئەم ڕووداوەوە هەیە.. داوای لەبراكەی كرد بیبات بۆ یەكێك لەو شوێنانەی كە چاودێری پەككەوتەو بەساڵاچوان ئەكەن، بۆ ئەوەی ئەو تەمەنەی كەماویەتی لەوێ بەسەری بەرێت، چونكە لەوێ یەكێك ئەبێت چاودێری‌و خزمەتی بكات.

ئەو هاوڕێیەی كە ئەم چیرۆكەی گێڕایەوە ئەڵێت: لە هەموو نوێژێكدا ئەپاڕایەوەو ئەیوت: خودایە تۆڵەی من لەو بێباوەڕە بكەیتەوە، ئەی پەروەردگار.

## كیژۆڵەیەك لە ( پاڵ تۆك )دا بە ڕوتی ئەمرێت

بەخودای گەورە نازانم لەكوێوەو چۆن دەست پێبكەم؟! زەوی لەژێر پێمدا ئەسوڕایەوە، لاشەم گەرم بوو، نەخۆش كەوتم، خەم‌وخەفەت ئەوەی هێنا بەسەرمدا كەهێنای، دوای ئەوەی ئەو هەواڵەم بیست كە ئەگەر بخرێتە سەر شاخێك خاپوری ئەكات، ئەگەر تێكەڵ بە ناوێكی ڕوون‌و سازگار بكرێت لێڵی ئەكات، ئەگەر یەكێك لەپێشینەكانی ئێمە بیبیستایە،

ئەوا ئەو تەمەنەی کە لەژیانیدا مابوو، لە کڕنوش بردندا بەسەری ئەبردو داوای لێبوردنو پاشەڕۆژ باشی لەپەروەردگاری ئەکرد.

لە ١٤٢٤/١١/١٧کۆچی، کاتژمێر سێی شەو، لە سێ یەکی کۆتایی شەودا، لەشاری ڕیاز، کیژۆڵەیەکی تەمەن بیست ساڵ بەناوی (س.ح)، بەڕوداوێك مرد، کەبەرد نەرم ئەکات.

ئەم کیژۆڵەیە خۆی جوانو ئامادەنەکاتو هەڵئەستێ بەسەماکردن، لەبەردەم شاشەی کامێرای کۆمپیوتەرە تایبەتەکەیو وردو درشتی جەستەی نمایش ئەکات.. پاشان بەبێ جلوبەرگو بەبێ شەرم دائەنیشێ، داماڵراو لەهەموو ڕەوشتێك، بەرامبەر ڕێژەیەکی کەمی پارە لەبەردەم کۆمەڵێك لاوی بێئابڕودا، ئەو لاوانەی گورگ ئاسانو ڕەوشتیان دۆڕاندوە، ئەوانەی کە نازانن چاکەو خراپە کامەیەو لەپەراوێزی ژیاندا ئەژین، لە یەکێك لە پێگەکانی (پاڵ تۆك)ی بۆگەندا.

کتوپڕ لە ساتێکی کەمداو لەبێ ئاگاییەکی ناکاودا، لەبەرچاوی هەمووانیدا ئەو کچە کەوتو ڕووداوەکە ڕوویدا، چیرۆکی کۆتایی دەستی پێ کرد، فریشتەی گیان کێشان، گیانی کێشاو ئەمیش جەستەی نمایش ئەکردو ئەندامانی شەرمی دەرئەخست، لەبەردەمی کامێرای کۆمپیوتەرەکەیداو بڵاوکردنەوەی لەڕێگەی ئینتەرنێتەوە.. بێگومان سەرخۆش بوو بەشەرابی شەیتان، بەئاگا نەهاتەوە هەتاوەکو مرد..

ئێستا ئەو مردووە بەبێ تواناو هەوڵو هێز.. بێ گومان مردوو کۆتای پێهات!

بوو بەلاشەیەکی خامۆش، جگە لە ڕۆحی، هەموو جەستەی جێگیر بوو، بەڵام ڕوحی بەرزبۆوە بۆ لای خودای گەورە. بەڕاستی ساتێکی ترسناکە بۆ ماڵئاوایی، لەکاتی ماڵئاوایدا چاوی لەسەر باوك ودایکی نەبوو، چاوی لەسەر قورئان خوێندن نەبوو، لە دواین ساتیدا خەریکی بانگەوازو چاکە کردن نەبوو، خۆزگە لەساتێکی ئاسایدا بمردایە، وەك چۆن زۆربەی خەڵکی ئەمرن..

پەروەردگار پاکیو بێگەردی هەر بۆتۆیە..

خودایە بەو شێوەیە ئەمان پەرستوی کە پێویستە بتپەرستین، خودایە لەسەر گوێ ڕایەڵی خۆت جێگیرمان بکە تاوەکو ئەگەین بە لیقای خۆتو تۆش ڕازی ئەبیت لێمان.. خۆزگە ئەم کچە بە لێدانی ئۆتۆمبیل بمردایە، یاخود لەئاودا بخنکایە، خۆزگە بەئاگر بسوتایە یان خانوی بەسەردا بڕوخایە.. خۆزگە وابوایە، چونکە کارەکە بەئاسانی

ئەڕۆیشت، بەڵام ئەو کچە لە ئانوساتی خراپەو تاواندا لەدنیا دەرچوو، خۆزگە تاوانەکەی تەنها خۆی بیزانیایەو بەس، خۆزگە لەماڵی خۆیدا پەردەی بەسەر ئەو تاوانەدا بدایە. بەڵام لەبەردەم خەڵکانێك ئەم تاوانەی ئەنجام ئەداو چەندان کەسی سەرگەردان ئەکردو ئەیهێنانە سەر هەوەس‌و ئارەزوو، ئەم کەسانە سەرمەست بوون بەجوانییەکەی‌و شەهوەت‌و ئارەزویانی ئەبزواندو دایئەگیرساندن.....

دوای ئەمە بەشەرمەزاری مرد.. بەڵێ.. مرد!!

لە دایك بوو، پەروەردەکراو ژیا تابمرێ..

بەڵێ بەڕووتی کەوت، دوای کاتێکی کەم لاشەجوانەکەی گۆڕا بەلاکێکی بۆنکردووی پیس، هیچ دروستکراوێك هاوشێوەی نەبوو، ئێسکی کلۆر بوو، پێستیشی کرم تێیدا، بەڵام ڕوحی بەدەست ئەو فریشتانەوەن، کە توندو تیژن‌و بێ فەرمانی خودا ناکەن‌و ئەوەی خودا فەرمانیان پێ بدات ئەنجامی ئەدەن..

بێگومان مرد!! ئەم ووشەیە چەند بەهێزە لەسەر دڵەکان، سوێند بەخودا بە شێوەیەك ویژدان ئەجوڵێنێت کە هیچ دیمەنێك ناتوانێت ئاوا بیهەژێنێت‌و بیبزوێنێ!

هەموو کتێب‌و فەرهەنگەکانی زمان‌و ڕەوانبێژی نەیانتوانی یارمەتیم بدەن بۆ وێنە کردنی ئەو ساتە پڕ مەترسی‌و تۆقێنەرە، تەنها یەك ووشە لەوانەیە هەستێت بەم کارە ئەویش وشەی: مردنە!! ئایا ئەزانن مردن چیە؟!

بەڕاستی تەنها ڕاستیەکە، کە ئێمە کردومانە بەوەهم‌و خەیاڵ، بەڵام دڵنیاییەکە، کە گومانی تێدا نیە، لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا بۆتە گومانێك کە دڵنیایی تێدا نیە، بەڕاستی ساتێکی یەك لاکەرەوەیە، کاتژمێری نەهامەتیە، کە ڕاستی تێدا بەدەرنەکەوێ‌و ڕووناکی دڵنیایی تێدا بەدی ئەکرێ.

بەڵێ.. بەرێ کرا بەرەو لای پەروەردگار، لەگەڵ خۆیدا دواین ساتەکانی مەستی‌و بێ ئاگایی برد . ئەو بێ ئاگاییەی بوو بەئازارو داخ‌و پەشیمانی، بەڵام لەکاتێکدا پەشیمانی سودی نەبوو..!

بەڕاستی سەرەمەرگ‌و گیان کێشان یەخەی پێ گرت، ڕوحی بەرەو لای پەروەردگار بەرز بوەوە، سەفەری مەینەتی‌و دەردەسەری دەستی پێ کرد، لەدوای ساڵانێك لە گاڵتە جاڕی‌و

بێ ئابڕوویی، کاتی یاریو بەزمو ڕابواردن بەسەرچوو، تاڵییەکەی مایەوە، ئێستا خۆراکی کرمو چاڵێکی تاریکە، کارە چاکەکانی کەمو بێ نرخن.

دەنگە خۆشەکەی کپو بێدەنگ بوو، چاوە سیحر ئامێزەکانی داخران، لەشو لاری لەجوڵە کەوتن، ڕوحی مایەوە بۆ ناخۆشیو نەهامەتی لە گەشتێکدا کە لێوان لێوە لە نامۆییو غەریبی، هیچ هاودەمو هاوڕێیەك نییە، جگە لەکردەوەی باش.

کاتێکی ترسێنەرو دڵتەزێنە، کەپیاوچاکان لێی ئەترسنو لە پێناویدا چاکە ئەکەنو داواکارن لەو ساتەدا لە کڕنوش بردنو پاڕانەوەدا بن، یان لەگردو دۆڵێکدا بەشەهیدی سەربنێنەوەو ڕێزدار بن.

بەڵام ئەم کچە دێت تا بەشی خۆی لەدەردەسەریو تەنگو چەڵەمەوەربگرێت.. بەڵێ.. لە حاڵەتی ڕووتو قوتیو بێ ئابڕوییدا، لەحاڵێکدا مرۆڤ شەرم ئەکات باسی بکات.

ئەم کارەی ئەنجامدا، لەکاتێکدا سێ یەکی شەو تێ پەڕیبوو، ئەوکاتەی کە دەنگی کەڵەشێرەکان بەرز ئەبنەوە بۆ بانگ کردنی بەندە چاکەکان، بۆ خوداپەرستیو پاڕانەوە لەپەروەردگار.

بەڵێ.. ئەوانەی لەخودا ئەترسن، ڕائەپەڕنو جێ یەکانیان بەجێ ئەهێڵنو ڕوو ئەکەنە خۆشۆرینو دەست نوێژو بەرماڵو نوێژکردن، پاشان ئەچنە کڕنوشو بەملکەچیەوە ئەپاڕێنەوەو داوای یارمەتی لەخودا ئەکەن.

فرمێسك لەچاویاندا قەتیس ئەمێنێت لەترسی خوداو حەزکردنیان بۆ بەهەشتو پەنا گرتنیان بەخودای پەروەردگار لە دۆزەخ.. ڕائەپەڕن لەخەوو گوێ ڕایەڵی خودا ئەکەنو دڵەکانیان پڕ ئەبێت لەڕووناکیو کامەرانیو شادی.. خودای پەروەردگاریش نازو نیعمەت ئەڕژێنێت بەسەریاندا، ئەمە کاتی خوداپەرستیە، کاتی میهرەبانیە، کاتژمێری مل کەچیو کڕنوشو گریانە، لاإله إلا الله ئەم کاتە چەند خۆشو پڕ سۆزو پایە بەرزیە، دڵەکان بەیادی خودا دێنە جۆشو شەیدای لیقای خودا ئەبن، جەستەکان ئیسراحەت ئەکەن. لەشوێنی عیبادەتەکانیان تەنها فرمێسکی بەخوڕ ئەبینی، ناوچەوانێکی ڕووناکی کڕنوش بەرو ئەژنۆی ماندوو، بەهۆی زۆریوەستان لەشەونوێژدا .

کەسانی خوداناس ئەچنە خەڵوەتو موناجاتی پەروەردگاریان ئەکەن، ئەندامەکانی جەستەیان ئەلەرزێت، کاتێك تاوانەکانیان بیردەکەوێتەوە، بەردەوام داوای لێ خۆشبوون لە

خودا ئەکەن‌و پەشیمانی دەرئەبڕن، تاوانەکانیان ئازاریان ئەدەن، یادی گەورەیی پەروەردگاریان ئەکەن‌و هێمن‌و ئارام ئەبنەوەو پاشان یادی سزای خودای گەورەی بەبیردێتەوەو ئەلەرزن‌و ئەشڵەژێن.

## پاکیزەییم لەدەستدا، سەرەتاش لەنەخۆشخانەوە

پێش ئەوەی چیرۆکەکەم بنوسم، زۆر زۆر دوودڵ بووم، لەبەر شەرمەزاری‌و خەجاڵەتیم لەوکارەی ئەنجامم دا.

بەڵام ئێستا هەموو هێزی خۆم کۆدەکەمەوەو چیرۆکەکەم ئەگێڕمەوە، تاوەکو هەموو لاوێك بیخوێنێتەوەو نەفس‌و ئارەزووەکانیان بەرەو هەڵدێریان نەبەن.

من کیژۆڵەیەکی تەمەن بیست‌و دوو ساڵم، ئەم ڕووداوەم بەسەرهات پێش ساڵێك، خۆزگە تەمەنم بوەستایەو ئەم ڕووداوەم بەسەرنەهاتایە خۆزگە هەر لەدایك نەبومایە، ساڵێك بەسەر ئەم ڕووداوەدا تێپەڕیوەو هەمووڕۆژێك کاتێك لەخەو هەڵئەستم خەم‌و خەفەت دامئەگرێ، بەهۆی ئەم ڕووداوەوە، کە خۆم بەسەرخۆمم هێنا.. بەڕاستی ماندوو بووم لەگلەیی‌و سەرزەنشت کردنی خۆم.

ڕۆژێکیان دایکم نەخۆش کەوت، منیش بردم بۆ نەخۆشخانە، نەمزانی بەرەوکۆتایی لەناوچوونی خۆم ئەچم، چوینە بەشی فریاکەوتن، من جل‌و بەرگی باڵاپۆشیم لەبەردابوو بەشێوەیەك کەجێگەی سەرنج نەبووم. کت‌و پڕ گەنجێکم بینی زۆرسەرەنجم نەدا، لەگەڵ دایکم چوومە ژورەوەو چەند پشکنینێکمان بۆی ئەنجام دا.

لەبەرئەوەی ئەم بەشەی فریاکەوتن تایبەت بوو بەئافرەتان ڕووپۆشەکەم (نقاب) لە سەر دەم‌و چاوم لابرد، کاتێك ئێمە چاوەڕێی ئەنجامی پشکنینەکەمان ئەکرد، یەکسەر دەرگاکە کرایەوە، بینم هەمان گەنجی پێشوو بوو، نەمتوانی چاوم لەناستیدا دابخەم، یان ڕووپۆشەکەم بدەمەوە بەڕوخسارمدا، بەڵکو سەیر کردنەکەم زۆر بەجۆش بوو بۆی، چونکە گەنجەکە زۆر جوان بوو، چەند جارێك سەیری یەکترمان کرد، توانیم دایکم بخافڵێنم‌و پێش دەرچوونمان لە نەخۆشخانە ژمارەکەی وەربگرم.

ڕاوێژ دەستی پێ کرد، ڕاوێژی دۆزەخیانە، لە قسەی یەکەمدا پێی ووتم: ئەمەوێت شووم پێ بکەی..

پێم‌ووت: چۆن ئەبێت کە تۆ هیچ لەبارەی منەوە نازانی؟!

وەڵامی دامەوەو ووتی: کەسەرسامم بەباڵاپۆشیەکەت، وەئەوەی سەرسامیەکەمی زیادکردووە بینینی چاوەکانتە!

نازانم ڕاستگۆبوو یان نا؟ قسەکانی کاری تێکردم، بەڵکو سیحری لێ کردم بە دەستەواژەو دەربڕینەکانی.

پەیوەندی نێوانمان بەردەوام بوو، تاوەکو داوای لێکردم لەگەڵیدا بچمە دەرەوە، هیچ دوو دڵ نەبووم چونکە متمانەیەکی کوێرانەم پێی هەبوو، چەند جارێك دەرچووین پێکەوە، جارێك لەگەڵیدا ڕۆیشتم بۆ ماڵی خۆیان کەلەسەردان بوون، جارێك بۆماڵی خوشکەکەی، جارێکی تر بۆیەکێك لەو شوقانەی گەنجان بەکرێی ئەگرن، منیش جل‌وبەرگی پیاوم لەبەرکرد، لەکراس‌و دیزداشەو عەگال، لەگەڵیدا چوومە ژوورەوە بەبێ ئەوەی کەس هەستمان پێ بکات. ڕۆژێکیان لەگەڵیدا دەرچووم، زۆر جوان خۆم گۆڕیبوو، چووین بۆ ماڵی خوشکەکەی، نەمزانی هەموو شتێك لەدەست ئەدەم.. ژیانم.. شەرەفم.. پاکیم.. شەرم‌و حەیام..گەوهەری ژیانم، ئەویش گەوهەری هەموو کیژۆڵەیەکە، کەشانازی بەکەرامەتیەوە بکات لەگەڵ پاکیەکەیدا، بەڵام من زۆر بەئاسانی لەدەستم دا.

هەرچەندە ئەو گەنجە بەرپرسیار بوو، بەڵام من زۆر زیاتر بەرپرسیارێتم لەسەر شان بوو، چونکە ئەو نەیئەویست بگاتە ئەو ڕادەیە، بەڵام من لەخشتەم بردو شەیتانیش کارەکەی لەبەرچاومان جوان کردو توشی تاوانێکی گەورە بووین کە بریتیە لە زیناو داوێن پیسی!!

دوای ئەمە پەشیمانی‌و شەرمەزاری دەستی پێکردو ووتم: ئەی خودایە چی بکەم؟ پرسیاری زۆر بەبیرمدا ئەهات‌و ئەچوو، هەتا هەستم کردوەکو شاخێك بەسەر سەرمەوە بێت، هەفتەیەکی نەبرد ئەم گەنجە لەگەڵ کەس‌و کاری هاتن بۆ داوام، زۆر دڵخۆش بووم‌و باوەڕم نەئەکرد، بەڵام خەتای کەس‌وکاری خۆم بوو.. کەس‌و کارم ئەو گەنجەیان قبوڵ نەبوو، لەگەڵ گریان‌و تکاکردنم بەڵام ڕازی نەبوون.. ئەو گەنجە بێ هیوا نەبوو، چەند جارێك لەگەڵ کەس‌وکاریدا هاتنەوە بۆ داخوازیم، بەڵام کەس‌و کارم بەهیچ شێوەیەك ڕازی نەبوون، بەتایەت برا گەورەکەم هەڕەشەی لێ کردو ووتی: ئەگەر جارێکی تر بێتەوە خراپی بەسەر ئەهێنم.

ئەم گەنجە لەژیانی مندا نەماو منیش مامەوە لەگەڵ زەلیلیو نەنگی خۆمدا.. هەتاوەکو کەی؟ نازانم!

ئێستا دوو دڵ ماوم نازانم چی بکەم؟زۆر کەس هاتنە داوامو نەم توانی ڕازی بم بەو شێوەیە...

ئەبێت هەر ڕازی بم بەڵام نازانم ئەوکاتە چی بکەم، چیرۆکی نەهامەتیم کۆتایی نەهات.. دوای ئەم ڕووداوە بۆ ماوەی هەشت مانگ بە ڕاڕاییو بیروهۆشێکی ئالۆزەوە مامەوە، جارێکی تر لەگەڵ گەنجێکی تردا تێکەوتم، دوای ئەوەی ڕوداوو بەسەرهاتی خۆمم بۆ گێڕایەوە، ووتی: ئەتوانم یارمەتیت بدەم، زۆر دڵخۆش بوومو بڕوام نەئەکرد جارێکی تر بۆژیانی سروشتیو ئاسایی خۆم بگەڕێمەوەو کەرامەتم بۆ بگەڕێتەوە، بەڵام نەمزانی ئەمە گورگێکەو ئەیەوێت هەڵم خەڵەتێنێتو فێڵم لێ بکات.

جارێك پێی ووتم: ئەتبەم بۆ نەخۆشخانەیەكو دکتۆرێك ئەناسم ئەتوانێت یارمەتیت بداتو بە نەشتەرگەریەکی بچوك کە تەنها نیو کاتژمێر ئەخایەنێت، ئەگەڕێیتەوە بۆ سروشتی جارانت.

باوەڕم بەقسەکانی کرد، لەبەرئەوەی من هیچ شتێکم دەربارەی ئەم شارە نەئەزانیو شارەزا نەبووم. زۆر دووری خستمەوە لەشار، پاشان زانیم جگە لەگورگێکی برسی زیاتر هیچی تر نیە، نەمزانی چی بکەم!؟ هاوارم کردو زۆر پاڕامەوەو گریام کە وازم لێ بێنێ ... بەڵام ئەو زۆر پێ داگری کرد، تەنها بەرەنگاربوونەوەم لەبەردەمدا ماو زۆر بەتوندی بەرەنگاری بوومەوە، ئەویش زۆر بەتوندی لێیدامو جلوبەرگەکانی دڕاندم، کەزانی ناتوانێت دەستم لێبدات، ناچار گەڕاندمیەوە بۆ شوێنی خۆمو ئەو ڕۆژە وەکو مردوو وابووم.

لەکۆتاییدا بۆم دەرکەوت چارەسەر تەنها لای خودایەو گەڕانەوەیە بۆ لای ئەو، پاشان پەنام بردە بەر خوشکەکەم لەم دەردو بەڵایەداو تەنها خودا ئەزانێت چیم بەسەر هات.

ئەی خوشکەکانم ئەمە ئامۆژگاری منە بۆ ئێوە: پارێزگاری لەو گەوهەرەی خۆتان بکەن، چونکە گەوهەرێکت هەیە بەرامبەر هەموو سەروەتو سامانی دونیایە.

بەڵای گەورەترو کارەسات ئەوەبوو چەندان جارویستم خۆم بکوژم، بەتایبەت کاتێك سەیری دایکە هەژارەکەم ئەکەم، ئەزانم گومانی پاکیو ڕەوشت بەرزی بەکچەکەی هەیە،

بەلام نازانێت من خیانەتم لەو متمانەیە کرد، کە کەس‌وکارم پێمیان هەبوو، خۆم پێ نەگیرا لەبەرامبەر لەزەت‌و ئارەزووە درۆینەکاندا، ئێستا من لەماڵەوەم، بەلام نازانم هەتاکەی؟! تەنها خودای گەورە ئەزانێت‌و بەس.

## فاتینه (گومڕا)

ناوی فاتینه (گومڕا) بوو، وەکو ناوەکەی وابوو، چاونەترس‌و ئازادو خاوەن متمانە لەهەموو شتێکدا تەنها لەئاینددا نەبێت، گرنگ لەلای ئەو ئەوەبوو دڵێکی باشت هەبێت، ئیتر قەیناکە تێکەڵاوی کێ ئەکەیت، چی لەبەر ئەکەیت‌و چی ئەکەیت.

شەوێك هاوڕێکانی کۆئەکاتەوە بۆ ئاهەنگی جەژنی لەدایك بوونی، جەژنێك کە خودای گەورە بۆمانی دیاری نەکردووە، بەڵکو لەبێباوەڕانەوە بۆمان ماوەتەوە، وەك چاولێکەری‌و لاسایی کردنەوە.

(هەرکەسێك خۆی وەك نەتەوەیەك لێ بکات‌و لەوان بچێت، ئەوا لەگەڵ ئەواندا حەشر ئەکرێت) پەنا بەخودا!! بێ گومان (فاتینه) لە جوانترین شێوەو جل‌وبەرگدا خۆی گۆڕی بوو، بەدەوری هاوڕێکانیدا ئەسوڕایەوە، پێکەنین لێرەو لەوێ بەرزئەبۆوەو لە هاوڕێکانی پرسی: کچەکان ئەزانن ئاهەنگەکەمان لەچی کەمە؟ بەچەند وەلامێك وەلامیان دایەوە.

ووتی: نا، سوور بوو لەسەر پرسیارەکەی.. پاشان خۆی وەلامی دایەوەو بەپێکەنینەوە ووتی: لە(**علیاء**)ی پیرێژنی کەمە، دەنگی قاقای پێکەنین لە هەمووولایەکەوە بەرزبوەوە.

یەکێکیان وەك بەرگریەك ووتی: ئەم هەموو گاڵتە پێ کردن‌و پێکەنینە چیە؟ ئەی (**علیاء**) هاوپۆلی هەموومان نیە؟! ئایا ماوەیەك لەمەوبەر هاوڕێمان نەبوو لەبەزم‌و ئاهەنگی شەوانەماندا‌و خودای گەورە هیدایەتی دا؟! ئافەرین بۆ ئەو ئێستا لەدوانگەی نوێژو قورئاندایەو ئێمەیش لە بێ ئاگایی‌و نەفامیداین! ئێمە دوای چی کەوتووین؟ ئەو دوای ڕۆژی دوایی کەوتووە.. بۆ پرسیاری ئەکەن!؟

یەکێکی تر ووتی: ڕۆیشتوین بەدوایدا، بۆ ئەوەی بانگی بکەین بۆ ئاهەنگەکە، بەلام بیانوی هێنایەوەو ئامۆژگاری‌و وانەی پێشکەش کردین‌و دەربارەی ڕەوشت‌و ئاین‌و خووو نەریتی کۆمەلایەتی بۆمان دوا .

(فاتینە )ووتی: (**علیاء**) ساویلکەیە! پێشتر ژیرو ئازاد بوو، پێش ئەوەی گەوجی ئەم ئاینە توشی ببێتو لەناوماندا بیفرێنێت، پەنا بەخودا! پاکوبێ گەردی بۆ خودا! دین بوومتە گەوجیو شێتی!!

(فاتینە) لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو ئەیووت: بەڕاستی (**علیاء**) ساویلکەیە! زۆر بەزوویی هەڵگەڕایەوەو هزری تێکچوو، جلوبەرگەکانی درێژکردووەو شێوەو ڕوخساری وەك پیرێژنو گوندنشینەکان وایە، لەوەش خراپتر قژی بوومتە کاڵایەکی حەرام لەژێر ئەو سەرپۆشە ڕەشە داپۆشراوەدا!

(**علیاء**) لەبیری چووە کە تەنها دڵ لای خودا گرنگە، ئەوانی تر هەمووی دیمەنو رووکەشنو هیچ نرخێکیان نیە.

پاشان فاتینە بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی لەبارەی (**علیاء**)ەوەو ووتی: ئەو ئەمان ترسێنێ بەوەی کە خودا ئەو شوێنانەی لەشمان ئەسوتێنێ کە دامان نەپۆشیوە، ئەو ئاگادارمان ئەکاتەوە لەشتێك کە ناوی مردنە، لەشتێکی تر ناوی ئەنێ لێپرسینەوەو حسابوحەشر... کچەکان گوێ بگرن ئەو بەرپرسیارێتی لە خشتەبردنی لاوانو فریودانی پیاوان ئەخاتە سەرشانی ئێمە.

یەکێکیان ووتی: بەڵێ.. وەسوەسەو بیرکردنەوە (**علیاء**)ی کوشتوە! لەبیری چوەتەوە کەپیاوان بۆ ئێمەو ئێمە بۆ پیاوان دروست بووین.... (**علیاء**) ساویلکەیە لەکوێ گەنجێکی وەك خۆی دەست نەکەوێت؟ لەکوێ هاودەمیو بەختیاری دەست نەکەوێت؟ خۆی کوشتوە بەم دینەوە، ئەو لەترۆپکی لاویدایە، ئەبێت کارێك بکەین بۆ ڕزگارکردنی .

پاشان دەنگیان لێ بەرزبۆوە... ئەبێ فریای کەوین.. ئەبێ فریای کەوین .. پێش ئەوەی خۆی بکوژێت بە عیبادەتو مانەوەی لەماڵەوە.. نەبازاڕێك، نەئاهەنگێك، ئەمە چ تێگەیشتنێکی هەڵەیە بۆ دین، بەڕاستی ژیان ڕابواردنو خۆشیە، بەڵام ئێمە ئێستا لەکوێینو مردن لەکوێیە؟!

بەڵێ: ئەمرین کاتێك کە پیروپەککەوتە ئەبین.

ئاهەنگ کۆتایی هاتو حەوت ساڵ تێپەڕی، (**علیاء**) زانکۆی تەواو کرد، بەڵام چی بەسەر فاتینەدا هاتو چیش بەسەر(**علیاء**)دا هات؟ وەرن لەگەڵمو گوێم بۆبگرن تا بەدوای

چیرۆکەکەدا بڕۆین بەڵام لەشوێنێکی ترەوە، لە نهۆمی چوارەمی یەکێك لەنەخۆشخانەکان، لەیەکێك لەژورەکاندا دەنگی ناڵەی نەخۆشێك بەرز ئەبوەوە، ئەم دەنگو ناڵەیە چەند مانگ بوو بەردەوام هاواری ئەکرد، پزیشکەکانیش بێ هیوا بووبوون لێی، کەس نەیئەتوانی هیچی بۆ بکات، پەرستارەکان بەردەوام گوێیان لەئاهو ناڵەو نزولەی بوو، تاوەکو شەوێکیان پزیشکێکی تازە هات بۆ نەخۆشخانەکەو بەژوورەکاندا ئەسوڕایەوەو کتوپڕ گوێی لەدەنگو ناڵەیەك بوو نەیتوانی فەرامۆشی بکات، هەندێك دەرمانو ماددەی هێورکەرەوەی بردوو چووە ژووری نەخۆشەکە، دەرگای کردەوە، ئافرەتێکی بینی لەسەر قەرەوێڵەیەك کەوتبوو وەکو بێ هۆش وابوو، لێدانی دڵی تاقی کردەوە زۆر بێ هێزبوو، خەریك بوو لەلێدان ئەکەوت، هەناسەی هێواشو شێواو بوو.. لەتەنیشتیەوە دانیشتو هەندێك دەرمانی بوژێنەرەوەو هێورکەرەوەی پێداو پاش کەمێك بەئاگا هاتەوەو ڕاست بوەوەو بەچواردەوریدا چاوەکانی گێڕاو پاشان چاوەکانی لەسەر پزیشکەکە ئۆقرەی گرتو بەدەستە لاوازەکانی چاوەکانی هەڵ گلۆفت..پاشان زیاتر شێواو واقی وڕماو بەپزیشکەکەی ووت: پێم بڵێ تۆ کێی؟وەك ئەوەوایە تۆ بناسم، تۆ کێی؟

پزیشکەکە ووتی: من پزیشکم دایکەکەم .

نەخۆشەکە ووتی: من پرسیار دەربارەی ناوەکەت ئەکەم نەك پیشەکەت، پرسیارت لێ ئەکەم توخودای گەورە تۆ(**علیاء**) نیت؟ بەڵێ تۆ(**علیاء**) ی؟!

پزیشکەکە بە سەرسوڕمانەوە ووتی: بەڵێ من(**علیاء**)، پاشان نەخۆشەکە باوەشی پێدا کردو نوساندی بە سنگی یەوەو ماچی کردو دەستی بەگریان کرد.

(**علیاء**) زیاتر سەری سوڕماو ڕاچەڵەکیو لەدڵی خۆیدا ووتی: ئەبێت ئەم نەخۆشە کێ بێت؟ ئایا ئەبێت شێتی لەگەڵدا نەبێت؟ بەڵام چۆن منی ناسی؟! پێشتر دەرمانم پێ نەداوەو ئەمە یەکەم شەوەمە لەم نەخۆشخانەیە!

پاشان (**علیاء**) بیری لەڕابردوو کردەوەو سەیری نەخۆشەکەی کردو نەیئەزانی چی بکات.. پرسیاری لەنەخۆشەکە کردو ووتی: ئایا پێشتر یەکمان بینیوە؟

نەخۆشەکە بەدەنگێکی تاساوەوە وەڵامی دایەوەو ووتی: بەڵێ چەندین جار یەکترمان بینیوە، لەوەتەی تووشی ئەم نەخۆشیە بووم کە بۆ ماوەی سێ ساڵ ئەچێت ناوو وێنەکەتم

لێ جیا نابنەوە. ئای (**علیاء**) من بووم گۆشتەکەتم ئەخواردو گاڵتەم پێ ئەکردی، من (فاتین)ەی هاوڕێتم، پاشان دای لە قوڵپەی گریان‌و ناڵە.

(**علیاء**) سەری سوڕماو نەیتوانی قسەبکات، باوەڕی نەئەکردو ووتی: توخودا تۆ(فاتینە)ی؟! مەحاڵە!

(فاتینە) بەدەنگێکی کزۆڵ‌و پچڕپچڕەوە ووتی: بەڵێ من بووم کە ڕۆژێك پێیان ئەوتم (فاتینە گومڕا)..

(**علیاء**) داچەمیەوەو باوەشی پێداکردو دەستی بەگریانێکی زۆر بەکوڵ کرد، پاشان (فاتینە) کەوتە گێڕانەوەی چیرۆکی حەوت ساڵ لەمەوبەری‌و ووتی: بەکالۆریام تەواو کردو هەوڵم دا درێژە بەخوێندن بدەم بەڵام نەمتوانی.. من لەهەموو شتێکدا مل هوڕو یاخی بووم، گومانم لەخودای گەورە نەبوو، بەڵام باوەڕم وابوو کە خودا تەنها داوای ئەوەی لێکردووم کە دڵم باش بێت‌و بەس..

زۆر کوڕو کچی گەنجم ناسی، پاشان پەیوەندیم بە پیاوێکەوە کرد، کە لەڕێی کارەکەمەوە ناسیم.. پەکترمان خۆشویست. بەڵام لەژیانێکی بێ ئاگایدا ئەژیاین، دوور لەپەروەردگار، دوای هاوسەرگیری خودای گەورە منداڵێکی جوانی پێداین ناوم نا(سەوسەن)، بەناوی ئەو هاوڕێیەمەوە کەتۆش ئەیناسیت، پاشان ئازارێك لەسکمدا پەیدا بوو، چوم بۆ لای پزیشکەکان‌و ووتیان: ئەوە (قورحە)یە، چارەسەرم بەکارئەهێنا بەبێ سود، ئازارەکانم سات لەدوای سات زیادیان ئەکردو خەم‌و خەفەتیشم زیادی ئەکرد، بەڵام من بەبێ ئاگایی ئەمویست پشت گوێی بخەم، تەندروستیم زۆر خراپ بوو، پشکنین (فحص) م بۆ هاتەوە کە ئەیووت سەرەتای کیسێکی پیس لەگەدەمدا هەیە، بەم شێوەیە (قورحە) گۆڕا بۆ شێرپەنجە، پاشان شێرپەنجەکە زیاترو گەورەتر بوو، هەتا لە پێی خستم‌و ئالێرەدا کێبەرکێی ئازار ئەکەم‌و چاوەڕێی مەرگ ئەکەم. کچەکەم ئێستا چوار ساڵانەو چوار مانگە نەم بینیوەو پیاوەکەم دووهەفتە ئەبێت نەهاتووە بۆ لام، بەڕاستی ماندوو بووە لەسەردان‌و هاتوچۆم.. لەوانەشە بێزارو وەڕس بوبێت لێم، (**علیاء**) کاتێك گوێی لەم قسانە بوو خۆی پێ نەگیراو دایە قوڵپەی گریانێکی بەکوڵ، پاشان چووە تەنیشتی (فاتینە)وەو گوشی بەسنگیەوەو دڵی ئەدایەوەو ئارامی ئەکردەوەو پێی ووت: دان بەخۆتدا بگرە (فاتینە)، دان

بەخۆتدا بگرە، من تۆ ئەناسم ئازاو بەهێزی، بێ هیوا مەبە لەبەزەیی خودا.. بێ ئومێد مەبە، بەڵکو خودای گەورە شفات بدات، لەوانەیە ئەمە تاقی کردنەوەی خودایی بێت، خۆت بدە بەدەست قەزاو قەدەری خوداوەو ئارام بگرە، ئارام گرتن جوانترین شتەو خودای گەورە لەگەڵ ئارام گران دایە.

(فاتینە )هێور بوەوەو ئەیووت: پەروەردگار لێبوردنت .. پەروەردگار لێبوردنت .. تەنها تۆم هەی، ئایا پەسەندم ئەکەی، خودایە بەزەیت .. بەشکو تاقی کردنەوەبێت .. نەخێر ئەمە تۆڵەیە، بەڕاستی تۆڵەی ئەوکەسانەیە، کە گومڕاو سەرلێشێواوم کردن.

(**علیاء**) ئەمە تۆڵەیە، چەندێ خۆم گێل ئەکرد، لەقسەکانی دایکم، خودایە چەندان گەنجم گومڕا کرد، چەند کیژۆڵەم توشی خراپەکاری کرد!! پاشان ئەم ووتەیەی دووبارە دەکردەوە: مردن لێم نزیکبەرەوە.. مردن لێم نزیکبەرەوە.. چونکە خەیاڵ پڵاو بووم‌و وامزانی مردن تەنها گەورەو پیرەکان ئەباتو واز لەگەنج‌و جوانەکان ئەهێنێت! نەفس‌و شەیتان فێڵیان لێکردم، هیواخوازی لەخشتەی بردم.

پاشان پرسیاری لە(**علیاء**) ئەکرد: ئایا ڕاستە گۆڕ تاریکە؟! ئایا ڕاستە گۆڕ تەنگەبەرە؟! خۆی وەڵامی ئەدایەوە: بەڵێ، ڕاستە، پاش کەمێکی تر من هەڵئەگرن بەرەو گۆڕستان بەلاشەیەکی ساردوسڕەوە، کەس لەگەڵما نامرێ، نەکەس‌و کارو خۆشەویستان، نەماڵ‌و نەجل‌و بەرگم لەگەڵدا ئەبێت، هاوسەرو هاوڕێی لێ نیە!! ئەی خودایە چۆن جیاببمەوە لەئازیزەکەم (سەوسەن)، من هێشتا تەمەنم کەمەو تامی ژیانم نەکردووە!!

پاشان قژی گرت‌و ووتی: ئایا ڕاستە تۆ تاڵ بەتاڵ‌و موو بەموو لە گۆڕدا هەڵدەوەرێی؟! ئینجا دەستی بۆ چاوی بردو ووتی: بەهۆی ئێوەوە ڕووناکیم ئەبینی، چەند گەنجم بەتەماشاکردن لە ڕێ لادا، ئایا ڕاستە کرم ئەتان خواو هەڵتان ئەکۆڵێ؟! (**علیاء**) لەباوەشی گرت‌و نوسانی بەسنگی یەوەو قورئانی بەسەرا ئەخوێندو ئەپاڕایەوە، کە خودا شیفای بدات‌و پێی ئەووت: (فاتینە) بەسە، (فاتینە) بەسە، بێ هیوا مەبە لەبەزەیی خودا، بێ نومێد مەبە لەچارەسەرو شیفای خودا.

(فاتینە) ووتی: (**علیاء**) توخودا ئەبێت خودا لێم خۆشبێت؟ بێ گومان ئەوەی توانیومە لەخراپە کردوومە.

(**علیاء**) بەمتمانەوە ئەیووت: چۆن لێت خۆش نابێت؟!(فاتینە) ئایا خودا لێبوردنی فراوان نیە؟ ئایا ئەم ئایەتەی قورئانت نەبیستووە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ قُلْ يَـٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ الزمر. واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ: خودا ئەفەرموێت: (ئەی بەندەکانم ئەوانەی خۆتان گوناهبار کردووەو هەڵەتان زۆرە، نا ئومێد مەبن لەڕەحمەتی خودا، چونکە ئەگەر ئێوە تەوبە بکەن، خودا لەهەموو گوناهەکانتان خۆش ئەبێت، چونکە ئەو خودایە زۆر بەسۆزو میهرەبانە).

(فاتینە) ووتی: توخودا (**علیاء**) ئیتر لەمەو دوا بانگم مەکە (فاتینە)، پێم بڵێ ستەم کار (ظالمة)، بەڵێ: ستەمکار، بێ گومان ستەمم لەخۆم کرد، ستەمێکی زۆر...

پاشان بەتوانایەکی سەیرەوە (فاتینە) ڕاست بۆوە لەسەر جێگەکەی‌و دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە، لەبەر بێ هێزی ئەلەرزی‌و بەشەرم‌و ڕێزەوە لە خودا ئەپاڕایەوە: خودایە بەشایەد بە من گەڕامەوە بۆلات‌و پەشیمانم، ئێستا لەبەر دەرگای تۆدا کەوتووم.

هەرچەندە پزیشکەکان شکست خواردوو و بێ توانا بوون، بەڵام خودایە لای تۆ ئاسانەو گران نیە، ئەگەر شیفات بۆ نوسیوم، ئەوا بەشایەد بە ئەی خودای دانا هەرگیز لەفەرمانت دەرنەچم، وەئەگەر مردنت کردووە بەنسیبم بەم زووانە، ئەوا بەشایەد بە کە نائومێد نیم لەڕەحم‌و بەزەیت، بێ هیوا نیم لە لێخۆشبوونت، ئەی خودایە ستەمم لەخۆم کرد، ستەمێکی گەورە، خودایە کەس وەکو تۆ لێخۆشبوو نیە، بەڕاستی تۆ بەخشندەیت.....

## بیۆمژنیك

بانگ خوازێك باسی ئافرەتێکی بۆ کردم تەمەنی سی‌وشەش ساڵ ئەبوو، سێ منداڵی هەبوو، سێ ساڵ زیندانی کرا بەهۆی هەڵەیەکی ماوە کەم‌و زوو تێپەڕەوە، بەڵێ دەست گیرکرا، بە تۆمەتی کاری داوێن پیسی، ئەمەش بەڕاستی جەرگ تەزێن‌و فرمێسك ڕژێنە بۆ ئەم ژنە، چونکە دایکی سێ منداڵەو گەورەکەیان تەمەنی نۆزدە ساڵە.

ئەم ژنە پیاوێکی زۆر دەوڵەمەندی هەبوو، کە بەرووداوی ئۆتۆمبیل مردبوو، کاتێك کە مێردەکەی زیندوبوو هیچ داوایەکی ئەم ژنەی رەت نەدەکردەوە، لەدوای مردنیشیماڵو موڵكو خانوبەرەیەکی زۆری بۆ جێهێشتبوون.

چەند ساڵو مانگ تێپەڕی ئەم ئافرەتە منداڵەکانی بەچاکی پەروەردە دەکردو چاودێری ئەکردن. کوڕە گەورەکەشی کاروباری ماڵەکەی رائەپەڕاند، ماڵو سامانەکەشیان لە ژێر چاودێری مامیاندا، کە پیاوێکی باش بوو، بەڕێوەدەچوو.. لەگەڵ تێپەڕبوونی چەند ساڵێك دایکەکە چوونەدەرەوەی زۆر بوو، جا بەهۆ یان بەبێ هۆ، هەتاوەکو بووە قوربانی دەستی پیاوێكو لەخشتەی بردو لەبێ ئاگایدا پاکیو کەرامەتی لەکەدار کرد، بەبێ ئەوەی منداڵەکانی پێی بزانن، بەرێگەیەکی گوماناوی پەیوەندی لەگەڵ ئەو پیاوەدا دروست کرد، پەیوەندیان بەتەواوی بەهێز بوو، پەیوەندیەکی ناشەرعی.. پەیوەندیەکەیان بوو بەشتێکی رۆژانە، لەرێگەی تەلەفۆنو نامەی مۆبایلی شەیتانییەوە، بەناوی ئەوەی کە ئێمە گەورەینو چاکەو خراپەی خۆمان ئەزانین.

من دەڵێم: ئەم ئافرەتە ئەیتوانی رێگەیەکی تر هەڵبژێرێتو مافی پیاوەکەشی بپاراستایە لەدوای مردنی، ئەویش ئەوەیە کە بەرێگەی شەرعی شووی بکردایە، نەك رێگەی خراپەکاری بگرێتەبەر بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی.. شاعیر راستی ووتووە کە دەڵێت:

هەندێك برین بە تەواوی سارێژ دەبێت

هەندێکی تریان بەدەرمانیش سارێژ نابێت

رۆژانی یەکتر ناسینیان بەرەو دەریای ئارەزووو ئاگری بردن، پیاوەکە زۆری لێکرد لەگەڵیدا دەربچێت بۆ دەرەوە، ژنەکەش لاواز بوو لەبەردەم حەزەکانیدا، چەند جارێك چاویان بەیەك کەوتو چاوپێکەوتنەکەیان زۆر بوو هەتا توشی خیانەتی نەویستراو بوو..!

ئەی خودایە ئەم دایکە چی کرد؟ ئەتوانێت چی بەمنداڵەکانی بڵێت؟چۆن ئەم لادانە چارەسەر بکات، خۆی ئەم بەڵا گەورەیەی بەسەرخۆیدا هێنا، بەڵایەکی گەورە، تاوانێکی مەزن، پارێزەری تاوانەکانیشی تەنها خودایە، ئەم پیاوە پاکیزەییو داوێن پاکی ئەم ژنەو مافی مێردومنداڵەکانی لەکەدار کرد.

بەراستی بەوشەی درۆو بەڵێنی رووکەش ئافرەتەکەی دیل کرد، کە جگە لە بێ هۆشیو وێنەی سێکسی لەناوبەرو چیرۆکی رووتی خراپ، هیچی تر نەبوو..

ئەم دایکە دەست گیرکراو کەلەپچە کرایە دەستی‌و تاڵی‌و ناخۆشی زۆری چەشت، خەم‌و خەفەت‌و ئازارەکانی چوونە بینە قاقای..

مامی منداڵەکان ئەم ڕووداوەی پۆشی بۆ براژنەکەی‌و بیانوی ئەهێنایەوە بۆ زیندانی کردنی براژنەکەی لای برازاکانی، چونکە بۆ منداڵەکان زیانی هەبوو نەك سوود.

ئەمەش پەردەهەڵماڵین بوو نەوەك شاردنەوە، ئەگەر نا ئەم دایکە چی بەمنداڵەکانی ئەڵێت؟ منداڵەکانی ئەبێت چی بکەن؟ ئەی هۆی ڕاستەقینەی زیندانی کردنی دایکیان چیە؟ ئایا دایکمان تاوانبارەو شایستەی زیندانی کردنە؟

بەڵێ.. ئەمانە کۆمەڵە پرسیارێکی سەرسام کەربوون، کەوەڵامێکی یەکلاکەرەوەی نەدەدا بەمنداڵەکان، لەسەردانی هەفتانەی منداڵەکاندا بۆ لای دایکیان ئەم ئافرەتە تەنها ئاخ‌و داخ‌و خەفەت بەشی بوو، کاتێك ئەوان ئەهاتن‌و ئەمیش زیندانیە.. دایکی ئەتووت لەڕووخساری منداڵەکانیدا پرسیاری هۆی زیندانی کردنی دەخوێنێتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا لەسیماو ڕووخساری ئەم دایکە تۆبەکارەدا خۆشی ئەبینرا، بەڵێ گەڕایەوە بۆلای خودای گەورە، ئەو خودایەیەی پاراستی لەدرێژەدان بەم تاوانە، کەسەر سپی ئەکات‌و بەرگە گرتنی زۆر قورسە.

ئەم دایکە کاتژمێرو چرکەی ئەژمارد تاکاتی سەردانی منداڵەکانی نزیك ئەبۆوە، لەگەڵ دڵەڕاوکێیەکی بەردەوامدا لەترسی ئەوەی نەوەکو منداڵەکانی هۆی زیندانی کردنەکەی بزانن، ئەمە سەرەڕای پەرۆشی مناڵەکان بۆ بینینی دایکیان‌و بەردەوام یادی قسەکانی دایکیان ئەکردەوەو خەم‌و خەفەتیان ئەخوارد، بۆ ئەوماوەیەی کەبەبێ دایکیان بەسەریان بردووە، فراوانی ماڵەکەیان ئێستا تەسك بوەتەوە بەبێ دایکیان، گوڵی ماڵەکەیان،وشك بووە، لەیادگاریەکان هیچی نەما، جگە لەبۆنە خۆشەکەی، مانای خۆشەویستی لەدڵی مناڵەکان پوکایەوە، زەردەخەنەکان هیچی نەما، جگە لەفرمێسکی بەکوڵی پرسیاری: دایکمان بۆ زیندانی کرا؟ تاوانەکەی چیە؟ کەی لەزیندان دێتەوە؟ کەی ئەگەڕێتەوە ناومان؟ بەڵکو بەم زووانە بگەڕێتەوە، چونکە دایکەو دەریایەکە لەخۆشەویستی، کە کۆتایی نایات ئەگەر گوناهێکیش بکات، تاڤگەیەکە لە میهرەبانی، کە ناوەستێ بەهۆی گوناهو تاوانێکەوە.

هۆ خەڵکینە بەڕاستی من تاوانم ئەنجام دا، هاتم بۆ زیندان‌و ئاگری تاوانەکەم چواردەوری داوم‌و برژاندومی‌و ئاگری برینی ناو دڵم ئەم مرێنێ، بەردەوام چاودێری

کاتژمێرئەکەم، تەنانەت مردنی تێدا ئەبینم‌و ئارەزووی مردن ئەکەم‌ڕۆڵەکانم بینینتان چارەسەری دڵم ئەکات‌و چاوەکانم ساڕێژ ئەبن، لەدڵمدا بۆ ئێوە خۆشەویستی‌و تامەزرۆیی هەیە، لەگەڵ سۆزوخۆشەویستی کەدڵنەوایم ئەکات. ڕۆڵەکانم کاتێك سەردانیم ئەکەن باڵندەی خۆشی لەنزیکمەوە ئەنیشێتەوە، کاتێك ئەتانبینم ئەسرینەکانم ئەسڕم، تاوەکو نەیانبینن، هەتا خەو ئەمباتەوە فرمێسکەکانم ئەسڕم، کەکاتی خودا حافیزی نزیك ئەبێتەوە، بەهیوای چاوپێکەوتنێکی ترم کە بتانبینمەوە، دەی ئێوەش بەزمیتان بەدڵی بەئاگا هاتومدا بێتەوەو سەردانی دایکتان بکەن‌و بەدووریتان مەم کوژن، ئێوەش ئەی خزمان: دایکایەتیم فەرامۆش مەکەن بەهۆی تاوانمەوە.

## خۆشەویستیەکی ڕووکەش

ئەمیش کیژۆڵەیەکی ترە کەپەیوەندی بەگەنجێکەوە ئەکات‌و لەکۆتایدا بەرەو خراپەی ئەبات‌و پاشان وازی لێدەهێنێ بەپیسی‌و ئەنگیەوە. بەردەوام ئەگەڕێت بەدوایدا هەتا ئەیدۆزێتەوە. بیرکردنەوە لەتۆڵە ئەبێتە بەشێکی گەورە لەژیانیدا، چۆن چۆنی تۆڵە لەو کەسە بکاتەوە کەشەرەفی لەناو برد، کچێنی شکاند، درۆی لەگەڵ کردو پاشان وازی لێهێناو دەستی کرد بەگەڕان بەدوای یەکێکی تردا، هەروەك ئەوەی هیچ نەبووبێ.. لەسەرەتاوە بەناوی خۆشەویستی‌و چاوپێکەوتنەوە هەڵیخەڵەتاندو بەیەکگەیشتن ڕوویدا لە شوقەیەکی تاریك بوو بەتاوان، ئەو شەوەی هەرلەیاد بوو، بۆیە ئارەزووی تۆڵەکردنەوە لەدڵیدا هەر زیادی ئەکرد.

داوای کرد ئاهەنگێکی شەوانە بەمەی خواردنەوەوە سازبکەن، تا ئاهەنگەکەیان خۆش بێت، کاتێك سەرخۆش  بوو و هۆشی لای خۆی نەما، ڕۆیشتە چێشتخانەو چەقۆیەکی هەڵگرت‌و چەند چەقۆیەکی لێدا، هەتا ئاگری دڵی دابمرکێنێ... کەمردیش بردیە خوارەوە بەنزینی پێدا کردو بەئاگر سوتاندی بۆ ئەوەی هەموو ئەوەی کە لێی بینیوە لەچاوی ونبێ.. بەڵام دەستگیر کراو خرایە زیندانەوە، لەناو قەفەزی تۆمەتبارانلدا ویستی ئامۆژگاری خۆی پیشکەش بکات‌و بەهەموو کچێکی گەنج بڵێت:

ئەم، خۆشەویستیە ڕووکەشەم تاقی کردەوەو ئەمەش کارەساتە دڵتەزێنەکەمە، ئەمە چیرۆکە خوێناویەکەمە، ئەمە ئەوکۆتاییە تاریکەیە کە ئەینوسمەوە تا ببێتە پەندو

ئامۆژگاری بۆ هەموو کچێکی سەرگەردان، کە بەدوای خۆشی‌و شادیدا ئەگەڕێن، ئەیەوێت ژیانی هاوسەرێتی پێك بهێنێت، لەگەڵ سەربەخۆیی خێزانی‌و دڵنیایی لەڕێگەی پەیوەندی تەلەفۆنی، یان بەهۆی گەڕان بەبازاڕەکانداو تێکەڵی لەگەڵ پیاواندا، یان لەڕێگەی تۆڕی ئینتەرنێتەوە تا پێی بڵێم: ڕێگایەکی هەڵەت گرتۆتە بەر ئەی خوشکەکەم، بەردەوام مەبە لەسەر هەڵە... خوشکم بێداربەرەوە، پێش ئەوەی شتەکانت لەدەست دەربچێت، تکا ئەکەم بەئاگا بەرەوە، پێش ئەوەی ناموست لەدەست بدەیت.. ئاگاداربە!! ئاگاداربە!! لەگورگی خۆشەویستی.. ئاگاداربە! با تۆش نەبیتە قوربانی، بەختیار ئەوکەسەیە کە پەند لەخەڵکی تر وەربگرێت.

## بۆچی خۆی سوتاند

یەکێك ئەمەی نوسیوە کە ئەڵێ:

چیرۆکێکت بۆ ئەگێڕمەوە کەلە هاوڕێکەم ڕوویداوە، ئەم هاوڕێیەم جارێك لەگەڵ هاوڕێیەکیدا بەڵێنی ئاهەنگێکی شەوانە بەیەك ئەدەن، وەك هەموو جارێك خویان پێوەگرتبوو، هاوڕێکەی پێی ئەڵێ: ئەم شەو ژنێکم لایە زۆر جوانە، خۆشی‌و لەزەتێکی باشی لێوەرئەگریت.. لەیادی ناکەی .. بەڵام ئەم هاوڕێیەی نەیزانی ئەم ئافرەتە کێیە؟ نەیزانی ئەم ئافرەتە چی هاوڕێ کەیەتی؟

چوونە شوقەیەك‌و ئافرەتەکە لە چێشتخانەکە خەریك بوو چایان بۆلێنێ‌و خۆی ڕێك‌وپێك بکات بۆیان، هاوڕێ کەشی لەهۆڵەکەدا دانیشتبوو سەیری تەلەفیزیۆنی ئەکرد، کاتێك ئافرەتەکە چای بۆ هێناو هاتە ژوورەوە...

ئای لەم کارەساتە! هاوڕێکەی ئافرەتەکەی بینی زمانی بەسترا!! شڵەژا!! ئای.. ئەمەچیە؟!

پێویستە ڕاستی دەرکەوێت..!!خۆ ئەمەژنەکەی خۆیەتی! هیچی بۆنەمایەوە تەنها ئەوە نەبێت لەبەر دەرگاکە وەستاو سێ بەسێ ژنەکەی تەڵاقدا، هاوڕێکەی تێگەیشت ئەمە ژنی هاوڕێ کەیەتی.

ژنەکە دەستی بەگریان کرد، بەڵام گریان چی سودێکی هەیە لەم کاتەدا، گریان چەند جوانە ئەگەر پێش ئەنجامدانی تاوانەکەبێت، ژنەکە هیچی لەدەست نەهات، تەنها ئەوەنەبێت کەهەڵەکەی بگۆڕێ بەهەڵەیەکی گەورەتر، خۆی سوتاند! پەنا بەخودا !! مرد!..

دوای ئەوەی بەدەستی خۆی خۆی سوتاند.. پەروەردگار خۆمان‌و کەس‌و کارو خێزان‌وماڵ‌و منداڵمان‌و هەموو ئیمانداڕێك لە هەموو خراپەیەك بپارێزێت، ئەی لەهەموو کەس بەبەزەیی تر.

## پێگەیەکی( موقع )ئیباحی

ئەو کەسەی چیرۆکەکەی گێڕایەوە بەم شێوەیە دوا: هاوڕێیەکی زۆر دڵسۆزم هەبوو وەك برا وابوو، هەفتەی ڕابردوو لە ڕووداوێکی هاتوچۆدا گەڕایەوە بۆلای ڕەحمەتی خودا، خودای گەورە بەبەزەیی بێت لەگەڵیداو سەبووری کەس‌و کاری بدات.. ئەم هاوڕێیەم کۆمەڵێك پۆستەو ڕەسمی خراپی هەبوو لەگەڵ وێنەی ڕووت، پەنا بەخودا لەپێگە (موقع) یەکی ئینتەرنێتدا کە هەمووی وێنەی سێکسی بوو.

کارەساتەکە لەوەدایە ئێمە هێمای نهێنی ئەو ماڵپەڕە نازانین، هەتاوەکو لەناوی بەرین، بەڵێ، ئەمان توانی لەناوی بەرین، ئەم کوڕە خرابووە سەر تابوت، بەڵام کۆمەڵەکەی سەیری وێنە ڕووتەکانیان ئەکرد.. ﴿ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴾ باوکی ئەم کوڕە لەخەودا گۆڕی کوڕەکەی بینی منداڵان بەلایدا ئەڕۆیشتن‌و میزیان بەسەردا ئەکرد.. باوکی داماوی ئاگای لە نهێنی ئەم کارە نەبوو. بەخودا ئەو منداڵانەی کە میزیان ئەکرد بەسەر گۆڕەکەیدا، ئەوانە بوون کەسەیری وێنەکانیان ئەکردو وێنەی خراپیان بۆ ئەو پێگەیە ئەنارد.

قسەمان لەگەڵ کۆمپانیاکە کرد بۆ داخستنی ئەم پێگەیە، وتیان هیچمان پێ ناکرێت!!

خەڵکینە کوڕەکە مردووە، بەڵام شوێنەواری تاوانەکەی دڵمان دائەخورپێنێ، ئەی هەتا کەی ئەم کارە ئەمێنێتەوە؟! ئەمە لەخشتە بردنەکانی شەیتانە، ئەوانە گومڕایان کرد لەپێکهێنانی ئەم پێگەیەدا .

تکا ئەکەم ئەم نامەیە بڵاو بکرێتەوە، بۆ ئەوەی زیندووەکان هەست بەحاڵی خۆیان بکەن، پێش ئەوەی کات بەسەر بچێت، هەرکەسێك بەشدارە لەم کارانەدا، دڵنیابێت هیچ سودیان پێناگەیەنێت.. پەشیمان ببنەوە پێش ئەوەی سەرشۆڕیتان توش بێت لەڕۆژێکدا کەپەشیمانی لەو ڕۆژەدا هیچ سودێکتان پێ ناگەیەنێت.

## لەدورگەکانی هند دا

ئەو کەسەی چیرۆکەکەمان بۆ ئەگێڕێتەوە، دەڵێت: لەناو کەشتییەکدا بەدوای کارو پەیداکردنی ناندا ئەسوڕاینەوە، گەنجێکی لەخودا ترسمان لەگەڵدا بوو، داوێن پاكو ڕەوشت بەرز بوو، لەخوداترسانو تەقوامان لەسیمایدا ئەبینی، ڕووناکیو شادی لەڕووخساریدا دیاربوو، بەدەست نوێژو نوێژەوە ئەبوایە ئەت ئەبینی، هەروەها ئامۆژگاری بۆ کاری چاکە ئەکردینو هانی ئەداین. ئەگەر کاتی نوێژ بهاتایە بانگی بۆ ئەداینو پێش نوێژی بۆ ئەکردین، ئەگەر یەکێك دوابکەوتایە یان فریا نەکەوتایە سەرزەنشتی ئەکردو ئامۆژگاری ئەکرد، بەدرێژای گەشتەکەمان ئەم گەنجە لەئامۆژگاری کردنمان بەردەوام بوو، ڕۆژێکیان لەڕێگەی دەریاوە گەیشتینە یەکێك لەدورگەکانی هیندو لە دورگەیەکدا دابەزین.

دەریاوانەکان وا ڕاهاتبوون چەند ڕۆژێك بۆ پشوو بمێننەوە، لەبازاڕی شارەکەدا ئەسوڕانەوەو پیاسەیان ئەکرد، یان ئەوەی بەشتی سەیریان ئەزانی ئەیان کڕی بۆ کەسو کارو منداڵەکانیانو پاشان لەشەودا ئەگەڕانەوە بۆلای کەشتیەکەیان، یەکێکیان لەگەڵدا بوو کەتووشی گومڕایی ببوو، گرفتاری هەواوو ئارەزوو و داوێن پیسی ببوو، بەڵام گەنجە باشەکە هەرگیز لەکەشتیەکە دائەئەبەزی، بەڵکو ئەم کاتانەی لەچاککردنی کەشتیەکەدا بەسەر ئەبردو حەبلەکانی توند ئەکردەوە، یاخود خۆی بەیادی خوداو و نوێژکردنەوە خەریك ئەکرد.

گێڕەرەوەی چیرۆکەکە دەڵێت: فرمێسكو ئەسرین بەچاوەکانیدا ئەهاتنە خوارەوە. یەکێك لەگەنجەکانی کەشتیەکە بەدوای کاری خراپو ئەفسو ئارەزووی کەوتبوو، بەئەسپایی بەگەنجە لەخوداترسەکەی ووتوو چرپاندی بەگوێیدا:

هاوڕێکەم، بۆچی لەکەشتییەکەدا دانیشتوویيو جیا نابیتەوە لێی؟

بۆچی دانابەزی، تادنیایەکی جیاواز لەم دنیایە ببینیت؟

ئەوە ببینە کەدڵت خۆش ئەکاتو دەروونت ئاسودە ئەکات؟

من ناڵێم وەرە بۆشوێنی خراپو خەشمی خودا، یان بۆ باڕو تووڕەیی خودا، دوور لەم شتانە هاوڕێ، بەڵام وەرە تەماشای یاری مارەکان بکە کەچۆن خاوەنەکانیان یاریان پێ دەکەنو ناترسن، یان تەماشای ئەوانە بکە کە سواری فیل ئەبنو لوتیان ئەکەن بەپەیژەو

پێیاندا سەرنەکەونو فیلەکان لەسەر یەك قاچ نەوەستن، ئەی ئەگەر ئەوانە ئەبینیت بەسەر بزماردا ئەڕۆن، ئەم ئارامگرتنەیان لەکوێ بوو؟ یان ئەوانەی پشکۆ قووت ئەدەن وەك خورما، براکەم دابەزەو سەیری ئەوانە بکە.

ئارەزووی گەنجەکە جوڵاو ووتی: ئایا لەدونیادا ئەوە هەیە کە تۆ دەیڵێیت؟ برادەرە خراپەکە ووتی: بەڵێ، لەم دورگەیەدا هەیە، دابەزە ئەوە ببینە کە دڵت خۆش ئەکات.

گەنجە چاکە کارەکە دابەزی لەگەڵ برادەرەکەیداو لەشەقامی شارەکەدا سوڕانەوە، تاوەکو چوونە سەر ڕێگایەکی بچووکو تەسك کە بەماڵێکی بچووك کۆتایی بەڕێگاکە ئەهات. گەنجە خراپەکە چووە ژوورەوە بۆ ماڵەکەو بەگەنجە باشەکەی ووت: دوای کەمێکی تر دێمەوە، بەڵام تکا ئەکەم.. تکا ئەکەم..کە نزیك ئەو خانووە نەکەویتەوە!

گەنجەکە دوور لەدەرگای خانووەکە دانیشتو دەستی کرد بەیادی خودا، کتو پڕ گوێی لەپێکەنینێکی بەرز بوو، پاشان دەرگاکە کرایەوە ژنێکی لێ هاتە دەرەوە، کە کراسو جلوبەرگی حەیای فڕێ دابوو، ئای لەو کارەساتە! ئەمە هەر ئەو دەرگایەیە کە برادەرەکەی لێ چووە ژوورەوە، ئارەزووی گەنجەکە جوڵاو لە دەرگاکە نزیك بۆوەو گوێی ڕاگرت لەوەی کە لە خانووەکەدا ڕووی ئەدا، گوێ بیستی هاوارو پێکەنینێکی تری بەرز بوو، لەدرزی دەرگاکەوە سەیری ژوورەوەی کردو تەماشا لەدوای تەماشا، شتێکی بینی کەلەوەو پێش نەیبینیبوو، گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی، کاتێك برادەرەکەی هاتە دەرەوەو سەرزەنشتی کردو ووتی: لەناو چی! ئەم کارە خودا تووڕەئەکاتو پێی ڕازی نیە، گەنجە خراپەکە پێی ووت: بێدەنگ بە، ئەی کوێر، ئەی بێ ئاگا، ئەمە شتێکە پەیوەندی بەتۆوە نیە.....

لە نیوەشەودا گەڕانەوە بۆلای کەشتییەکە، گەنجە چاکەکە ئەو شەوە بەبێداری مایەوە، بیری لەوە ئەکردەوە کەبینیبووی، تیری شەیتان دڵی پێکا بوو، سەیرکردنەکە جڵەوەی پێ لەدەست دابوو، هەرکە بەیانی بۆوەو ڕۆژهەڵات، یەکەم کەس بوو لە کەشتیەکە دابەزی . هیچی نەکردبوو جگە لەسەیرکردنو تەماشا.. چوو بۆ ئەو شوێنە، هەر کەیەك دووجار سەیری کرد، دەرگاکەی بۆ کرایەوەو ئەو ڕۆژەی لەوێدا بەسەر برد، بەهەمان شێوە ڕۆژی دواتریشی هەر لەوێدا بەسەر برد، دوای دوو ڕۆژ کەشتیوانەکان بەدوایدا ئەگەڕانو پرسیاریان ئەکرد: کوا بانگ دەرەکەمان؟ کوا پێش نوێژی کەرەکەمان؟ ئەو گەنجە چاکە کارە لەکوێیە؟کەس وەڵامی نەدایەوە، بەرپرسی کەشتیەکە فەرمانی پێکردن، کەبڵاو

ببنەوەو بگەڕێن بەدوایدا، پاشان برادەرە خراپەکەی هات بۆ لای کەشتیوانەکەو دانی بەوەدانا کە بردوێتی بۆ شوێنی زیناو داوێن پیسیو ئێستا بەدڵنیایەوە لەوێیە...

کەشتیوانەکە هاواری کرد بەسەریداو پێیووت: برۆ بیهێنەرەوە، تۆ نابێ لەخودا بترسی؟ لە سزای خودا ناترسی؟ پەلەبکەو برۆ بیهێنەرەوە، چەند جارێك ڕۆی، بەڵام بێ سوود بوو، نەیتوانی بیهێنێتەوە چونکە ڕازی نەبوو کە بگەڕێتەوە، کەشتیوانەکە فەرمانی بەچەند پیاوێك کرد کە بەزۆر بهێننەوەو ڕایان کێشاو خستیانە سەر کەشتیەکە! کەشتیەکە کەوتە ڕێ بەرەو وولاتی خۆیان، گەنجەکەش لە سوچێکی کەشتیەکەدا ئەگریاو ئەیناڵاندو خەریك بوو دەمارەکانی دڵی ئەپچڕا لە توندی گریانەکەی، یەکێکیان خواردنی بۆ دانا، بەڵام نەیخوارد، چەند ڕۆژێك لەسەر ئەم حاڵە شەرمەزاریە مایەوە، شەوێکیان ناڵە ناڵو گریانی زیادی کرد، بەشێوەیەك هیچ کەس لە کەشتییەکەدا نەیتوانی بخەوێت، کەشتیوانەکە هات بۆلایو پێیووت: چیت بەسەرهاتووە؟! ناڵەو گریانت نایەڵێت بخەوین! لەناوچی! چیت لێ هاتووە؟! چی ئەم کارەساتەی بەسەر هێنایت؟

گەنجەکە ووتی: وازم لێبێنە تۆ نازانی من تووشی چی بووم؟

کەشتیوانەکە ووتی: توشی چی بوویت؟

گەنجەکە عەورەتی پیشانی کەشتیوانەکە دا کرمی لێ ئەهاتە دەرەوە!!

کەشتیوانەکە کاتێك ئەم حاڵەتەی بینی هەراسانو وەڕس بووو ووتی: پەنا بەخودا ئەگرمو هەستا ڕۆی.

کەمێك پێش بەیانی خەڵکانی ناو کەشتیەکە بەئاگا هاتن لە دەنگی هاوارێكو ڕۆیشتن بۆ لای سەرچاوەی هاوارەکە، گەنجەکەیان بینی مردبوو، خۆی بە ددان گرتبوو بەداری کەشتیەکەوە، خەڵکەکە دوعای خێرو ئاخیرەت باشییان بۆ کرد لەخودای گەورە.

چیرۆکی ئەم گەنجە وەك پەندێك مایەوە بۆهەموو ئەوکەسانەی کە پەندوەردەگرن (لاحول ولاقوة إلا بالله).

## کچێك لەڕەمەزاندا

ئەمە ڕووداوێکی ڕاستەقینەیە لەشاری غەززەی فەلەستین ڕوویداوە، ئەم کیژۆڵەیە لەناوەڕاستی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا خۆی ڕازاندۆتەوەو جەستەو لەشولاری دەرخستوە، بەشێوەیەك کە جێگەی سەرنج بێت، ئەم کچە سواری ئۆتۆمبیلێکی کرێ ئەبێت،

خۆڕازاندنەوەکەی بەرچاو نەبێتو نەبێتە جێگەی سەرنجی شۆفێری ئۆتۆمبیلەکە، شۆفێرەکەش بەشێوەیەکی ڕێكوپێك قسەی لەگەڵ نەکاتو پێینەڵێت؛ کە لە خودا بترسێتو خۆی داپۆشێ، بەتایبەت لەم مانگە پیرۆزەدا کە گوناهبارەکانیش ڕووئەکەنە خودای گەورە.

لەو باوەڕەدان وەڵامی ئەم کچە چی بێت؟!

بەم دەستەواژەیە وەڵامی دایەوە: ئەم مۆبایلە بگرەو قسە لەگەڵ پەروەردگارتا بکە تا شوێنێك لە دۆزەخدا بۆ منو شوێنێکیش لەبەهەشتدا بۆ تۆ دابنێ.

کاردانەوەی خودای گەورە خێرا بوو، داواکاریەکەی قبوڵ بوو، هەر لەوکاتەدا مرد، کەلەسەر کوشنی ئۆتۆمبیلەکە دانیشتبوو، شۆفێرەکە بەخێرایی ئەیگەیەنێتە نەخۆشخانەو کچەکە ئەخەنە ساردکەرەوە(ثلاجة)ی نەخۆشخانەکەوە، پاش ناسینەوەی کەسو کاری لاشەی کچەکە ئەدەنەوە بە خزمو کەسی، لاشەی کچەکەیان لە ساردکەرەوەی نەخۆشخانە دەرهێنا، لەشو ڕووخساری بەتەواوی ڕەش بوو بوو، پەنا بەخودا!! تەنانەت نەیان توانی مۆبایلەکەی لەدەست دەربهێنن، تا لەگەڵ لاشەکەیدا مۆبایلەکەشیان ناشت، بۆ ئەوەی لەڕۆژی دوایدا ببێتە شایەد لەسەری، پەنا بەخودا!! پەروەردگار کۆتاییو سەرەنجامامان بەخێر بگێڕی، ئەی لەهەموو کەس بەبەزەیتر...

## پیرێکی ناپاكو منداڵێکی بێ تاوان

ئەو چیرۆکانە زۆرن کەبەبیستنی دەرونمان ئەهەژێنێ، چەندان چیرۆکی کاریگەر هەیە کەسەرمان لێی سوڕ ئەمێنێ، هەندێکیان گومان بۆ مرۆڤی ژیر دروست ئەکەن، ترسناکی ڕوداوەکان، مووی لەشی مرۆڤ گرژئەکەن، سەری منداڵ سپی ئەکەن، ڕووداوی ناو ئەم چیرۆکەو پاڵەوانەکەی جیاوازە لە هەموو ئەو ڕووداوانەی کە بیستوتن، لەوانەیە وا بزانی خەیاڵە، ئەم ڕووداوە لەوانەیە بەبیری هیچ کەسێکدا نەهاتبێ، کە نرخی ژیان بزانێ، چ لەکەسانی چاك، چ لەکەسانی خراپ. بەڵام چیرۆکەکە ڕاستیەو لەپێش چاو وگوێی خەڵکانێکی زۆر ڕوویداوەو ئەمە پوختەکەیەتی:

ئەو منداڵە تەمەنی حەوت ساڵی تەواو نەئەبوو، خەریکی یاریکردن بوو لەگەڵ هاوڕێکانیدا، دوور لەمرۆڤی دڕندە، ئەوان یاری ئەکەن‌و پاکی منداڵیشیان دوورە لەدەست درێژی گومڕاکان.

مرۆڤە گورگ ئاساکان قەپ لەگۆشتی بێ تاوان‌و بێهێزەکان ئەگرن، بەبێ هیچ سۆزو بەزەییەك.

ئەم منداڵە بێ تاوانە دوور ئەکەوێتەوە لە هاوڕێ منداڵەکانی‌و بەلاڕێگایەکدا ئەڕوات‌و بەتەنها ئەو گۆرانیە ئەڵێتەوە، کە وای لێئەکات متمانەیەکی باشی بەوانەی دەوروبەری هەبێت، بەتایبەت خزم‌و هاوسێ‌و کەسانی کۆڵانەکەیان، یەکسەر پیاوێك کەتەمەنی پەنجاو حەوت ساڵە، ئۆتۆمبیلەکەی ڕائەگرێت‌و داوا لەمنداڵەکە ئەکات کەسواری ئۆتۆمبیلەکە بێت، منداڵەکە سەیری ئەم پیاوە ئەکات، زەردەخەنە لەڕووخساریدایە، زۆر بەبینینی دڵخۆش ئەبێت، بەڕاستی ئەم پیاوە دراوسێیانەو وەك باوکی وایە، ئەگەر وەك باپیری نەبێت. گرنگ ئەوەیە منداڵەکە بەوپەڕی دڵخۆشی یەوە سواری ئۆتۆمبیلەکە ئەبێت، بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی خراپ بەخەیاڵیدا بێت، لەوەی کەلە دەروونی ئەو پیاوە دڵ مردوەدا خۆی حەشاردا بوو، ووشەیەکی گونجاو نابینم بۆ ئەوەی ئاماژە بە دڕندەیی ئەو پیاوە بکەم، منداڵەکە سواری ئۆتۆمبیلەکە ئەبێت‌و دڵی پڕ لەشەوق‌و خۆشی بوو، چۆن‌وانەبێ ئەو پیاوە لەدڵیدا خۆشەویستەو دراوسێ‌و هاوڕێی باوکێتی، پاشان پیاوەکە سەیری ڕاست‌و چەپی خۆی ئەکات، تا بزانێ کەس نەیبینیوە، کاتێك دڵنیا ئەبێت، بەئۆتۆمبیلەکەی دەرئەچێت، کە پاکی‌و بێ تاوانی منداڵەکەو خراپەو پیسی‌و نامەردی پیاوەکەی تێدا کۆبوەتەوە، دوور لەچاوی خەڵکەکە ئەڕۆن، ئەیبات بۆ دارستانێکی گەورە کە خراپەکاری تێدا ئاسانە، ئۆتۆمبیلەکە ڕائەوەستێنێ‌و پیاوەکە دائەبەزێت، منداڵەکەش دائەبەزێت‌و پرسیار ئەکات من لەکوێم؟ ئەم شوێنە کوێیە؟ بۆچی ئەم پیاوە منی هێناوە بۆ ئێرە؟ پرسیارگەلێکی زۆر لەبیرو هۆشی منداڵەکەدا ئەسوڕایەوە، بەڵام نەگەیشتە ڕاستی‌و مەبەستی ئەو پیاوە خراپە، کاتێك منداڵەکە بەبیرێکی ئاڵۆزەوە ئەسوڕایەوە، لەو کاتەدا گوێبیستی دەنگێکی مەترسیدار بوو، مەترسیدار تر لەدەنگی هەورە تریشقە لە شەوێکی باراناویدا.

دەنگێك کە ئەتووت زەوی ئەلەرزێنێت.. منداڵەکە ڕاچەڵەکی‌و خۆشی یەکەی لێ بوو بەناخۆشی.. دڵنیاییەکەی لێ بوو بەمەترسی.. دەنگێك کە هەڵگری خوارترین‌و نزمترین ڕیسوایی‌و پیسیە.. پێی ووت: جلەکانت دابنێ، منداڵەکە وەڵامی دایەوە.. بۆ مامە؟

پیاوەکە: جلەکانت دانێ‌و کات بەفیڕۆ مەدە!

ئالێرەدا منداڵەکە هەستی کرد چی لێ ئەوێت، دەستی کرد بەپاڕانەوە: مامە تکات لێ ئەکەم بمبەرەوە بۆلای دایکم، ئێستا دڵتەنگ‌و ڕاڕایە بۆ من...

پیاوەکە ووتی: جلەکانت دانێ، کاتم نیە، دەمت داخەو جلەکانت دانێ.

منداڵەکە هاواری ئەکردو ئەپاڕایەوە .

ئەم پیاوە کەوتە لێدانی منداڵەکەو جلەکانی لەبەر ئەدڕێنێ، هەتا منداڵەکە ڕووت ئەبێتەوەو هیچی لەبەردا نامێنێت، دڵێك نیە سۆزی بۆی هەبێت، بەم شێوەیە ئەم منداڵە ئەکەوێتە باوەشی ئەو پیاوە ناپاکەوە، بەپشتا ئەکەوێتە باوەشی پیاوەکەوەو نازانێت هاوار بکات لەتاو ئازار، یان هەڵ ئەلەرزێ لەتوندی ترسەکەیدا، بەڵام بەردەوام تکا ئەکات‌و ئەڵێت: مامە تکات لێ ئەکەم‌و لێت ئەپاڕێمەوە بمبەرەوە بۆلای دایکم، تکات لێ ئەکەم بەسە، بەڵام ئەم ناپاکە لەسەر تاوانەکەی بەردەوام ئەبێت‌و گوێ ناداتە پاڕانەوە لاوازەکانی.. ئەم منداڵە هیچ تاوانێکی نیە جگە لەوەی گوێڕایەڵی پیاوێکی بەدناوی کردوە، کە لە نزمترین ئاستەکانی ناپاکیدایە.. ئەم پیاوە بەئاگا نایەتەوە هەتا هەست بەگەرمی خوێن ئەکات کە بەخوڕ لەدوای منداڵەکەوە دێتە خوارێ.

پیاوەکە، بەئاگا دێتەوەو سەری سوڕئەمێنێ لەم کارەو نازانێ چی بکات! ئەیەوێت منداڵەکە چارەسەر بکات، بۆئەوەی خوێنەکەی بوەستێت.. بەڵام خوڕی خوێنەکە لەو هەوڵە ئەزۆکە گەورەترو زۆرتر بوو.. ئەم ناپاکە چی بکات تا تاوانەکەی بشارێتەوە، لەوانەیە کارەکەی ئاشکرابێت، بیرئەکاتەوەو هیچی بۆ نامێنێتەوە، ئەوە نەبێت کە سەری منداڵەکە بهاڕێ بەبەردێکدا، کە لەو نزیکانە بوو، بۆ ئەوەی بۆ هەتاهەتایی ڕزگاری ببێت لێی.. بەم شێوەیە شەیتان وەسوەسەی خستە دڵیەوە، دوای ئەمە ڕوحی ئەم بێتاوانە بەرزەبێتەوە بۆلای خودای پەروەردگار.. منداڵەکە بەخراپترین شێوە ئەمرێت، کە مرۆڤایەتی بەخۆیەوە نەیبینیوە، منداڵەکە ئەمرێت‌و لەدارستانەکەدا بەکش‌وماتی

ئەمێنێتەوە، بەبێ هیچ هاوڕێو هاودەمێك.. پیاوە ناپاکەکەش ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، وەك ئەوەی هیچ نەبوبێت!!

دەمەو ئێوارە ترسو دڵەڕاوکێ لە دڵی دایکیدا زیاد ئەبێتو هاوار ئەکات بەسەر مێردەکەیداو پێی ئەڵێت: کوا منداڵەکەت؟ بڕۆ بەدوایدا بگەڕێ! باوکەکە سەری سوڕئەمێنێو ئەڵێت: منداڵی من لەکوێیە؟! بۆکوێ ڕۆیشتووە؟! وەڵام نیە!!

باوکەکە لەماڵەکەی دەرئەچێو نازانێ چی بکات! کوێی بۆ بگەڕێ؟ پرسیار لە کێ بکات؟ ئالەم کاتەدا پیاوە ناپاکەکە ئەبینێت. پیاوەکە پێی دەڵێت: چی بووە؟ باش نایەیتە بەرچاوم؟!

باوکی منداڵەکە: بەڵێ، منداڵەکەمان زۆر دواکەوتووەو نەگەڕاوەتەوە، هەر لەبەر ئەمەشە کەوتوینەتە دڵەڕاوکێوە.

پیاو خراپ: ئایا منداڵەکەت هەر ئاوا دوا ئەکەوێت؟

باوك: نەخێر، ئەمە یەکەم جارە، بۆیە کەوتوینەتە دڵە ڕاوکێوە.

پیاو خراپ: بەڵکو لای یەکێك لە خزمانی بێت.

باوك: لەوانەیە.

پیاو خراپ: ئەڵێی چی بەئۆتۆمبیلەکەم بچین بەدوایدا بگەڕێین.

باوکەکە سوار سەیارەکە ئەبێتو بەیەکەوە ئەڕۆن، تا بگەڕێن بەدوای منداڵەکەدا، لێرەو لەوێ ئەگەڕێن، پرسیار لەمو لەو ئەکەن، بەڵام بێ سوودە، هیچ شوێنەواری نیە.. دوای ئەوەی باوکەکە بێ هیوا ئەبێت لەدۆزینەوەی منداڵەکەی، گوێی لەدەنگی پیاوخراپەکە ئەبێت پێی ئەڵێت: بەلاتەوە چۆنە هەواڵ بدەینە ئاسایش؟

باوك: بەڕاستی بۆچونێکی باشە با بڕۆین.. بەیەکەوە ئەچنە بنکەی ئاسایشو پێیان ڕائەگەیەنن کە منداڵەکەیان وون بووە. پیاوانی ئاسایش ئەکەونە خۆیان بۆ گەڕان بەدوای منداڵەکەدا، ئەوەندەی پێناچێت منداڵەکە ئەدۆزنەوە کەلەخوێنی خۆیدا شەلاڵ بووەو لە دونیاش دەرچووەو گیانی تیادا نەماوە.

ئەم پیاوە خراپە سەرەخۆشی لەباوکی منداڵەکە ئەکاتو لەگەڵ تەرمەکەیدا ئەڕوات بۆ گۆڕستانو خواردنی پرسەکەشی ئەدات، پشتیوانی کەسو کاری منداڵەکە ئەکات بۆ دوورخستنەوەی گومانی تاوانەکە لەخۆی، خودای پاكو بێگەرد مۆڵەتی ئەدات بەڵام

فەرامۆشی ناکات، هەرچەند ڕۆژێکی پێ ئەچێت هێماو بەڵگەی ڕوونو ئاشکرا ڕوونەکاتە گەردنی ئەو پیاو خراپە، بە شایەدی یەکێك لەوکەسانەی کە دیویانە کۆتا جار لەو ڕۆژەدا هاوڕێیەتی ئەو پیاو خراپەی کردوە لەگەشتی مردنەکەیدا، یەکێکیان بینیویتی لەگەڵیدا سەرکەوتووە، دوای تەواو بوونی یاریەکەیان لەگەڵ هاوڕێکانیدا .

﴿ أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ﴿١٤﴾ ﴾ العلق. واتە: (ئایا نەیزانیوە کە خودای گەورە ئەیبینێتو ئاگای لەکردارو گوفتارێتی؟) پاش فشارێکی زۆر لەسەر ئەو پیاو خراپە، لەکۆتایدا دان بەو تاوانە نامرۆڤانەیەدا ئەنێت، تا ئەبرێتە بەر پەتی سێدارەو لەدوای خۆی تاوانێك بەجێ ئەهێڵێ، کە لە خراپترینی ئەو تاوانانەیە کە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا بەدی کرابێت.

لێرەدا دەبێت هەڵوێستەیەك بکەین کەهۆکاری تاوانەکانی ئەمڕۆ ئەمانەن:

یەکەم: نەرمو نیانی کاربەدەستان لەبەرامبەر خراپەکاریداو تاوانباران سزا نادرێن، لە ئەنجامدانی داوێن پیسیدا، تەنها لەکاتی ئەنجامدانی تاوانی گەورە دا نەبێت، ئەوەیان لەبیرچووە کە بێ دەنگی لەبەرامبەر داوێن پیسیدا خۆی تاوانە...

دووەم: نەرمونیانی دایکان لەپەروەردەکردنی منداڵەکانیاندا، بەجۆرێك منداڵ لەماڵ دەرئەچێتو پرسیاری لێ ناکەن.

## کۆتایی و سەرئەنجامی ستەم

ژنێك ئەڵێت: من ئافرەتێك بووم، کوڕو کچێکم هەبوو، لەدەست پێکردنی ژیانی هاوسەریم لەگەڵ مێردەکەمدا لەژیانێکی زۆر خۆشدا ئەژیاین.. بەدرێژای ژیانی هاوسەریم بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانم پشتم بەچەند دایەنێك ئەبەست، هەریەك لەو دایەنانە دوو مانگ زیاتر لامان نەئەمانەوەو ڕایان ئەکرد، لەبەر دڵ ڕەقیو شەڕەنگێزی پیاوەکەم، چونکە سروشتێکی شەڕانی هەبوو، بەجۆرەها شێوە سزای دایەنەکانی ئەدا، نکوڵیش لەوە ناکەم لەهەندێك لەو تاوانانەدا بەشدار بووم لەگەڵ مێردەکەم دا.

کچەکەمان گەیشتە تەمەنی حەوتساڵیو کوڕەکەشم گەیشتە قۆناغی ئامادەیی، جوتیارێك کە ناسیاوی پیاوەکەم بوو، هات بۆ ماڵمانو کچێکی حەوت ساڵانەی لەگەڵدا بوو، پیاوەکەم زۆر بە خۆزلزانیەوە گلی دایەوە.

جوتیارە هەژارەکەووتی: هاتووم کە منداڵەکەم ئیش بکات لە لاتان، لەبەرامبەر بیست جونەیهدا لە مانگێکدا، ڕازی بووین، جوتیارەکە منداڵەکەی بەجێهێشت، لەکاتێکدا دەستی بەگریان کردو خۆی بەحڵو بەرگەکانی باوکی یەوە ئەگرت، بەڵام جوتیارەکە بەچاوی پڕ ئەسرینەوە منداڵەکەی بەجێهێشت لەلامان.

بەم شێوەیە منداڵەکە ژیانی تازەی دەست پێ کرد، بەیانی زوو لەخەو هەڵ ئەستا، تایارمەتیم بدات لە ئامادەکردنی خواردن بۆ منداڵەکانم، پاشان جانتای قوتابخانەی بۆ هەڵئەگرتن تا سەر شەقامەکە، لەگەڵ کوڕو کچەکەمدا ئەوەستا، تا شەمەندەفەرەکە هەڵیانی ئەگرت بۆ قوتابخانە، پاشان ئەگەڕایەوەو نانی ئەخوارد، کە بەزۆری پاقلەی بێ ڕۆنو نانێك بوو، کەخەریك بوو کەڕووی ئەکرد، پاشان دەستی ئەکرد بەئەنجامدانی کاری ماڵەوە لەپاککردنەوەو شوشتنو کڕینی سەوزەو بەدەنگەوە هاتنی داواکاریەکانی ئێمە هەتا نیوەی شەو، وەکو لاشەیەکی بێ گیان لەسەر زەوی ئەکەوتو لەخەودا نقووم ئەبوو، لەگەڵ هەر هەڵەشەییەكو لەبیرچونەوەیەك، یان دواخستنی کارێك، کە داوای لێبکرایە، پیاوەکەم ئەکەوتە لێدانی بە دڵ ڕەقی یەکی زۆرەوە، ئەویش بەگریانو ئارامگرتن بەرگەی لێدانەکەی ئەگرت.

لەگەڵ ئەمانەشدا زۆر پاكو دڵسۆز بوو لەگەڵماندا، تەنانەت بەسادەترین شت دڵخۆش ئەبوو کە ئێمە پێمان بدایە، هەرچەندە کەمیش بوایە، دان بەوەدا دەنێم کە هاوبەشی پیاوەکەم بووم لەدڵ ڕەقیەکەیدا بەرامبەر کارەکەرەکانو لێدانیان بەجۆرەها شێوە، بەڵام هەندێك جار بەزەیم بەم کیژۆڵەیەدا ئەهاتەوە، لەبەر چاکیو بەدبەختیەکەی بەپیاوەکەم ئەووت: کەلێی نەدات .

ئەویش ئەیووت: ئەم جۆرە خەڵکانە شایەنی مامەڵەی باش نین.

بەم شێوەیە ئەم کیژۆڵەیە بەردەوام بوو لەسەر بەرگەگرتنی سزاو ناڕەحەتی، لە سایەی ئارامگرتنو بێدەنگیدا.. لەیادمە کاتێك جەژن ئەهات منداڵەکانمان بەڕووی گەشەوە لە ماڵ دەردەچوون، ئەم منداڵە هەژارەش لەماڵەوە ئەمایەوە بۆ پاککردنەوەی ماڵو قاپ شۆرین، بەبێ ئەوەی سۆزێکمان بۆی هەبێت.. باوکی ئەم کچەمان نەبینی، تەنها چەند جارێك نەبێت، ئەویش بۆ وەرگرتنی کرێی مانگانەی کچەکەی، هەندێك جاریش ناسیاوێکی ئەنارد بۆ وەرگرتنی مانگانەکە، هەروەها دایكو خوشکەکانیمان تەنها لە سێ یادەوریدا بینی:

یەکەم: کاتێك کە برا گەورەکەی مرد.

دووەم: کاتێك ئەم کچە نەخۆشیەکی گرت، کە ئەگوازرایەوە بۆ کەسانی تر، بۆیە ترساین منداڵەکانمان توشی ئەم نەخۆشی یە ببن، لەبەرئەوە دوورمان خستەوە بۆ شوێنەکەی خۆی.

سێ یەم: کەباوکی مرد.

بەم شێوەیە بەتوندو تیژی سزامان ئەدا هەر هەڵەیەکی بکردایە، هاوسەرەکەم بەتەزووی کارەبا بێ هۆشی ئەکرد!! زۆر جار لەنان خواردنی ئێوارە بێ بەشمان ئەکردو لەشەوانی زۆر سارددا بە برسێتی سەری ئەنایەوە، لەیادم نیە لەو چەند ساڵەدا شەوێك بەبێ گریان خەوتبێت.

گێرەرەوەی چیرۆکەکە ئەڵێت: پرسیارەکەم، کە بۆچی ئەم کچۆڵەیە لەژێر ئەم هەموو ناخۆشیەدا خۆی گرتو لەم دۆزەخە ڕای نەکرد؟! لەڕاستیدا ئەم کیژۆڵەیە لەتەمەنی لاوێتی نزیك ببۆوە، ڕۆژێکیان بۆ کڕینی سەوزە لە ماڵ دەرچوو و نەگەڕایەوە، مێردەکەم هەواڵی لەدەرگاوانەکە پرسیو زانی کە ماوەیەکی زۆرە قسە لەگەڵ گەنجێکدا دەکات، کەلەلای قەسابێك ئیش دەکاتو لەوانەیە کەرێك کەوتبێت شوی پێبکات، هەتاوەکو ڕزگاری بکات لەم ژیانە پڕ ستەمو بێ بەزەییە.

هەفتەیەکی پێ نەچوو دەستوپێوەندی پیاوەکەم دۆزیانەوە، کە لەکوێدا خۆی شاردبۆوە، لە گەڕانەوەیدا بەسزاو ئازار پێشوازیمان لێکرد، پیاوەکەم بەکارەبا بێ هۆشی کرد، کوڕەکەشم بەلێدانێکی زۆر بێ ڕەحمانە بەشداری کرد، تەنها کچەکەم نەبێت زۆر دڵگران بوو بەوەی لەگەڵ ئەم کارەکەرە هەژارەدا ئەکرا.. دوای ئەمە ئەم داماوە گەڕایەوە بۆ ژیانی دەردەسەریو خۆی دایە دەست چارەنووس.

ڕۆژێکیان تێبینی ئەوەمان کرد، کەپەرداخو قاپەکان لەدەستی ئەکەوێتە خوارەوەو لەڕۆیشتندا ساتمەی ئەکرد، پیشانی پزیشکماندا و بۆی ڕوون کردینەوە، کە بینینی زۆر لاوازو کزبووە، تەنانەت بەرپێی خۆی نابینێ، بەو مانایەی کە ئێستا نیمچە نابینایە، لەگەڵ ئەمەشدا بەزەیمان پێیدا نەنەهاتەوەو بەردەوام کارەکانی ماڵەوەی ئەنجام ئەداو ئەچوو بۆ بازاڕ بۆ کڕینی سەوزە، زۆر لێم ئەدا کاتێك سەوزەی خراپی بهێنایە، ژنی دەرگاوانەکە بەزەیی پێیدا ئەهاتەوەو زۆرجار سەوزەی بۆ ئەکڕی، تا ڕزگاری بکات لەسەرزەنشتو لێدان.

بەم شێوەیە ماوەیەك تێ پەڕی، ڕۆژێکیان کچەکە لەماڵ دەرچوو دوای ئەوەی وەکو نابینای لێهاتبوو، ئیتر نەگەڕایەوە، بەڵام ئەم جارەیان بەپەرۆش نەبووین بۆ گەڕان بەدوایدا، دوای چەند ساڵێك پیاوەکەم خانەنشین کراو پلەو پایەکەی لەدەست دا، کوڕەکەشم زانکۆی تەواوکردو پاشان ژنی هێناو بەژن هێنانەکەی دڵخۆش بووین، خۆشیەکەمان زیادی کرد کاتێك زانیمان ژنەکەی سکی هەیە، دوای چەند مانگێك منداڵی بوو، بەڵام منداڵەکەی (نابینا) کوێر بوو، ئەمە نەهامەتیەکی گەورە بوو بۆ ئێمە، خۆشی گۆڕا بۆ ناخۆشی، پیشانی پزیشکماندا، هیچ سودی نەبوو، منداڵەکەشمان برد بۆ دایەنگای نابینایان، هاوسەری کوڕەکەشمان بڕیاریدا ئیتر منداڵیان نەبێت، نەوەکو هەمان کارەسات دووبارەببێتەوە.

بەڵام پزیشکەکان دڵنیایان کردەوەو هانیاندا بۆئەوەی منداڵی ببێت.. ئێمەش بەهەمان شێوە هانماندا‌و دووگیان بوو، منداڵێکی جوانی بوو، پزیشکەکە مژدەی پێداین کەچاوی ساغە هەروەکو منداڵانی تر، زۆر دڵخۆش بووین، دوای حەوت مانگ تێبینی ئەوەمان کرد سەیرکردنی تەنها بۆ یەك لایەو بەس، پیشانی پزیشکی تایبەتمان داو هەواڵی دەردەسەرییەکی تری پێداین، کە هیچ نابینێت جگە لە تروسکەیەکی ڕووناکی کەم نەبێ‌و بۆی هەیە چاوی لەدەست بدات، مێردەکەم توشی حاڵەتێکی دەروونی خراپ بوو، ژیانی تێك چوو، ڕقیشی لەهەموو شتێك دەبووەوە، پزیشکەکان ڕێنماییان کردین کە بیبەینە چارەسەرگەیەکی دەروونی بۆ چارەسەرکردنی خەم‌و پەژارەکەی، دوای ئەم منیش تووشی دڵ تەنگی بووم‌و بەردەوام بیرم نەکردەوە، نەتوت خەوێکی ناخۆش‌و بێزارکەر نەبینم، نەبێت هۆکاری ئەمە چی بێت.

کتوپڕ بیری ئەو کارەکەرە داماوەم کەوتەوە، کە لە دۆزەخەکەی ئێمە ڕایکرد بەکوێری‌و نابینایی، دوای ئەوەی دە ساڵی لەگەڵ ئێمەدا گوزەراند، لەو ماوەیەدا جۆرەها سزاو ئازارماندا،دەردەسەری کارەباو پیاکێشان‌و سەرزەنشت کردن‌و بێ بەش کردن، لەبێ ئارامی دەروونمدا نەخۆش کەوتم، ئایا ئەمە تۆڵەی خودایە لەوەی بەرامبەر ئەو کارەکەرە کردمان؟! وێنەی ئەو کچە هەتیوە، کە چارەسەریمان پشت گوێ خست‌و هۆکاریش بووین بۆ لەدەست دانی چاوی هەرلەبەرچاوبوو، تەنها هیوام بە لێبوردنی پەروەردگاربوو، هەستم بەگوناهی خۆم کرد، پێش لەدەست دانی شتەکان، سا بەڵکو ئەو شتەی کە خراپمان کردوە

چاکی بکەین، کەوتمە گەڕان بەدوای ئەم کارەکەرە هەژارەدا، دوای گەڕان‌و پرسیار کردن بۆمان دەرکەوت کە بووە بەخزمەتکاری مزگەوتێك، چووم بۆلای بۆ ئەوەی بیهێنمەوەو لەگەڵما بژێت، تا لەدنیادا ئەمێنم، کاتێك بەهاتنی منی زانی، دڵخۆش بووبە پرسیارکردنی من لەوخزمەتکارە، هەرچەندە یادگاریەکان تاڵ بوون، بەڕاستی ئەو پێچەوانەی ئێمە بوو، دڵێکی باشی هەبوو..

ئەو تێکەڵاوییەی لەیاد نەکردبوو کەبەیەکەوە بووین، بەڵام ئێمە لەبیرمان کردبوو... سەرئەنجام کەل‌و پەلەکانی کۆکردەوەو لەگەڵما گەڕایەوەو ڕێگەکەی ئەزانی‌و من دەستم گرتبوو.. کچەکە لەگەڵما مایەوەو چاودێری‌و خزمەتیشی ئەکەم لەگەڵ کوڕەزاکانی خۆمدا کە ئەوانیش کوێرن، ئاواتەخوداز‌و دوعا خودازم کە پەروەردگار لێم خۆشبێت لەوەی کەڕوویدا، بەڕاستی تەنها خودا خاوەن بەزەیی‌و لێخۆش بوونە.

ئێستا من بەو کەسانە ئەڵێم کە بەزەیی لەدڵیاندا نیە:

ئەگەر توانات هەبووستەم مەکە، چونکە ستەم سەرەکێشێ بۆ پەشیمانی، چاوەکانت ئەخەون‌و ستەم لێکراو بەئاگایە، دوعات لێدەکات‌و چاوی خوداش هەرگیز ناخەوێت.

## نکوڵی کردن لەمافی خەڵکی

(ترکی محمد) ئەدوێت‌و ئەڵێت: دووسەد ڕیاڵم لەپیاوێك قەرزکرد بۆ تەواوکردنی یەکێك لەپرۆژەکانم، دوای کۆتای هاتنی ماوەی قەرزەکەم، خاوەنی پارەکە هاتەوە بۆئەوەی پارەکەی بۆ بگێڕمەوەو داوای مافەکەی خۆی لێکردم، بەڵام من هەستام بەدەرکردنی‌و نکوڵیم کرد لەوەی کە پارەی لام بێت، بەتایبەت کەهیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نەبوو، چونکە بەڵێن نامە لەنێوانماندا نەبوو، نەم ئەزانی چی چاوەڕێم ئەکات بەهۆی ئەو ستەمەی کەئەنجامم دابوو، دوای سێ مانگ زەرەرێکم کرد بەبڕی نیو ملیۆن ڕیاڵ، لەو ڕۆژەی زەرەر یەخەی گرتبووم، هاوسەرەکەم ئامۆژگاری ئەکردم بەگەڕانەوەی ئەو بڕە پارەیە بۆ خاوەنەکەی‌و ئەیووت: ئەوەی ڕوویداوە سزای خودایە، بەڵام بەداخەوە گوێم لێ نەگرت‌و بەردەوام بووم لە خۆ بەزل زانین‌و نکوڵیکردن بەبێ هیچ گوێ پێدانێك، یاخود بەبێ گوێدانە چاودێری خودایی.

هەتاوەکو خۆشەویسترین شتانی ژیانم لەدەستدا، ئەویش لەدەست دانی سێ منداڵەکەم بوو لە ڕووداوی ئۆتۆمبێل لەکاتی گەڕانەوەمیان لەشاری (دەممام).

لەدوای ئەو ڕووداوە دڵ تەزێنەوە بڕیارمدا بەبێ دودڵی پارەکە بۆ خاوەنەکەی بگێڕمەوەو دوای لێبوردنی لێبکەم، هەتاوەکو خودای گەورە بێ بەشی نەکردووم لە هاوسەرومنداڵە حەوت ساڵەکەم، کە ئەوان هەموو شتێکی من بوون لەدوای خودای گەورە.

## تۆمەتێکی پوچ و بێ بنەما

(نورە عبدالله) مامۆستای زانکۆیە دووجار تەڵاق دراوەو ئەڵێت: چیرۆکەکەم پێش حەوت ساڵ لەگەڵ ستەمدا ڕوویدا، دوای تەڵاقی دووەمم بڕیاری شوکردنمدا بەخزمێکم، کە ژیانێکی هێمنی بەسەر ئەبرد لەگەڵ ژنەکەی و پێنج منداڵەکەیدا .

لەگەڵ کوڕی پورەکەمدا ڕێك کەوتین لەسەر ئەوەی تۆمەتێك بۆ ئەم ژنە هەڵبەستین، کە خیانەتی لەمێردەکەی کردووە، بۆ ئەوەی ئەو پیاوە ژنەکەی تەڵاق بداتو کوڕی پورەکەم مارەی بکات چونکە زۆری خۆش ئەویستو پاشان منیش شوبەو پیاوەبکەم. هەستاین بەبڵاوکردنەوەی تۆمەتەکە لەناو خزمو کەسدا، لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا لەپلانەکەماندا سەرکەوتوو بووین، بەشێوەیەك ژیانی خێزانییان تێکچوو، هەتا گەیشتە تەڵاق دان، تەڵاق تەواو بوو.

فرمێسك لەچاوەکانی قەتیس مابوو ووتی: دوای ساڵێك ئەو ژنەی کەنێمە بووین بەهۆی تەڵاق دانی شوی کرد بەپیاوێکی خاوەن دەسەڵاتو پایە بەرز، پیاوەکەشی کەمن بەتەما بووم شووی پێ بکەم، بێ گومان ژنێکی تری هێنا..

سەرەنجامی ستەمی خۆشمان، من تووشی شێرپەنجەی خوێن بوومو کوڕی پوورەکەشم بەتەزووی کارەبا سووتا لەگەڵ شاهیدی دووەم لەو شوقەیەی کە تێیدا نیشتەجێ بوون، ئەمەش سێ ساڵ دوای تەڵاقەکە.

## خراپ بوونی کێڵگەکەم

(سعد سالم) ئەڵێت: کێڵگەیەکی تایبەت بەخۆم هەبوو، لەتەنیشتیەوە پارچەیەك زەوی کشتوکاڵی هەبوو، زۆر هەوڵم لەگەڵ خاوەنەکەیدادا تاوازی لێبهێنێت، بەڵام قبوڵی نەکرد.

لەکۆتاییدا بڕیارم دا ئەگەر بەزۆریش بووە زەوی یەکە بەدەست بهێنم، بەتایبەت ئەمزانی خاوەنەکەی هیچ بەلگەیەکی نیە بۆ سەلماندنی خاوەندارێتی زەوی یەکەی، چونکە لەباوکی یەوە بۆی مابۆوە.

دووشایەتم ئامادەکردو بۆ هەریەکەیان شەست هەزار ڕیالم ئامادەکرد لەبەرامبەر شایەتی دانیان لەدادگادا، کە من خاوەنی شەرعی ئەو زەویەم، دوای چەند دانیشتنێکی دادگا توانیم زەویەکە بەدەست بهێنم.

زۆر هەوڵمدا بیکەم بەکشتوکاڵ، بەلام بێ سوود بوو، لەگەڵ ئەوەی کە پسپۆڕەکان بۆیان ڕوون کردمەوە کە زەوی یەکی گونجاوە بۆ کشتوکاڵ، بەلام کێلگە تایبەتەکەی خۆم تووشی مێروو بوو، بەڕادەیەك لەکاتی دروێنەدا ماڵو سامانێکی زۆرم لەکیس چوو، ئەمەو چەند ڕووداوێکی تریشم تووش بوو، خەریك بوو خۆشم تیابچم.

لەکۆتایدا هەستام بەگەڕاندنەوەی زەوی یەکە بۆ خاوەنەکەی، لەوانەیە بڕوانەکەی ئەگەر بڵێم: ئەو زەویەی کەهیچ بەرهەمێکی نەبوو ئێستا زۆر بەرهەمەکەی لە کێڵگەکەی من چاکترە، نەخۆشی زەوی یەکەش هەرنەماو ئاسەواریشی دیار نەما.

سوپاسی خودا ئەکەم کەڕێنمایی کردمو یارمەتی دام بۆ گەڕاندنەوەی زەویەکە بۆ خاوەنەکەیو ئامۆژگاری هەموو ئەو کەسانە ئەکەم کەنەفسو هەواو ئارەزویان فریویان داون بۆ ستەم کردن، کە پەندو ئامۆژگاری لەمنو هەموو ستەم کارێك وەرگرن، چونکە ستەم ئەنجامەکەی تەنها زەرەرو زیانە.

## ئابڕوو بردنی خوێندکارێك

(حەمەد بەدر) ئەڵێت: پێش هەشت ساڵ کاتێك خوێندکاری ئامادەیی بووم، دەمە قاڵێ لە نێوان منو یەکێك لە قوتابی یە زیرەکەکاندا ڕوویدا، بڕیارمدا کە داهاتووی بڕوخێنمو تێکی بشکێنم.

ناکرێو ناتوانم ئەو ڕۆژە لەیادەوەریمدا بسڕمەوە، شەیتان وەسوەسەی خستە دڵمەوە، ڕۆژێکیان بەیانی زوو چووم بۆ خوێندنگا، هەندێك جگەرەی حەشیشەم پێ بوو کە ئەمان کێشا، لە جانتای ئەو قوتابیەدا دام ناو داوام لەهاوڕێ کەم کرد کە بە پۆلیس ڕابگەیەنێ کەفرۆشیاری مادده بێ هۆشکەرەکان لێرەیە، لەم کارە شەیتانیەماندا سەرکەوتوو بووین،

بەڵام ئێمە مادده بێ هۆشکەرەکانمان بەکار ئەهێنا، لەو ڕۆژەوە من بەرەو ڕووی بەرنامەی ستەمەکەم ئەبمەوە.

لە دوای دوو ساڵ تووشی ڕووداوی ئۆتۆمبیل بووم‌و بەو هۆیەوە دەستی ڕاستم لەدەست دا.. دوای ڕووداوەکە چووم بۆ ماڵیان‌و داوای لێبوردنم لێی کرد، بەڵام بەهیچ شێوەیەك قبوڵی نەکرد، چونکە من بووم بەهۆی لەکەدارکردنی ناوبانگی لەناو خزمەکانیدا، بەهۆی ئەو بوهتانەی منەوە بوو بەکەسێکی بێزراو لەلای هەموویان، پێی ووتم: کە هەموو شەوێك دوعام لێ دەکات، چونکە بەهۆی ئەو ناوزڕانەوە هەموو شتێکی لەدەست دابوو.

بەردەوام ئەبێت‌و ئەڵێت: لەگەڵ لەدەست دانی دەستم لەسەر کورسیەکی بەدەست جوڵاو دانیشتووم، لەئەنجامی ڕووداوێکی تر.. بەڕاستی ئێستا ژیانێکی بەدبەختی بە سەر ئەبەم، ئەوەی زۆر لێی ئەترسم مردنە، چونکە بەڕاستی لەسزای پەروەردگار ئەترسم، داوای لێخۆش بوون لەخودا ئەکەم‌و یارمەتی ئەویش بدات کەلێم خۆش بێت.

## مردو تەنها یەك ڕکات نوێژی بۆ خودا نەکرد

چیرۆکێکی ڕاستەقینەیەو شێخ إبراهیم عبدالعزیز لە (سایتی ئەهلی سوننەو جەماعە)وە ئەگێڕێتەوەو ئەڵێت: گەنجێك پێی ووتم: یا شێخ ئەو پیاوە پیرە ئەبینیت؟

شێخ: بەڵێ، بەڵام چییەتی؟

ووتی: نوێژناکات.

شێخ: پاك‌و بێ گەردی بۆخودا، ئەڵێی چی؟ نوێژناکات؟

ووتی: بەڵێ نوێژناکات.

شێخ: تۆ دڵنیایی؟

بەڵێ دڵنیام.

شێخ: بەم تەمەنەوە نوێژ ناکات؟

گەنجەکە پێی ووتم: یاشێخ بابڕۆین بۆلای‌و قسەی لەگەڵ بکە، بەڵکو نوێژ بکات.

شێخ ئەڵێت: ڕۆیشتم بۆ لای پیاوە پیرەکەو پێم ووت: براکەم سڵاوی خودات لێبێت.

پیاوە پیرەکە: سڵاوو بەرەکەت‌و ڕەحمەتی خودا لەتۆش بێت.

شێخ: براکەم چۆنی؟

پیاوە پیرەکە: باشم، سوپاس بۆ خودا.

شێخ: ئەوەی لەبارەی تۆوە ئەیڵێن ڕاستە؟

پیاوەپیرەکە: چیم لەبارەوە ئەڵێن؟

شێخ: ئەڵێن نوێژ ناکەیت؟

پیاوە پیرەکە: ترسام وامزانی شتێك ڕوویداوە، ئەمە ئەڵێن لەبارەی منەوە؟

پیاوە پیرەکە ووتی: ڕاستە، نوێژناکەم.

شێخ: بەم تەمەنەوە نوێژناکەیت؟!

پیاوە پیرەکە: ڕاستە نوێژناکەم، بەڵام دڵم پڕە لەباوەڕ، من سوپاس بۆ خودا باوەڕدارم، داواکارم لەخودا کە هیدایەتم بدات نوێژ بکەم.

شێخ: دڵت پڕە لەئیمان؟! ئەمە ڕاست نیە، ئەگەر دڵت پڕبوایە لەئیمان ئەندامەکانی لاشەت فرمانەکانیان جێ بەجێ ئەکرد، ئەمەیە کەپێغەمبەر(ﷺ) هەواڵمان پێ ئەدات و لەبارەیەوە ئەفەرموێت: (**ألا وإن في الجسد مضغة، إذا صلحت صلح الجسد كلة، وإذا فسدت فسد الجسد كله، ألا وهي: القلب**). (متفق عليه). واتە: (بێ گومان لە لاشەی مرۆڤدا پارچە گۆشتێك هەیە، ئەگەر باش بوو هەموو لاشەی مرۆڤ باش ئەبێت، ئەگەر خراپیش بوو ئەوا هەموو لاشەی مرۆڤیش خراپ دەبێت، ئەویش بریتیە لە: دڵ).

بەهۆی لاوازی ئیمانتەوەیە کە نوێژ ناکەیت، خۆت فریو مەدە بەم قسانە، بگەڕێوە بۆ لای خودا، پیش ئەوەی شتەکانت لەدەست دەرچێت.

پیاوە پیرەکە: بەڵام چی ئەبێت ئەگەر نوێژەکانم وازلێبێنم؟ من ئیماندارم و بێ گومان خودای گەورە بەڵێنی بەهەشتی بەئیمانداران و باوەڕداران داوە، تەنانەت ئەوانەی کە تاوانی گەورەش ئەنجام ئەدەن، بۆچی بێ هیوا ئەبیت لەبەزەیی خودا، کە هەموو شتێکی گرتۆتەوە.

شێخ: من بێ هیوات ناکەم لە بەزەیی خودا، بەڵام نامەوێت لەبێ ئاگایان و زەرەرمەندان بیت.. بزانە کەنوێژ کۆڵەکەی دینە، هەرکەس ئەنجامی بدات ئەرکی ئایین و دینەکەی ئەنجام داوە، هەرکەسیش بەفیڕۆی بدات دینی بەفیڕۆداوە، بەڵکو نوێژ جیاوازی نێوان ئیماندارو بێباوەڕە، یەکەم شتە کەلێپرسینەوەی لەسەر ئەکرێت لەڕۆژی دوایدا.. خودای گەورە لەبارەی ئەهلی ئاگرەوە ئەفەرموێت: ﴿ مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ

﴿...﴾ (٤٣) المدثر. واتە: (ئەوە چی بوو ئێوەی ڕاپێچی دۆزەخ کرد؟! بەکەساسیەوە ئەڵێن: ئێمە لە نوێژ کەران نەبووین).. هەروەها ئەفەرموێت:﴿ فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا (٥٩) ﴾ مریم. واتە: (لەدوای ئەوانە کەسانێك لەنەوەکانیان بوونە جێنیشین،کە نوێژەکانیان بەزایەداو شوێنی ئارەزووەکانی نەفسیان کەوتن، ئەوانە توشی گومڕایی‌و سەرگەردانی‌و سزا ئەبن لەدنیاو قیامەتدا) .

چۆن دوای هەموو ئەمانە ناگەڕێیتەوە بۆلای خوداو نوێژ ناکەی؟!

پیاوە پیرەکە: ئەمەوێت نوێژ بکەم، بەلام...

شێخ قسەکەی پێ بڕی‌و ووتی: بەبێ بەلام، پیاوی پیر تۆ ناتوانی زەمانەتی تەمەنی خۆت بکەی، بێ گومان تەمەن بەدەستی خودای گەورەو بێ گەردەو هەموو مرۆڤێك سەرنجامی مردنەو خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوۡنَ أُجُورَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ فَمَن زُحۡزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدۡخِلَ ٱلۡجَنَّةَ فَقَدۡ فَازَۗ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ (١٨٥) ﴾ آل عمران. واتە:(هەموو کەسێك ئەبێت بمرێت‌و مردن بچێژێت، تەنها لەڕۆژی قیامەتدا کرێ‌و پاداشتان بەتەواوی پێ ئەدرێت، ئەوسا ئەوەی دوور خرایەوە لەئاگری دۆزەخ‌و خرایە بەهەشتەوە ئەوە بەڕاستی سەرفراز بووە، ژیانی دونیاش جگە لەوەی ڕابواردنێکی خەڵەتێنەر، شتێکی تر نیە).

چۆن تۆ ئەبینەم گرنگی بەدونیا ئەدەیت‌و وازت لەڕۆژی دوای هێناوە، تۆ بەباشی ڕاستی ئەم دنیایە ئەزانی، کە ئەم دنیایە زیندانی ئیماندارەو بەهەشتی بێ باوەڕە، تۆ گەیشتویتە تەمەنێك با لەڕۆژی دوایدا لەتیاچوان نەبیت.

پیاوە پیرەکە: باشە .. گوێ بیستی قسەکانت بووم‌و باش تێگەیشتم، تۆش ئەوەی لەسەرت بوو ئەنجامتدا، ئێستاوازم لێ بێنەو بابڕۆم، پاشان لای منی بەجێهێشت‌و ڕۆیشت.

شێخ: من ئامۆژگاریم کردی‌و کارەکە بۆ خۆت ئەگەڕێتەوە.

شێخ ئەڵێت: دوای دووڕۆژ گوێم لەدەنگێك بوو بانگی ئەکردم یاشێخ..یاشێخ..

ئاوڕم دایەوە ئەوگەنجەم بینی، کەهەواڵی پیاوە پیرەکەی پێدام‌و ووتی: یاشێخ ئەو پیاوە پیرەت لەیادە کە پێرێ قسەت لەگەڵی کرد.

شێخ:بەڵێ، باش لە یادمە.

گەنجەکە: ئەوپیاوە مرد.

چی ئەڵێی:مرد!!! تۆ دڵنیایی؟

بەڵێ، دوێنێ بەیانی مرد.

شێخ: پاكو بێ گەردی بۆ خودا، بەچ شێوەیەك مرد؟

گەنجەکە: لەبەیانیدا ئەچێت بۆ کێڵگەکەی خۆی، پاچەکەی بەدەستەوە ئەبێت، ئەکەوێتو پاچەکە بەرسەری ئەکەوێتو یەکسەر ئەمرێت، بەڵام یا شێخ شتێکی زۆر سەیرم لێ بینی.

شێخ: چیت بینی؟

گەنجەکە: بەداپۆشراوی لە زەویەکەدا بینیم، کە دوور بوو لەڕێگای گشتی یەوە، داوای ئۆتۆمبیلێکی فریاکەوتنم کرد بۆئەوەی بیگوازێتەوە، بەڵام ئۆتۆمبیلەکە دواکەوت بەهۆی سەختی ڕێگاوبانەوە، لەوەش سەیرتر یاشێخ! ئۆتۆمبیلەکە تێك چوو، خەڵکەکە پێویستیان بەئۆتۆمبیلێکی تر بوو بۆ گواستنەوەی تەرمەکە.

شێخ: ئەی خودایە !! چیتر ڕوویدا؟

گەنجەکە: تەرمەکە لەبەر خۆر ماوەیەکی زۆر مایەوە، کە دارێك یان سێبەرێك نەبوو تەرمەکەی لەژێردا دابنێین، هەتاوەکو ناوساو شێوەکەی گۆڕا بۆ شێوەیەکی تۆقێنەر، دوای کاتێکی کەم ئۆتۆمبیلێکی ترهات، تەرمەکەی هەڵگرتوبردی، بەڵام لەڕێگا...

شێخ: چی بەسەر هات؟

گەنجەکە: ئۆتۆمبیلەکە لەکارکەوتو وەستا!

شێخ: الله أکبر، دوای ئەمە چی ڕوویدا؟

گەنجەکە: ئۆتۆمبیلێکی تریان هێنا، تا دوای نوێژی نیوەڕۆ تەرمەکە نەگەیەنرایە شوێنی شۆرین، دوای شۆرینی تەرمەکەو نوێژکردن لەسەری برا بۆ گۆڕستان، لەوێ شتێکی زۆر سەیرتر ڕوویدا !

شێخ: چی ڕوویدا؟

گەنجەکە: خەڵکەکە کاتێك وویستیان تەرمەکە بکەنە گۆڕەوە، بینیان گۆڕەکە تەسکەو پێوەی ناچێ، بەتایبەت کە تەرمەکە ئاوسابوو، نەیانتوانی بینێژن، تەرمەکەیان لەسوچێکی

گۆڕستانەکە داناو گەڕان بەدوای گۆڕێکی تردا، بەڵام تا دوای نوێژی ئێوارە گۆڕێکی تریان نەدۆزیەوە! بڕوانە شێخ چی بەسەر ئەو پیاوە پیرەدا هات؟

شێخ: پاكو بێ گەردی بۆ خودا، ئەگەر بیزانیایە چی لێدێت تا گیانی دەرئەچوو وازی لە کڕنوش بردن نەئەهێنا، بەڵام بەهیوا بوون مرۆڤ توشی بێ ئاگایی ئەکات، والەمرۆڤ ئەکات تەنها بیر لەدونیای بڕاوە بکاتەوە، براکەم...خوشکەکەم... ئەم چیرۆکە بۆ خەڵك بگێڕەوە! چونکە بەڕاستی ئامۆژگاری باشی تێدایەو یادهێنەرەوەیەکی چاکیشە، یادهێنانەوەش سوودی بۆ ئیمانداران هەیە.

پەروەردگار داوای جێگیریت لێ ئەکەین لەسەر ئەم ئاینە، هەروەها داوای خۆشەویستی خۆتو گوێ ڕایەڵیت لێ ئەکەین هەتا ئەگەین بەلیقای خۆتو تۆش لێمان ڕازی ئەبیت ئەی بەبەزەیی ترینی بەزەییەکان.

## لە زانكـــــۆ

لەیەكێك لەکۆلێژەکانی وڵاتێکی عەرەبیدا قوتابیەکی عەلمانی وەستابوو، دەستی گرتبوو بەکاتژمێرەکەیەوەو هاواری ئەکردو دەیووت: ئەگەر خودا هەیە بامرێنێ دوای کاتژمێرێکی تر...

دیمەنێکی زۆر سەیر بوو کەقوتابیانو مامۆستایان بینیان، کە کاتژمێرەکە تەواو بوو قوتابیەکە هەڵبەزییەوەو بەشانازیو لەخۆبایی بوونەوە بەهاورێکانیووت: بینیتان ئەگەر خودا هەبوایە ئەی مراندم، قوتابیەکان بڵاومیان لێ کرد، هەشیان بوو کەشەیتان وەسوەسەی بۆ دروست ئەکرد، هەشیان بوو ئەیووت: خودای گەورە مۆڵەتی پێداوەو حیکمەتی خۆیەتی...هەشبوو گاڵتەی پێ ئەهاتو سەری بائەدا.

ئەم گەنجەی باسمان کرد بەدڵخۆشیەوە گەڕایەوە بۆماڵەوە، وەکو ئەوەی بەبەڵگەیەکی زانستیو زیری سەلماندبێتی کە خودا نیەو کەس لەپێش ئەمدا ئەم کارەی نەکردووە، وە مرۆڤ هەروا دروست کراوەو پەروەردگارێکی نیەو پرسیاری لێناکرێ.

چووە ژوورەوە بۆماڵی خۆیانو دایکی نانی نیوەڕۆی ئامادەئەکرد، باوکی لەجێگەی خۆی دانیشتبوو لەسەر سفرەی نان خواردن چاوەڕێی ئەکرد، کوڕەکە بەپەلە چوو بۆسەر ئاو یان بۆ گەرماوەکە، چووەژوورەوەو نەگەڕایەوە، زۆر چاوەڕوانیان کرد، دایکی هەستا لەدەرگایدا،

کوڕی خۆشەویستم بۆ دواکەوتی؟ وەڵامی نەدایەوە، باوکی بەخێرایی هاتو دەرگاکەی کردەوە، شتێکی بینی بەخەیاڵیا نەئەهات، کوڕەکەی لەتەنیشت دەست شۆرەکەوە بینی، کە تەرمێکی ساردوسڕبوو... بەڵێ.. کەوتو مرد، لەدوایدا پزیشك لەراپۆرتی مردنەکەیدا بۆی دەرکەوتووبوو کەهۆی مردنەکەی چوونە ژوورەوەی ئاو بوو بۆناو گوێی.

دکتۆر عبدالله نوفل ئەڵێت: خودای گەورە ئەی هێشت وەك مرۆڤ بمرێت، بەڵکو چۆن گوێ درێژ ئەمرێت ئەوها مرد، بەسەلماندنی زانستی زانراوە ئەگەر گوێ درێژو ماین ئاو بچێتە گوێیانەوە هەرلەو کاتەدا ئەمرن، ئایا ئەمە جێگەی پەندوئامۆژگاری نیە؟!

## وتووێژێکی شەیتانی

بەپەنجەکانی یاری بەژمارەی تەلەفۆنەکەئەکرد... لەخۆیەوە ژمارەیەکی لێدا..منداڵێك وەڵامی دایەوەو کابرا ووتی: ئەلو..ئەلو.

منداڵەکە: ئەلو.. فەرموو.. تۆکێی؟

کابرا:تەمەنت چەندە؟

منداڵەکە: شەش ساڵ.

کابرا: ماشاءالله.. پیاوی شوکر.. ئێستا کەس لەتەنیشتتەوەیە؟

منداڵەکە: نەخێر.. تۆ کێی؟

کابرا: من مامتم!

منداڵەکە: بەخۆشیەکی زۆرەوە: مامە تۆی؟

کابرا: بەدەنگێکی کزۆڵەوە: بەڵێ ..بەڵێ.. منم.. خوشکەکانت لەکوێن؟

منداڵەکە: خوشکم نیە..!

کابرا: باشە ئێستا کێت لایە؟

منداڵەکە: بەس کارەکەرەکە؟

کابرا: جوانە؟

منداڵەکە: هیچ جوان نیە.

کابرا: دایکت لەکوێیە؟

منداڵەکە: خۆی ئەشوات..

کابرا: خوداحافیز.. تەلەفۆنەکە دائەخات.. دوای چەند دەقیقەیەك.. دووبارە پەیوەندی ئەکاتەوە.

کابرا: ئەلو.. ئەلو..

منداڵەکە:فەرموو..کێیە؟ مامەی؟

کابرا: نا.. دایکت لەکوێیە؟

منداڵەکە: لەژووری نوستنە.

کابرا: ئێستا چی لەبەردایە؟

منداڵەکە: جل‌و بەرگێکی سووری زۆر جوان..

کابرا:دەی خوداحافیز.. تەلەفۆنەکە دائەخاتەوەو جارێکی تر دوای چەند دەقیقەیەك..

کابرا: ئەلو..ئەلو.. ئەمجارە باوکی منداڵەکە وەڵام ئەداتەوە!

باوك: ئەلو..بەڵێ ..کێم لەگەڵدایە؟

کابرا: بەدەنگێکی گاڵتە ئامێزەوە: ئەی نەفام ..دیارە ئێستا لەدەوام هاتوویتەوە؟

باوکی منداڵەکە: تۆ کێی واقسە ئەکەی...چیت ئەوێت؟

کابرا: تورە مەبە ..ئەمەوێت بەڕاشکاوی قسەت بۆ بکەم، تۆ ژنێکی جوانت هەیە.. زانیوتە هەڵی بژێریت .. ئەی نەفام.. پێت ئەڵێم ئەگەر حەزیش ئەکەی باوەڕ مەکە، پێش کەمێك لەگەڵ ژنەکەتدا خەوتبووم.. تەنانەت داوام لێکرد کە جل‌و بەرگی سوور لەبەر بکات .. تەلەفۆنەکەی داخست.

باوکی منداڵەکە: نامەردی کەم ڕەوشت.. تەلەفۆنەکە فڕێ ئەداتو بەخێرایی ڕائەکات بۆ نهۆمی سەرەوە، ئەچێتە ژووری نوستنەکەوە، ژنەکەی ئەبینێ جل‌و بەرگی سووری لەبەردایە.. سەرو قژیشی تەڕەو لەبەردەم مێزی خۆجوان کردنەکەدا دانیشتووەو خۆی ئەڕازێنێتەوە.. ڕای ئەکێشێتو سەری ئەکێشێت بەناوێنەکەدا.. پاشان ئەیداتە بەرشەقو بەلێدانێکی زۆر خراپ لێی ئەدات.

ئەڵێت: لەماڵەکەم دەرچۆ ئەی داوێن پیس، تۆ لەماڵێکی سەربەرزەوە نەهاتووی.

ژنەکە سەیری ئەکردو نەیئەزانی پیاوەکەی بۆ بەم شێوەیە ڕەفتار ئەکات لەگەڵیدا.. نەیئەزانی چی بڵێتو چۆن وەڵامی بداتەوە..شتەکانی کۆکردەوەو ڕۆیشت بۆ ماڵی باوکی.. باوکی منداڵەکە بەسەرسامییو توڕەییەوە دانیشتو نەیئەزانی چی بکات، سەری سوڕمابوو،

سکاڵای خۆی بۆلای کێ بەرێت؟! بەم شێوەیە مایەوە، ماوەی دووڕۆژ نانێکی بەخۆشی نەخواردو خەو نەچووە چاوی..

بەڵام خودای گەورە کابرای خراپەکاری فەرامۆش نەکردو بەڵکو بەخێرایی تۆڵەی لێکردەوە... چەندان کاتژمێر لەسەر جێگا ڕائەکشێت‌و خەوی لێناکەوێت، بەم حاڵەوە مایەوە، چەند ڕۆژێك تێپەڕی‌و لەشی داهێزراو دونیا لەلای تەسك بۆوە، ئەیویست بۆ ساتێکیش بێت بخەوێت، بەڵام نەیئەتوانی..

بەدرێژایی شەو بیری لەوەئەکردەوە کەلەگەڵ ئەو ئافرەتەدا کردی، کەبووە هۆی جیابوونەوەی لەمێردەکەی، بەوتووێژێکی تەلەفۆنی شەیتانانە.

سەرەنجام پرسیاری لەمامۆستایەك کردو ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە.

مامۆستاکە پێی ووت: بەخودا هیچ چارەسەرێکت نیە، جگە لەوەی کە لەبەردەم ژن‌و پیاوەکەدا دان بەتاوانەکەتدا بنێیت، سا بەڵکو لێت خۆش بن‌و ئیسراحەت بکەیت‌و بۆ حاڵەتی سروشتی خۆت بگەڕێیتەوە..

کابرا ووتی: من ئامادەم، گرنگ ئەوەیە بخەوم، چونکە مێشکم تێك چووە!

مامۆستا: کەوابێ ئێستا بڕۆ پەیوەندی بەباوکی منداڵەکەوە بکەو کاتی چاوپێکەوتنی لێوەربگرە.. منیش ئامادەم بێم لەگەڵت.. پەیوەندی پێوەکردو کاتەکەش دیاری کرا..مامۆستاو کابرا چوونە ژوورەوەو پێشوازی لێکردن.

مامۆستا بەپێشەکیەك دەستی پێکردو باسی ئەو ئایەتانەی خودای گەورەی ئەکرد، کەبەگەورەییەوە باسی ئەو کەسانە ئەکات کەلە خەڵکی ئەبورن..پاشان بەکابرای خراپەکاری ووت: بەڕاشکاوی ئەوەی ڕاستە بەمێردی ژنەکەی بڵێ.

کابرا دەستی بەقسەکردن کردو پیاوەکەش گوێی گرتبوو، قسەکانی تەواو نەکرد، کەمێردی ژنەکە ڕاستی بۆ دەرکەوت، هەستاو بەتوندی کێشای بەکابراداو خوێنی لەبەر ڕۆیشت، مامۆستا هەوڵیدا نێوانیان بکات، دوای ئەوەی زۆری لەکابرادا، مێردی ژنەکە هێور بۆوە.

مامۆستا پێی ووت: کاکە سوپاس بۆ خودا ڕاستی دەرکەوت‌و لێبوردنیش بەخشندەییە، خێزانیشت پاك‌و بێ گەردە، لەبەر خاتری خودا لێی خۆشبە خودا لێت ڕازی بێت.

مێردی ژنەکە لەلێدانی کابرادا هەناسەبڕکێی پێکەوتبوو و ووتی: بەڵێ بەڵام بەمەرجێك ئەویش ئەوەیە ئەم تاوانبارە خۆی دان بەم تاوانەدا بنێت لەبەردەم خێزانەکەمدا، تاببێتە بیانویەك بۆ منو ژنەکەم بگەڕێتەوە.

کابرا: من ئامادەم.. گرنگ ئەوەیە بخەومو خەوم لێ بکەوێت.. ڕۆیشت بۆ ماڵی ئافرەتەکەو لەژووری میوان دانیشتن لەگەڵ برای ژنەکەدا، پاشان مێردی ژنەکە داوای لەژنەکەی کرد، کە گوێ بگرێت لە مامۆستاو کابرای تاوانبار.. ژنەکە هات، کابرا دەستی بەگێڕانەوەی ڕووداوەکە کرد، برای ژنەکە هەستاو زۆر بەخراپی لێیداو وەخت بوو لەهۆش خۆی بچێت.. مامۆستا هەندێك ئایەتی قورئانی خوێندو کەوتە ناوبژیان.

پاشان ژنەکە هەستاو لێدان وەستێنرا. هەموو چاوەڕێ بوون کە بزانن چی ئەڵێت! کەوتە قسەو ووتی: سوپاس بۆ خودا کەڕاستی ڕووداوەکەی بۆمان دەرخست، بەڵام بەداخەوەو ناکرێ‌و زۆر مەحاڵە بگەڕێمەوە بۆ ماڵی مێردەکەم، ناگەڕێمەوە بۆ ماڵی کەسێك، کە لێم بداتو هەڕەشەی تەڵاقم لێبکات، تەنها لەسەر وتووێژێکی بێ بنەماو هیچ‌و پوچ. ئەمە مانای ئەوەیە کەهیچ متمانەیەك لەنێوانماندا نیە، ناتوانم لەگەڵ کەسێکدا بژیم کە متمانەی پێم نەبێت، ئینجا دانیشتنەکەی بەجێهێشتو دووبارەی کردەوە کە ئەمە دوا وەڵامە بۆیان.. منیش ئەڵێم: خودای گەورە ڕاستی فەرمووە کاتێك ئەفەرموێت:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوْمًۢا بِجَهَـٰلَةٍ فَتُصْبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَـٰدِمِينَ ﴿٦﴾ ﴾ الحجرات . واتە: (ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە ئەگەر کەسێکی متمانە پێ نەکراو هەواڵێکی گرنگی بۆ هێنان، خێرا بڕوای پێ مەکەن، بەڵکو لێی بکۆڵنەوە تا بۆتان ڕوون ئەبێتەوە، نەوەکو ئازارو نارەحەتی‌و ناخۆشی بۆ خەڵکی دروست بکەن بەنەزانی، پاشان پەشیمان بنەوە لەو کارەی پێی هەڵستاون).

## شەرمەزاری‌و ڕیسوایی

خۆی ئەمە لەبارەی خۆیەوە ئەڵێت: لە قوتابخانە هەڵهاتم، چونکە ژوانم هەبوو لەگەڵ گەنجێکدا.. هەڵهاتم بەڵام نەمزانی چی چاوەڕێم ئەکات.. گەنجەکە هاتو لەگەڵیدا سەرکەوتم بۆ ناو ئۆتۆبیلەکەی، هەردوکمان دەرچووین‌و لەوپەڕی خۆشیدا بووین.. شەیتان

خەیاڵ پلاوی بۆ کردبووین، ئەمە تەنها چەند چرکەیەکی کەم بوو خۆشیەکە گۆڕا بۆناخۆشیو بەدبەختی، بێ گومان تووشی کارەساتێك بووین، بەڵام بەساغی ڕزگار بووین، چەند دەقیقەیەك دوای ئەوە پۆلیس گەیشتە ئەوێ، هاوڕێ کەم سەرقاڵی لێکۆڵینەوە بوو لە ڕووداوەکەو ئەترساین لە ئابڕوچوونمان، چونکە ئەخزمی بومو ئەخوشکی، گوێم لێ بوو پەیوەندی کرد بەهاوڕێیەکیەوە، کەبەشداری لەگەڵ ئەکرد لەکاری خراپەو تاوانداو پێی ووت: ئەمەوێت تائێرە بێی بۆ(شوێنی ڕووداوەکە) تائەم کچە بەرێت بۆ شوقەکە بەهۆی سەرقاڵ بوونم بەم ڕووداوەوە.

کاتێکی کەمی پێچوو کوڕەگەنجەکە ئامادەبوو تا بەم بات، من سەرپۆشێکم لەسەرابوو، لەگەڵ هاوڕێ کەیدا ڕووم کردە ئۆتۆمبیلەکە.. سەرم بەرزکردەوە تاسەیری بکەم، ئەوەی بینیم ترساندمی، ئەوەی ئەو پەیوەندی پێوەکردبوو، براکەی خۆم بوو، کەهەرگیز چاوەڕوانم نەئەکرد، کۆتایی هات..الله أكبر.. چۆن قەرز ئەکەیت ئاوا لێت ئەسەننەوە.

ئیمامی شافیعی ئەفەرموێت: پاك بن تائافرەتەکانتان پاك بن لەماڵەوە، دوور کەونەوە لەوشتانەی کە شایستەی موسوڵمان نین، وەبزانە زیناکردنو داوێن پیسی قەرزە لەسەرت ئەبێت بیدەنەوە. ئەی ئەوکەسەی حورمەتی پیاو ئەشکێنی، ڕێگای خۆشەویستی لەناو ئەبەیتو بەبێ ڕێزی ژیاویت، ئەگەر ئەومیەکی باشو چاك بویتایە، ئابووی بەشکێنەری حورمەتی موسوڵمانێك.

## بە چ تاوانێك کوژرا

جیهانی ماددە بێ هۆشکەرەکان جیهانێکی سەیرە.. پڕە لەڕووداوی زۆر سەرسوڕهێنەر، کە زمانو قەڵەم لە باسکردنی دەستەوەستانن.

ئەمە یەکێکە لە لاپەڕەکانی ئەو جیهانە، چیرۆکی ئەگبەتیەکانی خێزانێك، کە بەهۆی باوکێکی زاڵمەوە توشیان هات، دڵی کرمێیە بەبازرگانی کردن بەماددە بێ هۆشکەرەکانەوە، کەگوێی پڕە لەناڵە ناڵی کوڕو کچەکانی.

ڕۆژێك لەڕۆژان، لەکاتی کارەکەمدا لە یەکێك لە بەڕێوەبەرایەتیەکانی لەناو بردنی ماددە بێ هۆشکەرەکانەوە.. فەرمانم پێ کرا بەدەست گیرکردنی یەکێك لەوانەی کە ماددە بێ هۆشکەرەکان بلاو ئەکاتەوە، بەداخەوە کەشەیتانی مرۆڤوجنۆکە یاری بەوکەسانە

ئەکەن‌و کردویانن بەداردەستی خۆیان بۆ ڕووخاندنی ئەم‌وڵاتە پاکە. ڕووداوەکانی ئەم تاوانە بەخێرایی ئەڕوات بەگرتنەبەری ڕێ‌و شوێنی پێویست بۆگرتنی چواردەوری ئامانجەکە.. کاتژمێری سفر دیاری کرا بۆئەنجامدانی کارەکە، بەپشتیوانی خودای گەورە ئەم پیاوە دەست گیرکرا، کەهەندێك ماددەی بێ هۆشکەری پێ بوو..چەند ساتێك لەم ڕووداوە ماوە کەهەرگیز لەیاد ناچێ .. بەبەڵگە بۆمان دەرکەوت کە ئەم پیاوە ماڵەکەی کردۆتە جێگای شاردنەوەی ماددەبێ هۆشکەرەکان کەهەڵئەسا بەفرۆشتن‌و بلاوکردنەوەی.

تیپێکی ئاسایش لەگەڵ تۆمەتبارەکە دەرچوون بۆ ماڵەکەی، بەگەیشتنمان بۆماڵەکە هەموومان دابەزین‌و وەستاین لەبەردەم دەرگای ماڵەکەو بێ دەنگی درێژەی کێشا بەسەرماندا، ئەتووت: هێمنییەکە بەدوای خۆیدا گەردەلولێك هەڵئەکات، تاوانبارەکە بەرامبەر ماڵەکەی وەستاو لەدەرگای دا، کت‌و پڕ دەنگی خۆشی‌و دڵنیایی بەرزبۆوە، پڕبەدەم کۆمەڵێك بێ تاوان لەپشت دەرگاکەوە هاواریان کرد:

هێی بابە هاتەوە.. بابە هاتەوە، یەکێك لەمنداڵەکانی یاری لەگەڵ باوکی ئەکردو زۆر بەناسکی‌و میهرەبانی یەوە ئەیووت: بابە دەرگات لێ ناکەمەوە، نەیئەزانی لەپشت دەرگاکەوە چی ڕوویداوە، دیمەنەکە دڵتەنگی بەسەر ڕووخساری کەسەکانی دەرەوەدا کێشابوو، سەیرکردنی غەمباریان ئەگۆڕیەوە، هەندێکیان سەریان خوار کردبۆوە بەلای ڕاست‌و چەپدا ئەیانجولاند، هەتاوەکو ئەکەوت بەسەر سنگیاندا لەبەر قورسی ئەم حاڵەتە. ئەوەندەی ئەبرد منداڵەکە دەرگای کردەوە، لە خەیاڵیاندا باوکی خۆشەویستیان لەوانەیە یاریەك یان شیرینیەکی بۆ هێنابن یان لایەنی کەم دەم بەخەندە بێتەوە بۆلایان، بەڵام بەتاوانباری بینییان کە چواردەوری بەپیاوانی ئاسایش گیراوە، دەنگەکان گۆڕان بەناڵەناڵ‌و خۆشیەکان بۆ ناخۆشی‌و هیواکان بۆ خەفەت، ئەگەر ئەتبینین، ئەمیان باوەشی بەباوکیدا ئەکرد، ئەمی تریان جل‌و بەرگەکانی ڕائەکێشا، یەکێکی تریان چاوەکانی پڕ بوون لەئەسرین، چونکە دەستەوەستان بوو لەلێکدانەوەی ڕووداوەکە..

ئەگەر ئەتبینین ئەگریایت، گریانێکی زۆر، دڵت پڕ ئەبوو لەخەفەت.. دوای ئەم دیمەنە دڵتەزێنە پیاوانی ئاسایش هەستان بەئەنجامدانی کارەکەیان، دیمەنێکی تر لە دیمەنە ناخۆشەکان بریتی بوو لە ماڵێکی بەدبەخت، کە ئەم خێزانە ژیانیان تێدا بەسەر ئەبرد، کەئەچوویتە ژووری دانیشتن تەنها ماڵێکی شلەژاوت ئەبینی! جێگەی پرش‌وبلاو!

خواردنیان تەنها پاشماوەی دانەوێڵەو خواردنی لەقوتوکراو بوو، کە بە هیچ شێوەیەك برسێتی ناشکێنێ.

زەلکاوێك لەژیان؛ کەم دەرامەتی؛ لەگەڵ ئەمانەشدا باوکەکە لەبێ ئاگایدا ڕۆچووبوو، خێزانەکەی پشت گوێ خستبوو. لەکۆتایی دیمەنەکەدا بڕێك ماددەی بێ هۆشکەر دۆزرایەوە لەماڵەکەدا.. پاشان ماڵەکەیان بەجێهێشت لەنێو ڕەمەی گریانی بێ تاوانەکان، لەبەردەم دەرگای خانوەکەدا خودا حافیزیان لەمرۆڤێك ئەکرد کە لەپەنایدا پەروەردە بووبوون و پێیان ئەووت: (بابە).

لەنێو ئەم دیمەنە دڵتەزێنەدا، گەردەلولێك لەهەستو سۆزمدا بەرامبەر ئەم تاوانبارە هەڵیکرد.

ئایا لەخودا ناترسی؟ ئایا بیری ئەم ئەنجامەت نەنەکردەوە؟ بەم شێوەیە باوك ئاگای لەجگەر گۆشەکانی ئەبێت؟ تاوانی ئەم بێ تاوانانە چییە لەم دەردەسەریەدا؟ گوناهیان چیە؟ بۆچی ئەم مەینەتیە هەڵگرن؟

ڕووبەڕوو لێی چوومە پێشەوەو پرسیارم لێکرد، بەڵکو وەڵامێکم دەست کەوێت .. تەنها دوو ووشە زیاتر بە لێویدا نەهات، ووتی: من هۆکارم، پاشان گریانێکی بەکوڵ گریا..

لەکۆتایی لێکۆڵینەوەکەیدا تاوانبارەکە ڕووبەڕووی دادگا کرایەوە، تاوەکو سزای خراپەکەی وەربگرێت، کە چارەسەر بوو بۆ دەروونە نەخۆشەکەی، هەروەها بۆ پاراستنی خێزانەکەی و کۆمەڵگاش بەگشتی، هەروەها بۆ پاراستنی ئاکارەکانی ئەم ووڵاتە، خودای گەورە ووڵاتی یەکتاپەرستی بپارێزێ لە هەموو شەیتانێکی یاخی و سەرکەش.

## چیرۆکی من لەگەڵ منداڵەکەمدا

ئەم پیاوە ئەڵێت: خێزانم هێناوەو حەوت منداڵیشم هەیە، ژیان لەگەڵ ماددە بێ هۆشکەرەکاندا زەلیلی و سوکایەتیە، ئەو کەسانەی تووش ئەبن لەپێناوی بەدەست هێنانی ئەم ماددانەدا بەهەموو شت ڕازی ئەبن، بەڕاستی ئەوە ژیانێکی پڕ مەترسی و چەرمەسەری و نەگبەتیە، سەرەتا تەنها بۆ تاقی کردنەوە ئەو شتەم بەکار هێنا، بەڵام ئەمڕۆ ماوەی بیست ساڵە لەگەڵ سوکایەتی و زەلیلی و خوپێوەگرتنی خراپدا ئەژیم.. سەرەتای ڕێگام بۆ ئەم جیهانە

تاریکە لەرێگەی هاورێیەکی خراپەوەبوو، پێشکەشی کردمو پێ داگری کرد تابەکاری بهێنم، چونکە بەپێی قسەی خۆی خۆشی ئەهێنێو هەموو لاشەی مرۆڤ چالاك ئەکات!!

ڕازی بووم، خۆزگە هەرگیز ڕازی نەبوومایە، هەناسەیەکی هەڵکێشاو پاشان بەردەوام بوو و ووتی: دوای ئەمە ڕێگایەکی نادیارم گرتە بەر کەنەم ئەزانی بەکوێدا ئەڕۆم، بڕوام پێ بکەن نەمئەزانی چۆن بەردەوام بووم لەسەری، چونکە هێواش هێواش ڕات ئەکێشێو ئەتکاتە داوێکەوە، کە ڕەتی ئەکەیتەوە لێی ڕزگاربیت، چۆن ئەمە ڕوونادات، ئێمە یادی خودامان نەئەکرد، تەنها کەمێك نەبێت، ئەو نوێژەی کەڕاگری دینە هەرگیز نەمان ئەناسی، لەگەڵ هاوسەرو منداڵەکانمدا زۆرخراپ بوومو زۆرم لێئەدان ئەگەر داوای شتێکی ئاسایشیان بکردایە. لەگەڵ ئەو دڵ ڕەقییەی مندا، منداڵەکانم بەپێچەوانەی منەوە بوون، کاتێك ئەیانبینیم ڕایان ئەکرد بۆ باوەشم.

جارێکیان بەبیرم دێت لەماڵەوە دانیشتبووم، کچەکەم تەمەنی تەنها شەش ساڵ بوو هات بۆلام، بەو پاکییەوە کەلەڕوخساریدا هەیبوو، پێی ووتم: بۆچی ماوەیەکە بەکەمی ئەتبینین؟ لەگەڵمان پێ ناکەنی؟ جوڵە جوڵی منداڵانەی لەگەڵ ئەکردمو بەپشتمدا سەرئەکەوت، بەڵام من بێ دەنگ بووم، ئەم بەرائەتو خۆشەویستیەم لەگەڵیدا ئاڵوگۆڕ نەکرد، بەڕاستی من دوای ئەوەی خوم بە ماددە بێ هۆشکەرەکانەوە گرتبوو، هەستم بەسۆزو بەزەیی نەئەکرد، کچەکەم یاری لەگەڵم ئەکردو پاشان ووتی: باوکە وەك هاورێکانی قوتابخانەم یاریم بۆ ئەکرێ؟ کاتەکە شەو بوو، دنیام لەسەر قورس بوو، هەستامو زۆر بەتوندی لێمداو دەرگای ماڵەوەم کردەوەو دەستم گرتو فڕێم دایە سەرشەقامو دەرگاکەم لەسەر داخست، گوێم لێبوو ئەپاڕایەوەو ئەیووت: جارێکی تر داوای هیچ ناکەم، دوای ئەوە دایکی هاتە کێشەکەوەو هێنامەوە ژوورەوە، خێزانەکەم ماوەیەك بێ دەنگ بوو پاشان ووتی: بڕوانە بەهۆی یاریەکی منداڵانەوە لە کیژۆڵەکەت ئەدەیتو فڕێی ئەدەیتە سەر شەقام، بەدەنگێکی بەرز ووتی: ئەو ماددە بێ هۆشکەرانە وای لێکردووی.. بەڵکو ئەم ووشانە بگات بەهەموو ئەوانەی کە خویان بەماددە بێ هۆشکەرەکانەوە گرتووە.

پاشان ووتی: هەموو ژیانم لەنەگبەتیدا بەسەر برد.. ڕۆژێکیان بەدڵ تەنگی یەوە لەماڵەوە دەرچووم کاتێکم زانی یەکێك لەپیاوانی گەڕەکەکەمان بە ئۆتۆمبیلەکەیەوە وەستاو بەگەرمی سڵاوی لێکردمو ووتی: ئەمەوێت لەبارەی بابەتێکەوە لەگەڵت بدوێم. دوای پێداگرتنی لەگەڵی

سەرکەوتم، بەشەقامەکانی شاردا منی سوڕاندەوە، خودای گەورە ڕێزو شەرەفی زیاد بکات، پاشان خودای بیرخستمەوەو پێی ووتم: ناتبینم نوێژ بکەیت لەمزگەوت.. هەتا کەی لەسەر ئەم حاڵە بەردەوام ئەبیت؟ خودای گەورە ویستی هیدایەتم بدات، قسەکانی چوونە دڵمەوە، بەتایبەت کەشێوازێکی زۆر جوانی هەبوو لەقەناعەت پێ کردنندا، خودای گەورە بەباشترین شێوە پاداشتی بداتەوە، دوای ئەوەی قسەکانی تەواو کرد، بڕیارم دا بمبات بۆ مەڵبەندی ئامادەکردنی دەروونی، بەیارمەتی خودا ئەبێتە هۆیەك بۆ چاككردنو هیدایەتو دەرباز بوونم لەنەگبەتیو چەرمەسەری، سوپاس بۆ خودا ئێستا ژیانێکی سەربەرزو سەرفراز ئەژیمو هەڵسوکەوتم لەگەڵ خێزانو منداڵەکانمدا زۆر باش بووە، تەنانەت ئەو کچەم کەلێمدا لەباتی یاریەك دوویاریم بۆ کڕی (ئەمەی بەپێکەنینەوە ووت).

## هاوسەرەکەم لەناوت بردین

ئەمە ئافرەتێکی غەمبارە.. پرچی سپی بووە، لە ڕووخساریدا چەرمەسەری دەرئەکەوێت، چیرۆکی ناخۆشیەکانی لەگەڵ مێردەکەیدا ئەگێڕێتەوە، کە خوی بەمادده بێ هۆشکەرەکانەوە گرتبوو، گریانی تێکەڵ بە ڕووداوە دڵتەزێنەکە بوو بوو، ئەگەر لەزمانی ئەم ئافرەتەوە ئەم ڕووداوانەم نەبیستایە واگومانم ئەبرد خەیاڵەو زیادەڕەوی تێدایە.

ئەم ئافرەتە ئەڵێت: مێردەکەم سەرۆکی کۆمپانیایەکی بەناوبانگ بوو، زۆری خۆش ئەویستمو نازی هەڵئەگرتم، سۆزی بۆمنو منداڵەکان زۆر بوو، هەستم ئەکرد ئاسوودەترین ئافرەتم لەدونیادا، ڕۆژگار ئەڕۆیشت، لەناکاودا خۆشی گۆڕا بۆ دۆزەخ، ڕووداوە تاڵەکان لەوکاتەوە دەستیان پێ کرد کە بەپیاوەکەم بەشێوەیەکی کتوپڕ باری دەروونی گۆڕا، بەبچووکترین شت تووڕە ئەبوو، هەندێك جار هەتا ڕوخسارم ئە ئاوسا لێی ئەدام!! کاتێك ئەهاتەوە بۆ ماڵەوە بۆنی ناخۆش بوو، ڕۆژێکیان جلو بەرگەکانیم بۆ شۆرین برد، دەستم بەر پارچەیەك حەشیشەی بێهۆشکەر کەوت.. بەڵاکەم دۆزیەوە، ئەویش ئەوەیە کەمێردەکەم تووشی بەکارهێنانی مادده بێ هۆشکەرەکان بووە، هەوڵم دا ئامۆژگاری بکەم، بەڵام هەوڵە یەك لەدوای یەکەکانم بێ ئاکام بوو، پەنام بۆ دایكوباوکم برد، بۆ ئەوەی بەدەنگمەوە بێن، هاتن بۆ ماڵمان، خۆزگە هەرنەهاتنایە، هەر کەباسی کێشەکە کرایەوە، کەوتە جنێوپێدانیانو لەماڵ دەری کردن، مێردەکەم زیاتر خراپ بوو، تەنانەت گومانیشی

لەڕەوشتیشم هەبوو.. خۆم ئارامم ئەگرت لەسەر ئەم تۆمەتە تاڵانە بۆ پاراستنی منداڵەکانم، لەوانەیە بڕوانەکەی کە گومانی لەڕەوشتی کچە حەوت ساڵانەکەشمان هەبوو!

ڕۆژێکیان لەدەرگای دا، کچەکەم هەستا چوو دەرگاکەی کردەوە، بەڵام ئەو سەرخۆش بوو، کەوتە لێدانی، ڕای کرد لەدەستی، دوای کەوت هەتا خۆی کرد بەژوورەکەیدا، ئەویش شووشەیەکی بۆنی تێ گرت‌و دەستی شکا، بەهەموو هێزی خۆم هاوارم کرد لەبەر ترسناکی حاڵەتەکە، پەیوەندیم بە براکەمەوە کردو کچەکەمان برد بۆ نەخۆشخانەو شووشە چووبوو بە چاوە بێ خەوشەکانیدا.

بەمەش کۆتایی نەهات، ڕۆژێکی تر وەك پارچە ئاگرێك هاتە ژوورەوە منداڵە بچوکەکەی هەڵگرت‌و فڕێی دایە سەرشەقامەکەو سەری ئاوسا، سوپاس بۆ خودا، دایکی مێردەکەم لەماڵەوە لەگەڵماندا بوو، بردم بۆ نەخۆشخانە تا فریاکەوتنی سەرەتایی بۆبکرێت.

کاتێك ئەم ژەهرەی ئەخوارد، ئەگۆڕا بۆ دروست کراوێکی تر، دڵی بەزەیی تێدا نەئەما، ئەبو بەئاژەڵێکی دڕندە.

ڕۆژێکی تر هاتە ژوورەوە، زیری لەدەست دابوو، چایەکی گەرمی کرد بەسەر کچە بچوکەکەمداو ڕوخساری سوتاو تێك چوو، هەتا ئێستاش ئەم ڕووداوە بەدەم‌و چاویەوە دیارە، بەڵام گەورەترین نەگبەتی بەسەر کوڕە گەورەکەمدا هات، کە ئەو کاتە تەمەنی دوانزە ساڵ بوو، ئەم منداڵە تەنها ئومێدی ژیانم بوو، چونکە بەڕاستی هیوام بە مێردەکەم نەمابوو.

بێ گومان هیواکانی کوشتم‌و مانا جوانەکانی لە دەرونمدا تێك شکاند.. شەوێکیان لەماڵەوە دانیشتنێکی شەیتانانەیان ئەنجامدا، من لەکۆتای ئەم دانیشتنە ئەترسام، بەهەرحاڵ منداڵەکانم خستە ژوورێکەوەو دەرگاکەم لەسەر داخستن، چەند کاتژمێرێك ڕۆیشت‌و منداڵەکان خەوتن، بەتەنها من مابوومەوە، خەو نەچووە چاوم، چۆن بخەوم لەو شەوە ترسناکەدا لەگەڵ پیاوێکدا کە هەموو مانایەکی بەزەیی لەدەست دابێت؟! لەتاریکی شەوداو لەدەوری کاتژمێر سێ دا لەدەرگای ژوورەکە درا، پیاوەکەم هاواری کرد: دەرگاکە بکەرەوە، هاوارم کرد: نایکەمەوە، منداڵەکان بەئاگا هاتن، بەڵام لەناکاودا دەرگاکە هاتە خوارەوەو مێردەکەم هاتە ژوورەوە، کەوتە لێدانی من‌و منداڵەکانم، هەتاکو جل‌و بەرگەکانم

درا، پاشان دارێکی هەڵگرت.. دارەکەی لەسەری کوڕەکەمدا شکاند، ئینجا وەکو شێت ئەم لاو ئەولای ئەکرد، هیچی دەست نەکەوت تەنها مێزەکە نەبێت، بەرزی کردەوە بۆئاسمانو کێشای بەسەر کوڕەکەمدا، خوێن بەسەریدا هاتە خوارەوە، هاوارم بۆ دراوسێکان کرد، بەڵام نەوەڵامێك نەفریاد ڕەسێك نەبوو.. بەخێرایی چووم پارچە سەهۆڵێك بهێنم، بۆ ئەوەی لەسەر سەری کوڕەکەمی دانێم بەڵام خوێنەکە هەر بەردەوام بوو، چوومە دەرەوە، لەتاو ئەو نەگبەتیە وەکو بێ هۆش وابووم.. بەبێ نەعل.. تەنانەت بەبێ سەرپۆش.

لەدەرگای دراوسێکەمانم داو هەواڵی ڕووداوەکەم پێدا، بەرەو ماڵمان کەوتە ڕێو منیش بەدوایدا، کاتێك کوڕەکەم ئەبینم لە خوێندا گەوزاوە، بردمان بۆ نەخۆشخانەو بۆ ماوەی سێ هەفتە لەژێر چاودێری ورددا دانرا، کارەساتێکی دڵتەزێنمان تووش بوو.. کوڕەکەم بەهۆی لێدانەکەوە عەقڵی تێك چوو، لەدوای دوومانگ کوڕەکەم لەنەخۆشخانە دەرچوو، بووبەبار بەسەرمەوە.

بڕوابکەن خۆزگەم ئەخواست مێردەکەم بمرێت، ئەمە خۆزگەی من بوو بەرامبەر مێردەکەم، لەخودا دەپاڕامەوە کە دەستگیر بکرێو زیندانی بکرێ، دوای هەفتەیەك دەستگیریان کردو دووساڵ زیندانیان بەسەردا سەپاند، لەماڵەوە چەرمەسەری تر دەستی پێکرد، منداڵەکان ئەیان ووت: باوکمان لەکوێیە؟ بۆچی گیراوە؟ بۆچی لەزیندانە؟

بۆ خۆم چەند جارێك سەردانم کرد.. ڕۆژەکان لەزینداندا ئەڕۆیشتن، مێردەکەم لەهاوڕێ خراپەکانی دوورکەوتەوە، ڕەوشتی ڕاست بووبۆوە، کەلەزیندان دەرچوو نوێژی ئەکردو ناکاری باش بوو..بەڵام شتێك ڕوویدا کەبەخەیاڵمدا نەئەهات، هاوڕێ خراپەکانی یەکەم جاری لەدەوری کۆبوونەوەو پەلکێشیان کردەوە بۆ هۆگربوون بەمادده بێ هۆشکەرەکان، حاڵمان بەرەو خراپی ڕۆیشت، شتی ماڵەکەی هەموو فرۆشت، تەنانەت کەلوپەلی چێشتخانەکەش!! ئەم شتانە هەرگیز حەزوئارەزووەکانی تێرنەئەکرد بۆ بەدەست هێنانی ئەوماددانە.

پێویستی بەشتێکی گران بەهابوو! ئەزانن چی بوو؟؟

کچە بچکۆلانەکەم بوو، کەتەمەنی پانزە ساڵان بوو، دای بەشوو بەپیاوێکی تووش بوو بەکەم عەقڵیو تێکچوو، هەموو ئەمانە بۆئەوە بوو کەدەست بەسەر مارەییەکەیدا بگرێت، کەبڕی پەنجا هەزار ڕیاڵ بوو، تاڵەکرێنی ژەهرەکانیدا سەرف بکات، دڵم تەنگ بوو، تەنانەت

توانای بەڕێوەبردنی ئیشی ماڵەوەشم نەما، هیچ گرنگییەك بەمنیەنادات، دێتەوە ئەوەی بەردەستی کەوێت لەو شتانەی کەخێرخوازان ئەمان دەنێ ئەیبات و ئەڕوات، بیرم لەڕۆژە خۆشەکانی ژیانم ئەکردەوە، خەریکە لەداخ و حەسرەت و خەفەتدا ئەمرم، بەڵام دڵنەوایی خۆمم ئەدایەوەو سوپاسی خودا ئەکەموهیوا بڕاونابم و هەرگیز لەبەزەیی خودا نائومێد نابم، شەوو ڕۆژ لەخودا ئەپاڕێمەوە، مێردەکەم بۆ بگەڕێنێتەوەو منداڵەکانم چاکە کاربن و ڕۆژگارە خۆشەکانم بۆ بهێنێتەوە کە خۆریان ناوا بووەو ئەستێرەکانی دیار نەمان، بەڵکو خودایە سەرلەنوێ ژیانم ڕۆشن بکەیتەوە..

## براکەی خۆمم کوشت

سامی ساڵی یەکەمی خوێندنی ناوەندی بەسەرکەوتوویی کۆتایی پێهێنا، پێش ئەوەی ئەنجامی تاقی کردنەوەکانی بزانێت لەباوکی پرسی: باوکە ئەگەر ئەمساڵ دەرچووم بۆ پۆلێکی تر چیم پێشکەش ئەکەیت؟

باوکی بەدڵ خۆشییەوە ووتی: کەکارتەکەت هێنایەوەو دەرچووبویت ئەوا ڕازی ئەبم لەگەڵ خاڵت گەشت بکەیت بۆ حەبەشە(ئەثیوبیا) بۆ ئەوەی پشووی هاوین لەوێ بەسەربەریت.

سامی کوڕەگەورە بوو لەماڵدا، دوای چاوەڕوانییەکی زۆر خودای گەورە ئەم منداڵەی پێ بەخشیبوون، خۆشەویست و بەناز بوو لەلای دایك و باوکی، هەموو هەوڵی خۆشی و بەختیاری ئەویان بوو بەهێنانە دی داواکاریەکانی بۆ ئەوەی ئاسوودە بێت.

ئەو شەوە سامی لەخۆشیدا نەخەوت، خەوی ئەفسوناوی بەخەیاڵ و هۆشیدا ئەهات و ئەچوو، چۆن نا؟ یەکەم جارە کۆچ بکات بۆحەبەشەو سێ مانگ لەوێ بەسەر بەرێت کە پشووی قوتابخانەیەو لەوێ بە شتی تازە ئاشنا ئەبێت... لە بەیانی ڕۆژی سێ یەمدا دوای کۆتایی هاتنی تاقی کردنەوەکان سامی بەهاوڕێیەتی باوکی ڕۆیشت بۆ قوتابخانە تاکارتەکەی وەربگرێت.

سامی ڕۆیشتە ژوورەوە بۆ ناو قوتابخانەکەو چەند دەقیقەیەك دیارنەما، باوکی لەئۆتۆمبێلەکەدا چاوەڕێی ئەکرد، پاشان گەڕایەوەو کارتەکەی بەدەستەوە بوو، هێمای خۆشی لەڕووخسارە پاکەکەیدا ئەبینرا، هاواری کرد، مژدەبێ لە ناو هاوڕێکانمدا بەدووەم دەرچووم.

ڕوخساری باوکی بەپێکەنینەوە پێشوازی لێکرد، خۆشی لەچاوەکانیدا ئەدرەوشایەوە، باوکی باوەشی پێداکردو بەخۆشیو شانازییەکی زۆرەوە پێی ووت: هەزار جار، هەزار جار، پیرۆزت بێت سامی گیان، کوڕەکەم، سوپاس بۆخودا کەیارمەتی دای تاسەرکەوتوو بیت.

ئێستا کاتی گەشتەکەتە، سامیْ خودا حافیزیو ماڵئاوای لەدایكو باوکی کردو لەوپەڕی بەختیاریدا بوو، یەکەم جار بوو سامی سواری فڕۆکە بێت، دونیایەکی تازەی بینی، خۆشییەکی تازە کەپێشتر نەیبینی بوو، خۆشیەك کە تێکەڵ بوو لەترسو ئاسوودەیی پێکەوە، بەتایبەت کاتێك کەگوێی لەگرمەی فڕۆکەکە بوو کەلە فڕۆکەخانە نیشتەوەو لەئاسمان دابەزی، هەموو ئەو شتانەی ئەبینیو ئەیبیست تازەبوون، شتێکی سەیر کەنەی بینیبوو لەوەو پێش حەبەشە بوو، سامی لەویْ لەگەڵ خاڵیدا دنیایەکی نوێی چاوپێکەوت.

بەڵام تێبینی ئەوەی دەکرد لە کاتێکەوە بۆکاتێکی تر خاڵی حاڵەتێکی نامۆ دایئەگرێت، کەلاشەی سست ئەبوو، هاوسەنگی خۆی لەدەست ئەدا، هەندێك جاردڵخۆشو دەم بەپێکەنین بوو، جاری واش هەبوو هەندێك ورتەورتی ئەکرد کەئەم تێی نەئەگەیشت، سامی نهێنی ئەم ڕەفتارە نامۆیانەی بۆ دەرکەوت کە خاڵی هۆگری مەی خواردنەوە بووە.

لەدەروونی سامیدا ئارەزووی لاسایی کردنەوە گەشەی کرد، شەیتانیش بەزەیی نەهاتەوە بەتەمەنی منداڵیداو وەسوەسەی خستە دڵیەوە تا ئارەزوەکەی بکات بەڕەفتاروکردار.. سامی بۆ یەکەم جار مەی خواردەوە، لەسەرەتاوە شتێکی گرنگ نەبوو بەلایەوە، بەڵام بینینی خاڵیو ئارەزووی لاسایی کردنەوەیەکی کوێرانە هانی ئەدا، تا جارێكو دووانو سیان تاقی بکاتەوە، تاڕاهات لەسەریو وای لێهات هۆگر بوو پێوەی، ئالەم کاتەدا تەمەنی سیانزە ساڵی تێ نەپەڕاندبوو.

ماوەی پشوو کۆتایی هات، سامی لەگەڵ خاڵیدا گەڕایەوە بۆ شاری(جدة)، بیری هەر لای ئەوەبوو چۆن مەی دەست کەوێتو بتوانێت بیخوات، بەڵام دەست کەوتنی ئاسان نەبوو، بۆیە لەکۆتاییدا بڕیاری وازهێنانی دا، چونکە ئەمە تەنها چارەسەرە بۆ پارێزگاری کردنی خۆیو داهاتووی، هێشتا منداڵەو هەروەك چۆن کردارێکی بەدوخراپەو خودای گەورەش حەرامی کردووەو سزایەکی توندی داناوە بۆ ئەوکەسانەی کە ئەم کارە ئەنجام ئەدەن.

سامی گەڕایەوە بۆ باری ئاسایی خۆیو مەی لەبیر چۆوە، سێ ساڵ بەسەریدا ڕۆیشت بەبیْ ئەوەی بیر لەخواردنەوەی مەی بکاتەوە، لەکۆتایی ساڵی چوارەمدا خێزانەکەی

بڕیاریان دا گەشت بکەن بۆ دەرەوەی وولات، بۆ ئەوەی پشووی هاوین لەیەکێك لە وولاتە ئەوروپییەکان بەسەر بەرن.

لەوولاتەدا جارێکی تر ئارەزووی مەی خواردنەوە لەدەرونیدا گەشەی کردەوە، یادگاریەکانی حەبەشە سەری هەڵدایەوە، شەیتانیش خواردنی مەی بۆ ڕازاندەوە، سامی لەکاتی خەوتنی خێزانەکەی بە دزی یەوە هەلی خواردنەوەی مەی بۆ ئەڕەخسا. لەسەر ئەم حاڵە بەردەوام بوو تاجارێکی تر هۆگری مەی بوەوە تاوەکو وەك ئاوی لێهات لەلای‌و نەیئەتوانی نەیخواتەوە.

شەوێکیان سامی لەگەڵ (فەوزی)خاڵۆزایدا دەرچوون بۆ بەسەربردنی شەو لەیەکێك لە یانەکانی شەوانەدا دانیشتن‌و مەیان بۆ دانرا دوای ئەوەی خواردنی باشیان خواردو بێ دەنگ بوون بۆ گوێ گرتن لەهەراو هوریای مۆسیقا.. کاتێك لەو حاڵەتەدا بوون خاڵۆزاکەی پارچەیەکی بچووکی حەشیشەی ڕەشی لەگیرفانی دەرهێناو پاشان نای بەلوتیەوەو زۆر بەهێواشی‌و بەچێژەوە بۆنی ئەکرد وەك ئەوەی منداڵێك لەئامێز بگرێت، دوای ئەمە کات نا کاتێك بەلای ڕاست‌و چەپدا لار ئەبوەوە.

سامی هەستی بەمە کرد، بۆیە بەخۆشیەوە پرسیاری کرد: ئەم پارچەیە چیە؟ بۆچی وادەکەیت؟

(فەوزی) پێکەنی‌و ووتی: ئەزانی ئەمە چیە؟ ئەوە حەشیشەی ڕەشە! بەڕاستی لوتکەی چێژوەرگرتنە، سامی ووتی: چۆن ئەم پارچەیە ئەم هەموو چێژەی تێدایە؟

فەوزی ووتی: ئەوەی پێم ووتی بەشێکە لەڕاستی ئەو شتەو پێویستە خۆت تاقی بکەیتەوە تابزانی چۆنە.. بیگرەو تاقی بکەرەوە؟!سامی دەستی بۆ حەشیشە ڕەشەکە درێژ کردو وەری گرت‌و پاشان بۆنی کردو ڕۆحی لەگەڵیدا ڕۆیشت بۆ جیهانێکی ساختەو خەیاڵ‌و لەناو چوون.

سامی نەیئەزانی ئەم حەشیشە بچوکە لەبۆسەدایە بۆی، مەرگێکە هەموو ڕۆژێك لەدەرگای ئەدات‌و هەڕەشە لەداهاتووی ئەکات.

چەند ڕۆژێك تێپەڕی‌و سامی هۆگری حەشیشە بوو، ژیانی سەر لەبەر هەڵگەڕایەوە، تەندروستی خراپ بوو، بیری تێکچوو، پارەکانی بەفیڕۆ ئەدا، کاتێك سامی خوێندنی تەواوکردو بوو بەفەرمانبەر هەستی بەوە ئەکرد ڕقی لەخەڵکەو حەزەکات لێیان دوور

بێت، وای هەست ئەکرد کە هەموو نهێنیەکانی ئەزانن‌و زوو تورە ئەبوو، هەژدە ساڵ تێپەڕی‌و ئەو دیلی حەشیشەی ڕەش بوو، لەگەڵ ئەوەی گۆڕان لەوەزیفەکەی ڕووی ئەداو مووچەی زیاتری دەست ئەکەوت کەیارمەتی دەری بوو بۆکڕینی حەشیشە، بەڵام کێشەکانی زۆر بوون تەنانەت لەگەڵ کەس‌و کارەکانیداو سەروەت‌و سامانی بەرەو کەم بوونەوە چوون.

سامی زۆر بەباشی هەستی بەمە کردبوو کەدەریاوانێکی سەر لێشێواوە لە دەریایەکی بێ کەناردا هیچ ڕێگایەکی نیە بۆ ڕزگار بوون. سامی توانی نهێنییەکەی لای یەکێك لەهاوڕێ خۆشەویستەکانی بدرکێنێ، بەڵکو بتوانێ لەم دۆزەخە ڕزگاری بکات.

هاوڕێکەی بردی بۆ لای یەکێك لەو هاوڕێ کۆنانەی کەوەك خۆی وابوون، هاوڕێکەی بەگەرمی پێشوازی لێکردو گلەیی لێ کرد کە بۆچی لێیان دابڕاوە؟!

سامی هەواڵی ئەوەی پێدا کەبەسەریدا هاتووە بەهۆی ئەم حەشیشە زەهرەوەو داوای یارمەتی لێکرد تا ڕزگاری بکات، کاتێك قسەکانی تەواو کرد، هاوڕێکەی پێی ووت: شتێکم لایە کە هەموو خەمەکانت بیر ئەباتەوە، تەنها تۆ دەستت بهێنەو چاو بنوقێنەو چەند ساتێك چاوەڕوان بە.

سامی بەسەر سوڕمانەوە ووتی: چی ئەڵێی؟ من لەبارێکی خراپدام‌و گاڵتەوگەپم لەگەڵ مەکە!

هاوڕێکەی ووتی: من گاڵتە ناکەم، خۆت ئەنجامەکەی ئەبینی.

سامی دەستی درێژکردو چاوی داخست، برادەرەکەشی قۆڵی گرت‌و دەرزیەکی (هیرۆین)ی لێدا، کاتێك سامی چاوی کردەوە، برادەرە دڵسۆزەکەی تەواو بووبوو لەبەتاڵ کردنی سەرنجە هیرۆینەکە لەلاشەیدا، سەرەتای ئازارو ناخۆشی تازە دەستی پێ کرد، لەو ڕۆژەوە هۆگری هیرۆینش بوو، لێی تێر نەئەبوو، کاتێکیش لێی ببڕایە هەستی بەئازارێك ئەکرد کە ئێسکەکانی سست ئەکردو ئارامی لەبەر بڕابوو.. سامی ئەوەی هەیبوو لەهیرۆیندا بەفیڕۆیداو قەرزی لەکەس‌و کارو هاوڕێکانی ئەکرد، ئەوانیش هیچیان دەربارەی نەئەزانی، ماڵەکەشی خستە بارمتەوە، کاتێك باری تەندروستی خراپ بوو لەنەخۆشخانە خەوێنرا، دوای ماوەیەك لەنەخۆشخانە دەرچوو تاوەکو جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ هۆگر بوون بەهیرۆینەوە، چەند جارێك لەنەخۆشخانە خەوێنرا بەڵام بێ سوود بوو.

شەوێکیان نەیئەتوانی بەرگەی ئازارەکانی لەشی بگرێت کە بەهۆی پێویستی بەوهیرۆینەوە توشی هاتبوو، پارەشی پێ نەبوو تائەم ژەهرە بکوژەی پێ بکرێت، هەرنەبێت ئەم شەو هیرۆین بکێشێت نرخەکەی هەرچەندێك بێت، باوکی لەم کاتەدا لەسەفەر بوو، لەم ماوەیەدا هەڵس‌و کەوتی سامی سروشتێکی دوژمن کارانەی هەبوو کە مرۆڤایەتی لەدەست دابوو.

ئەوشەوە خەمناکە تاراوەیەك مانگە شەو بوو، سامی لەژوورەکەی خۆی دەرچوو، بڕیاری کارێکی ترسناکی دابوو، بڕیاری دابوو کە هەندێك لەئاڵتونەکانی دایکی بدزێت تاهیرۆینی پێ بکڕێت، چونکە ئارامی لێ هەڵگیرابوو... لەسەر خۆ ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی دایکی‌و دۆلابەکەی کردەوە هەندێك ئاڵتونی دزی تابیفرۆشێ‌و هیرۆینی پێ بکڕێت..

دایکی بەئاگا هات‌و لەخەو هەڵساو تارماییەکی بینی ئەجولایەوە، بەهەموو هێزی خۆی هاواری کرد(دز...دز) سامی بەرەو ڕووی دایکی ڕۆیشت، دەم‌و چاوی داپۆشی بوو، بەدەستە پیسەکانی دەمی دایکی بەتوندی گرت‌و پاشان کێشای بەزەویدا، دایکی کەوت‌و نەیئەزانی لەترسا چی بکات، سامی ڕایکرد بۆ دەرەوەی ژوورەکە، لەو کاتەدا برا بچوکەکەی گوێی لەدەنگی دایکی بوو، هات تا تارمایی دزەکە ببینێ‌و بیگرێت، گرتی‌و هەردووکیان بوو بەبگرەو بەردەیان، بەڕاستی چەند ساتێکی ناخۆش‌و تاڵ بوو، ئەگەر براکەی بیگرێت ئەوا ئاشکرا ئەبێت، سامی چەقۆیەکی چەقاند بەسنگی براکەیدا، تا ڕزگاری بێت لەناو زڕان، پاشان بەئاڵتونەکانەوە ڕایکرد، بەڵام خودای گەورە لەبۆسەدا بوو بۆی، لەوکاتەدا ئۆتۆمبیلی پۆلیس لەشەقامەکەدا ئەسوڕایەوە، یەکێك لەپۆلیسەکان هەستی پێ کردبوو کەبەخێراییەوە لەماڵەکە دەرچووە، بەتوورەکەیەکی گەورەوە، گومانیان لێ کردو دەستگیریان کرد، براکەیان گواستەوە بۆ نەخۆشخانە، بەڵام گیانی بەپەروەردگار سپاردبوو، بەهۆی ئەو لێدانە کاریگەرە زاڵمانەی کەبەر لاشەی پاك‌و بێتاوانی کەوتبوو لەلایەن نزیکترین کەسی خۆیەوە، لەلایەن براگەورەکەیەوە، بەردەوام خواردن‌و خواردنەوەیان پێکەوە بوو، لەگەڵ یەکتر ئەخەوتن‌و پێکەوە پێ ئەکەنین‌و ئەچوونە دەرەوەو ئەهاتنەوە، ئەمەیە ماددەبێ هۆشکەرەکان، دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆری بەردەوام ڕاستییەکی سەرسوڕهێنەرو ڕووداوێکی تاڵ هاتە پێشەوە، تاوانبارو دزو بکوژی کوڕەکەیان (سامی) یە، قوربانیەکەش دایك‌وبراکەیان بوو، ماڵە دزراوەکەش ماڵی هەمووان بوو، دایکی بەرگەی ئەم

ڕووداوە كتوپڕەی نەگرتو بەنەخۆشی لەسەر جێگە كەوتو فرمێسكو ئەسرینی بۆ(سامی)ئەڕشت، بۆ كوڕە نازدارەكەی كەداهاتووی لەناو چوو لەدنیاو قیامەت، لەلای خەڵكی بوو بەكوڕێكی تاوانبارو دز.

سامی زۆر گریا، ئازارو خەمو خەفەتی زۆر چەشت بۆ ڕابردووی، كەبەخراپە بەڕێی كردووە، بەهۆی ماددە سڕكەرەكانەوە هەموو شتێكی لەدەست دا، ئاینەكەی دۆڕاند، كارەكەی دۆڕاند، تەندروستی تیا چوو، خێزانەكەی دۆڕاندو لەسەر هەموو ئەمانەوە خۆشەویسترین كەسی خۆی كوشت، ئەویش براكەی خۆی بوو، سامی برا بۆ نەخۆشخانە بۆ چارەسەری هۆگرییەكەیو بەڵام هەرئەوەی لەبیرە كەبراكەی خۆی كوشتو ژیانی خۆی لەناوبرد بەهۆی ماددە سڕكەرەكانەوە، ئەی خاوەن ژیریەكان پەند وەرگرن ....

## ویستی خاڵی ڕزگار بكات، بەڵام خۆی مرد

منداڵەكە تەمەنی لەپێنج ساڵ تێنەپەڕیبوو، خوێن لەدەمی ئەڕۆیشت، ئۆتۆمبیلی فریاكەوتن گەیشتنە ناوچەی ژمارە (١٠) بۆ گواستنەوەی منداڵەكە بۆ نزیكترین بنكەی تەندروستی لەبەر ترسناكی حاڵەتەكە.. یەكسەر خرایە ژووری نەشتەرگەریەوەو سێ نەشتەرگەری خێرای بۆ ئەنجامدرا، تاوەكو ڕزگاری بكەن لەو خوێن بەربوونە ناوەكیو دەرەكییە، بەڵام هەموو هەوڵەكان شكستیان هێنا، پزیشكەكان نەیانتوانی ژیانی ڕزگاربكەن چونكە لەدوای چەند كاتژمێرێك لەگەیشتنی بۆ نەخۆشخانە گیانی پاكی سپارد... پزیشكەكان لەگەڵ گەیشتنی منداڵەكە هەستیان بەوەكرد كە ئەم كارە بەتاوان ئەچێت، بەڕێوەبەرایەتی گشتی لێكۆڵینەوەی تاوان ئاگادار كرایەوە، بریكاری جێگری گشتی ئامادەبوو، سەیری ڕاپۆرتی یاسایی پزیشكیان كرد كە تێیدا هاتووە ئەم منداڵە دەرزییەكی پیسی فووت داوە كەخوێنی پیسی پێوەبووە، لەگەڵ هەبوونی هەندێك شوێنەواری ماددەی هیرۆین لەقوڕگی منداڵەكەدا، كاتێك باوكی منداڵەكە ئەزانێت منداڵەكەی لەنەخۆشخانە مردووە، هاوسەنگی خۆی لەدەست ئەداتو لەسەربانەوە خۆی فڕێدابووە خوارەوەو هەردوو قاچی شكا بوو، ئۆتۆمبیلی فریاكەوتن جارێكی تر هاتەوە تا باوكەكە بەرێت بۆ نەخۆشخانە كەباری تەندروستی خراپ بوو، خرایە ژێر چاودێری وردەوە، بەڵام دایكی منداڵەكە ژیانی بەساتێكی ناخۆشدا ئەڕۆیشت، ڕووخساری خەم دایگرتبوو، ئەو پرسیارەی پیاوانی

لێکۆڵینەوە سەریان لێ سوڕما بوو، وەڵامیان دەست نەدەکەوت ئەوە بوو: ئەم منداڵە بۆچی مرد؟! چۆن ئەم دەرزییە پیسە گەیشتە دەمی ئەم منداڵە؟!

ئەفسەری لێکۆڵینەوە فەرمانی دا بە بانگکردنی دایکی منداڵەکە، ئەفسەرەکە ئەیویست دایکەکە هێور بکاتەوەو ئازارەکانی کەم بکاتەوە، چونکە لەنێوان دوو ڕووداوی ناخۆشدا بوو، مردنی منداڵەکەی‌و حاڵەتی خراپی مێردەکەی کەلەژێر چاودێری ورددا بوو.

ئەفسەرەکە کەمێك چاوەڕێی کردو پاشان ووتی:منداڵەکەت بەمردنێکی ئاسایی نەمردووە، بەڵکو بەتاوان ئەچێت، لەبەرئەوە پێویستە هۆکاری مردنی منداڵەکە بزانین، ئەفسەرەکە پرسیاری لێکرد، کە چۆن ئەم دەرزییە گەیشتۆتە دەمی ئەم منداڵە؟ لەکوێ ئەمەی دەست کەوتووە؟ دایکەکە بەشێوەیەك لەگەڵ ئەفسەرەکەدا ئەدوا، کە هیچ شتێك لەوبارەیەوە نازانێت.

لەکاتی قسەکردنی ئەفسەرەکە لەگەڵ دایکی منداڵەکەدا، پیاوانی لێکۆڵینەوە هاتنە ژوورەوەو ڕایان گەیاند پیاوەکە لەحاڵێکی خراپدایەو هەوڵی ڕاکردنیش ئەدا لەنەخۆشخانەو بەدارشەقەکانی ئەڕوات، کاتێك دایکەکە ئەمەی بیست هاواری کردو ووتی: ئەیکوژێ!! ئەفسەرەکە ووتی ئەمە مانای چیە؟

ئەویش ووتی: هەموو شتێکت بۆ ئەگێڕمەوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە پێش ئەوەی براکەم بکوژێ بگەنە مێردەکەم.. ئەوسا پیاوانی لێکۆڵینەوە بەخێرایی ڕۆیشتن بۆ شوێنی نیشتەجێ بوونی برای ژنەکە.. لەکاتی گەیشتنیان بەدەرگایماڵەکە ئافرەتێکی پیریان بینی هاواری ئەکردو جل‌و بەرگەکانی لەبەر خۆی ئەدڕاند، هاواری ئەکرد:(بیگرن، ئەو ڕایکرد، مەیەڵن ڕابکات)، ئەفسەرەکە پرسیاری لێکرد چ شتێك دەربارەی مردنی منداڵەکە ئەزانێت؟ پیرێژنەکە وەڵامی دایەوەو ووتی کەنەنکی منداڵەکەیەو هەموو شتێك دەربارەی مردنی منالەکە ئەزانێت، ئەفسەرەکە داوای لێکرد لەگەڵیدا بچێت بۆ نوسینگەکەی‌و دایکی منداڵەکەشیان لەگەڵدا بوو، ئەو پیرێژنە بەڕێزە دانیشت‌و ئەوجا چۆنیەتی ڕووداوەکەی گێڕایەوە..

ووتی: ئەم منداڵە بووە قوربانی بۆ مرۆڤێکی خراپەکار، کەواتای منداڵ نازانێ، خاڵی منداڵەکە کوڕی ئەم پیرێژنە بوو لەڕۆژی ڕووداوەکەدا لەوێ بووە، خاڵی منداڵەکە لەژورێکی ژێرزەمینی خانوەکەدا بەترسەوە خۆی شاردبۆوە، ئەوەك پیاوانی لێکۆڵینەوە بیدۆزنەوە،

دوای کەمێك ئەچێت بۆ ژوری میوانەکەو کچی خوشکەکەی کە منداڵێکی بچوکە یاری تێدا ئەکات، دائەنیشێت تا سەرنجێك هیرۆین لەقوڵی خۆی بدات، دەرزیەکە ئەچێتە قوڵیەوە، بانگی خوشکەزاکەی ئەکاتو داوای لێ ئەکات بەدانەکانی گاز لەقوڵی بگرێت تا دەرزییەکەی بۆدەربکات، لەوکاتەدا دەرزیەکە ئەچێتە دەمیەوە، هەوڵی داوە دەرزیەکە لەدەمی دەربکات، بەڵام بێ ئاکام ئەبێت، چونکە دەرزیەکە چۆتە قورگی یەوە، پاشان خوێنی بینیەوە لەدەمی ئەڕوات، کەوتووەتە هاوارو بانگ کردنو بەترسەوە هەڵهاتووە، لێرەوە ئەفسەرانی لێکۆڵینەوە ڕۆیشتن بەرەو ماڵی خاڵی منداڵەکە، لەماڵەکەدا هەندێك ئامێری بەکارهێنانی ماددە بێ هۆشکەرەکانیان دۆزی یەوە لەگەڵ هەندێك کاغەز، یەکێك لەئەفسەرەکان تێبینی دووبارە بوونەوەی ژمارە تەلەفۆنێکی کرد بەناوی باوکی ئەحمەد لەگەڵ کاغەزێکی بچوك کە بۆ کێشانی حەشیشە بەکارهاتبوو، دوای پشکنینو پرسیارکردن خاڵی منداڵەکە لەسەر بەلەمێك لەناوەڕاستی ئاوی کەنداو دەستگیر کرا، کاتێك پیاوانی ئاسایش دەوری بەلەمەکەیان گرت لەم کاتەدا خەوتبوو، ئەم پیاوە بووە هۆی مردنی خوشکەزاکەی لەکاتێکدا ئەو بووە هۆی ڕزگارکردنی خاڵیو ئەیهێشت دەرزی هیرۆین بچێتە قوڵیەوە، خاڵی منداڵەکەیان برد بۆ لێکۆڵینەوە.. گەنجەکە ئەگریاو ئەیووت: مەبەستم کوشتنی کچەخوشکەکەم نەبووەو من زۆرم خۆشەویست، بەڵام دەرزیەکە لەقوڵمدا شکا، داوام لێکرد کە گاز لەقوڵم بگرێت تا دەرزیەکە دەربچێت، بەڵام لەکۆتاییدا قووتیداو مرد.

تۆمەتبار نێردرا بۆ بریکاری گشتیو سزای بیست ساڵ زیندانییان بەسەردا سەپاند، بەڵام دوای ئەوەی خێزانێکی داڕووخان، کە لەوپەڕی ئاسایشدا ئەژیان، بەهۆی گوێڕایەڵی خاڵی بۆ ئارەزووەکانی، خوشکەزاکەی بێ بەری کرد لە ژیان کە پێنج ساڵ لە تەمەنی تێنەپەڕی بوو....

## بەم شێوەیە ئابڕووی پورەکەمم برد

(ن.م) گەنجێکە لەتەمەنی سیو هەشت ساڵیدایە، پێش بیست ساڵ گەشتەکەی لەگەڵ ماددەبێ هۆشکەرەکاندا دەستی پێکرد، لەیەکەم سەیرانو گەشتیدا بۆ دەرەوەی شانشینی سعودی، کە ئەوکاتە تەمەنی هەژدە ساڵ بوو، چیرۆکەکەی بەم شێوەیە ئەگێڕێتەوەو ئەڵێت: کۆمەڵێك هاوڕێ لەوڵاتێکی ڕۆژئاواییدا بووین، لەگەڵ کچێکدا کەناوی (جاکلین) بوو پەیوەندییەکی گەرمم پەیداکرد، ئەوکچە بڕێکی زۆر لەماددە بێ هۆشکەرەکانی بۆ

دەستەبەر ئەکردم، بەتایبەت کاتێك کاری سێکسیم لەگەڵیدا بکردایە، کات بەخێرایی تێپەڕیو کاتی گەڕانەوەم بۆ شانشینی سعودیە هاتە پێشەوە، بۆ بەسەربردنی پشووی خوێندن لەوڵاتەکەم، ئەو کچە بڕێکی زۆر لە ماددەی سڕکەر(مخدرات)ی بۆ کردمە جانتاکەمەوە، بەجۆرێك تا کاتی گەڕانەوەم بەشم بکات.

لەوڵاتەکەی خۆشم پیاوێکم ناسی بە ناوی (باوکی ڕەعد) پەیوەندیمان توندوتۆڵ بوو (ئەو شارەزای ئەو شوێنانە بوو کەماددەی سڕکەری لێ دەست ئەکەوت)، کاتێك لەدەرەوە بومایە ماددەی سڕکەرم لە (جاکلین)ەوە دەست ئەکەوت، کاتێکیش لەوڵاتەکەی خۆم بومایە لە(باوکی ڕەعد)ەوە دەستم ئەکەوت..

بەم شێوەیە سیانزە ساڵ مامەوە دوای ئەوەی بەتەواوی هۆگری ماددە سڕکەرەکان بووم‌و خەوتن‌و هەستانم لەگەڵ ئەودا بوو.

خوشکێکم هەبوو بەیەکەوە لە ئاسودەیەکی بێوێنەدا ئەژیاین، بەجۆرێك بەختەوەرو نازدار بووین کە بە خەیاڵتا نایات! بەبێ ڕەتکردنەوە داواکاریەکانمان ئەهاتنە دیو جێبەجێ ئەکران، بەتایبەت لەلایەن دایکی دڵسۆزمانەوە، کەبەدەست تاڵی گوێ نەدانی باوکمەوە ئەیناڵاند، ئەو باوکەی کەسەفەری زۆر دوورو درێژی هەبوو، چەند ساڵێك بەم جۆرە ماینەوەو دایکم لێم کەوتە گومانەوە، بەتایبەت کە ماوەیەکی زۆر لەگەرماوەکەدا ئەمامەوەو پێی ئەووتم: بۆچی زۆر لەگەرماوەکەدا ئەمێنیتەوە؟ یەك کاتژمێر چی ئەکەیت لەگەرماوەکەدا؟بۆچی نان بەباشی ناخۆیت؟ ئەم ماندووبونە هەمیشەییە چییە؟ ئەم شتانە چییە کوڕی شیرینم؟

لەبەردەم ئەم پرسیارە بێزارکەرو پڕگومانانەدا بەباشم زانی کەبگوازمەوە بۆ ماڵی پورم، ئەوپورەم بێوەژن بوو، لەماڵەکەی ئەودا کەشێکی شیاوم بەدی ئەکرد، بۆ بەردەوام بوونی هۆگریەکەم بەبێ ئەوەی کەس بێزارم بکات، تەنها سێ کەس لەوماڵەدا نیشتەجێ بوون، پورەکەم کەتەمەنی سی ساڵ بوو، کارەکەرێك‌و مێردەکەی، کە شۆفێر بوو، ژوورێکی جیای بۆدروست کردبوون لە خانوەکەدا.. لەماڵی پورم کەس پرسیاری لە هەڵس‌وکەوتم نەئەکرد، پورم زۆر سۆزو خۆشەویستی بۆم هەبوو، بەبەردەوامی ئەم ووت: سێ ڕۆژ لێرە ئەمێنمەوەو ئەڕۆمەوە بۆ ماڵی خۆمان.

لەم ماوەیەدا لەخوێندنی زانکۆ دابڕام، کە لەیەکێك لەزانکۆکاندا ئینگلیزیم ئەخوێند، ئاستی بەکارهێنانی مادده سڕکەرەکانم بەرز بۆوە بەڕادەیەکی زۆر، توشی حاڵەتی هستریا بووبووم‌و بەخواردنی ماددەسڕکەرەکان نەبوایە کۆتایی ناهات! ئەو ماوەیەی لەماڵی پورم بووم، دایکم هەواڵێکی کت‌وپڕ چاوەڕێی کردبوو، باوکم پێی ڕاگەیاندبوو کە ژنی هێناوەو سێ منداڵی هەیە.

دایکم لە دژواریەکی سەختدا ئەژیا، دەروونی ئارام نەئەبۆوە لەبەر ئەو ڕووداوە، بەڵام دواتر هێواش هێواش ئەمەی وەرگرت‌و ڕازی بوو بەوڕووداوەو بەڵام داوای لەباوکم کرد کەژنەکەو منداڵەکانی بێنێ بۆ ئەو خانووەی کە تیایدا ئەژین، بۆ ئەوەی کاتێکی زیاتر لەماڵەوە لەناویاندا بمێنێتەوە، باوکیشم بەم داواکارییەی دایکم ڕازی بوو. بەڵام ئەم کارە لەبەرژەوەندی مندانەبوو، چونکە مانەوەی زۆری باوکم لەماڵەوە کەدەرنەئەچوو تەنها بۆ بازرگانیەکی تایبەت نەبێت، منی خستبووە ژێر چاودێریەکی بەردەوامەوەو وەك هەمیشە فشارم لەسەر بوو، باوکم هۆگریەکەمی نەئەزانی، بەڵام دەنگەدەنگی لەگەڵ ئەکردم‌و بەفاشیلی لەقەڵەم ئەدام، بەوەی کەناتوانم لەکارەکانمدا سەرکەوتووبم، منیش بڕیارم دا لەماڵی پورم بمێنمەوە.. پوریشم بۆ من دەرگای لەسەر پشت بوو... لەوێ کەشێکی زۆر گونجاوم بەدی کرد، پورم واتێ ئەگەیشت من گەنجم و پێویستم بەئازادییەکی زیاتر هەیەو زۆریش سەخی بوو لەگەڵم، جگەلەوەی کەلەماڵی خۆشمان دەستم ئەکەوت لەلایەن دایکمەوە، هەموو ئەمانەم لەبەکارهێنانی ماددەسڕکەرەکاندا بەفیڕۆ ئەدا، هەتا ئەو کاتەی کەتراژیدیایەك هات‌و ژیانی من‌و پورە بەستەزمانەکەشمی تێك‌وپێك شکاند، باگوێی لێبگرین ووشە بە ووشە، لە بارەی شەوی یەکەمی کارەساتەکەوە ئەدوێت‌و ئەڵێت: شەوێکی تەپ‌و تۆزاوی بوو، مادده سڕکەرەکە یاری بەسەرم ئەکرد، هەروەك یاریزان یاری بەتۆپ ئەکات، حەپێکی سڕکەرم هێناو خستمە ناو شەربەتێکەوە کەلەدەرەوە هێنابووم، پاشان دەرخواردی پورم داو ئەویش خەوی لێکەوت، ئەوجا شەیتان بەرەوکارێك جوڵاندمی کە موچوڕکە بەلاشەی مرۆڤدا دێنێت!!

کەسەیری پورم ئەکرد لە سەر جێگەکەی خۆی ڕاکشابوو، جل‌وبەرگی تەنکی خەوی لەبەردابوو، شەیتان خەیاڵی ئەوەی بەسەرمدا هێنا، وەك ئەوەی ئەو بووك‌و مانگی چواردەیەو منیش ئەو زاوایەم کە ئەو چاوەڕێی ئەکات، لێی نزیك بوومەوە، ئەویش هیچ

جوڵەیەکی نەبوو لەبەر ماددە سڕکەرەکە، پاشان وەك هاوسەری خۆم مامەڵەم لەگەڵی کرد، دوای تەواو بوونی کارەکەم هەستام بەلابردنی هەر ئاسەوارێك کە ئاماژە بەوە بکات کە من هەستابم بەو کارە.

بەم شێوەیە شەوی یەکەم ڕۆیشت، بەداخەوە دوای دوو ڕۆژ هەمان کارم دووبارە کردەوە، کە یەکەم شەو ئەنجامم دابوو، شەربەتم بۆی هێناو حەپێکی سڕکەرم تێ کرد، پورم شەربەتەکەی خوارد، کەمێك چاوەڕێم کرد، ساتێکی کەم خەوی لێکەوت، پاشان هەستام بەئەنجامدانی ئەو کارە قێزەونە.. من ئەم کارەم دانەهێنا بەڵکو لەلایەن(باوکی ڕەعد)ەوە ئەم کارە دروست کرابوو، کەنەخشەی فراوانی بۆژیانم دائەناو ئەزموونەکانی خۆی پێ ئەوتم، بەڵام ئەو نەی ئەزانی من لەگەڵ نزیکترین کەسی خۆم ئەم کارە ئەنجام ئەدەم.. (باوکی ڕەعد) پێی ئەوتم؛ کە ئەم حەپە کاریگەریەکی ساحیرانەی هەیە لەسەر لاشەی مرۆڤ.

بەم شێوەیە لەگەڵ هەموو پەرداخێکی شەربەتدا حەپێکم بۆ تێ ئەکرد، دوای ماوەیەکی کورت پورم هۆگر بوو، وای لێهات پرسیاری شەربەتەکەی ئەکرد، پورم چووە ناو جیهانی هۆگربوون بەماددە سڕکەرەکانەوە، کەمن پێش ئەو چوومە ناوی‌و ئەویشم لەگەڵ خۆمدا پەل کێش کرد.

کە دڵنیا بووم پوورم هۆگری ئەم حەپە ترسناکە بووە، بەبێ ئەوەی بزانێ کە شەربەتی حەپی سڕکەر ئەخواتەوە، کاتێك هۆشی لای خۆی ناما، ئەوکارەم لەگەڵ ئەنجام ئەدا، هەموو شتێك لەباری ئاساییدا ئەڕۆی.. لە شەوێك لەشەوەکاندا شەربەتە ترسناکەکە لەدەستی پورم بەربیۆوە بەبێ ئەوەی من بزانم.. داوای شەربەتی تریشی لێ نەکردم، دوای ڕۆیشتنی ئەوکاتەی کە لە سەری ڕاهاتبووم چوومە ژووری خەوتنی پورم کە تایبەت بوو بەخۆی، جل‌و بەرگەکانی خۆم داناو وامزانی خەوتووە، لێی نزیك بوومەوە تا جل‌وبەرگەکانی ئەویش دانێم بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەی کەلەسەری ڕاهاتبووم لەڕۆژانی پێشوودا، بەڵام ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراو ڕوویدا، پورم بەترسەوە ڕاپەڕی‌و لە جێگەکەی هەستاو بەدەنگێکی بەرز هاواری کرد، ئیتر ئەم ئەزانی چی بکەم، بەتایبەت من هەستم بەقورسییەك ئەکرد لە لەشمدا سەرم بەگێژەوە ئەهات، ئەمەش بەهۆی ئەو

ماددەسڕکەرانەوە بوو کەخوارد بووم، ئەو شەوە شەوێکی ترسناك بوو لە لای منو پوریشم بەجۆرێك بوو کەهەرگیز کەبەخەیاڵیدا نەئەهات.

گەڕامەوە بۆ ماڵی خۆمان، پورم تەندروستی زۆر خراپ بوو، ڕۆژێکیان تووشی خوێن بەربوونێکی زۆر بووبوو، لە نەخۆشخانە چارەسەری وەرگرتبوو، پزیشکەکە تێی گەیاندبوو کەئەم خوێن بەربوونە لەئەنجامی سکپڕبوونەوە بووەو منداڵەکەی لەبارچووە، کەپێش سێ مانگ سکی لێی پڕبووە.

پورم ڕاستیە تاڵەکەی بۆ دەرکەوت، ئەو ئەیزانی هیچ کەسێك ئەوکارەی لەگەڵ ئەنجام نەداوەوداوێن پیس نیە، پورم بەتەواوی توشی داڕوخانی دەرونی بوو، بەم شێوە بۆ ماوەی مانگێك مایەوەو چارەسەری بەکارئەهێنا، بەڵام باری دەروونی زۆر خراپتر بوو، .. بەئازارو حەسرەتەوە ئەم پرسیارەی لەخۆی ئەکرد: چۆن بۆ کوڕی براکەم‌وا ئاسان بوو بم کاتە ژنی خۆی، ئەمزانیٚ کەحەلاڵ نیم بۆی، لەبەر زۆری خەفەتوبیرکردنەوە کارەساتێکی گەورە ڕوویدا، پورە بەستەزمانەکەم لە داخ‌وەمەراقی ئەو دەستە تاوانبارەی کە چاکەی بەخراپەو خیانەت وەڵام دایەوە مردو گیانی سپارد.

لەگەڵ مردنی پورەکەمدا کەوتمە بارێکی دەروونی زۆر ترسناکەوە، یەکەم هەنگاوم دەست پێ کرد بەڕۆیشتن بۆ دەرەوەی شانشینی سعودیە بۆوەرگرتنی چارەسەری هۆگری بوونەکەم‌و ئەو بارە دەروونیە ترسناکەی کە توشی هاتبووم، لەدەرەوەی وولات لەنەخۆشخانە مامەوە بۆماوەی ساڵێکی تەواو، ئێستا ئەمبینن خەریکە بەرەو باشی ئەڕۆم، بەڵام ئەو برینە هەرچەندە پزیشکەکانی جیهان کۆشش بکەن سەرکەوتوو نابن لەچارەسەرکردنیدا، ئەوەش هەستی قوڵی منە بەوەی کە دەروونی خۆم تێکشکاند لەکاتێکی زوودا، کاتێك دابڕام لەخوێندنی زانکۆ، هۆگری مادده بێ هۆشکەرەکان بووم، هەرئەوەندە نا، بەڵکو کارم کرد بۆتێك شکاندنی ژیانی پورە بەستەزمانەکەم.

## بکوژی خێزانەکەی

دانی بەوەدانا کە ئارەزووی سێکسی کەمە، بەڵام منداڵێکی لێی بوو، دوای چەند مانگێك بکوژی هاوسەرەکەی ئاماژە بەدرێژەی ڕووداوەکە ئەکات، ئەو تاوانەی کەشاری

ئەسکەندەریەی هەژاند، لەگەڵ خزمەتکارە گەنجەکەیدا هاوسەرگیری کردو دانی بەوەدانا کە توانای سێکسی لاوازە.

هەواڵی سکپڕیەکەی پێدا کە لە مێردەکەیەتی، لەگەڵ بوونی لاوازی سێکسی، دوای ئەمە دانی بەپەیوەندیەکی ناشەرعیدا نا لەگەڵ یەکێکی تردا، کوڕەکەی بەخنکاندن کوشت، پاشان ژنەکەشی دایە بەرچەقۆو جەستەی پارچەپارچە کرد(دوبەی. العربیة .نت )٢٠٠٦ز.

شاری ئەسکەندەریەی میسر توشی هەژان هات بە ڕووداوی ئەو پیاوە پیرەی کەژنەکەی خۆی کوشت لەگەڵ منداڵەکەیدا، هەستا بەپارچە پارچەکردنی لاشەیان‌و برژاندنیان بەئاگر، دوای ئەوەی دانینا بەخیانەت لەپیاوەکەی‌و توانج تێگرتنی بەوەی کەتوانای سێکسی کەمە.

لەئەنجامی لێکۆڵینەوەدا ئەوەی ئاشکراکرد کە دوو ڕۆژ دەستکاری مەیتەکانی نەکردووە، پێش ئەوەی هاوسەرگیری لەگەڵ بکات ژنەکەی خزمەت کاری بووەو ئەو هاوسەرگیریەش بەخێرایی ئەنجامدرا، لەگەڵ ئەوەشدا هەواڵی ئەوەی پێداوە کە ناتوانێ مافی هاوسەرگیری لە ڕووی سێکسی پەوە بدات، ئەمەش بەهۆی تەمەنی یەوە کە زۆر لەو گەورەترە، تاوانبار توشی بارێکی نائاسایی ببوو لەکاتی نمایشکردنی تاوانەکەی‌و چۆنیەتی فرێدانی چەند پارچەیەك لە تەرمەکەی لە ناوچەی(عطارین)دا.. هەروەها توشی حاڵەتێکی توندی دەمارگرژی بوو لەکاتی نمایش کردنی پارچە پارچە کردنی لاشەی کوڕەکەی کەناوی(بیلال) بوو، لەناوچەی(عصافیر). لەکاتی لێکۆڵینەوەدا دەرکەوت کە تاوانبار ژنی یەکەمی زوو مردووەو کوڕێکی لێی هەیەو تەمەنی بیست‌وهەشت ساڵە، لەگەڵ کچێك کەتەمەنی سی‌وپێنج ساڵەو لە دووری ئەم دەژین چونکە هاوسەریان هەیە، هاوسەرگیری لەگەڵ خزمەت کارەکەی خۆیدا ئەنجامدا، پێش پێنج ساڵ یەکێك لە برادەرەکانی ئەم ئافرەتەی بۆ دۆزیوەتەوە وەك خزمەتکارێك لە بواری پاککردنەوەو ئامادەکردنی خواردن، هەروەها ئەڵێت: کاتێك بووە بە هاوسەری تەمەنی بیست‌وپێنج ساڵ بووەو پێش وەخت پێی ووتووە: کە توانای کاری ژن‌و مێردایەتی نیە لەبەرئەوەی تەمەنی گەیشتۆتە شەست ساڵ، بەڵام ژنەکە ئەم مەسەلەیەی بەگرنگ نەگرتووە، بەڵکو پێی ووتووە: کەپێشتر سێ جار شووی کردووە، یەکێکیان ڕەسمی بووەو دوانەکەی تریشی عورفی بووە، ئەمەش ئەبێت بەچوارەم شووی.

بەردەوام ئەبێت‌و ئەڵێت: هاوسەرەکەمم لەساڵی (١٩٩٩) ناسی‌و بەرەبەرە ڕاهاتم لەگەڵیداو پارەیەکی زۆرم پێ ئەبەخشی‌و کاتێکش مەسەلەی هاوسەرگیریم هێنایە پێش یەکسەر ڕازی بوو لەگەڵ ئەوەی سی‌وپێنج ساڵ لەو گەورەتر بووم‌و توانای سێکسیشم نەبوو، ئەو پێی ووتم: ژیانێکی هێمنم ئەوێت لەدوای سەرنەکەوتنی لە سێ مێردەکەی تری، هەروەها بوونی دوو منداڵ لەمێردەکانی تری‌و کە ئێستا لای باوکیانن، ئەمانەوای کرد کەداخوازی بکەم لە کەس‌و کاری، بەڵام هاوسەرگیریەکەم خێرابووەو باجێکی گەورەمدا کە لە مەودوا ئەنجامی کارەکەم ئەبینم.

هەروەها ئەڵێت: لە دوای چەند مانگێك لە هاوسەرگیریەکەمان هەواڵی ئەوەی پێدام کەسکی هەیە، سەرم سوڕما، بەڵام بەسەرخۆمم نەهێناو گومانەکەم لەدڵی خۆمدا هێشتەوە، دووپاتیشی کردەوە کە منداڵی منە، بەم شێوەیە هەتاکو پێش چوار مانگ (بیلال) لەدایك بوو.

بەرەبەرە گومانەکەم بوو بەیەقین، کاتێك ویستم بانگی بکەم بۆ شوێنی پشکنین کە لە خانوەکەمانەوە نزیك بوو، دەرکەوت کەهەستاوە بەکرداری تەزویرکردن، بەوەی ئەو منداڵە پێنج ساڵانەیەی کە هەیبوو دراوەتە پاڵ دووکەس، یەکێکیان مێردی پێشووی بووە، ئەویتریان یەکێك بووە کەئەم پەیوەندی لەگەڵیدا هەبووە، دوو بەڵگەنامەی لەدایك بوونی بۆ دەرکردووەو داوێتیە پاڵ دوو کەسی جیاواز. کاتێکیش ڕووبەڕوی بومەتەوەو زیاتر لەجارێکیش فشارم خستۆتە سەری، لەپڕاووتوویەتی کە منداڵە کوڕپەکە(بیلال) لە پیاوێکی ترە، کە لە کاتی شوکردنیدا ئەم پەیوەندی لەگەڵیدا هەبووە، منیش شێت بووم لە تاوی ئەم کارەو لەکاتی خەوتنیدا هەستام بەخنکاندنی (بیلال) بەبێ هیچ بەزەییەك، کاتێك لەخەو هەستاو بۆی گەڕا، منیش تەرمی منداڵەکەم خستە پێش چاوی، دەستی کرد بەهاوارکردن‌و داوای فریاکەوتنی ئەکرد، پاشان چەقۆیەکم لەچێشتخانەکە هێناو بەخێرایی چەند چەقۆیەکم لێداو پاشان سەرم بڕی‌و دەم وچاویم ڕوشاندو ڕام کێشا.

دووڕۆژ بەم شێوەیە مایەوەو پاشان هەستام بەپارچەپارچەکردنی تەرمەکە بە سێ چەقۆی قەبارە جیاواز، گەدەو بەشێك لەپشتیم کردە ناو بەفرگرەکەوە(ثلاجة) وەك پێشەکیەك بۆ بڵاوکردنەوەو فڕێدانی لەناوچە جیاوازەکانی ئەسکەندەرییەدا. مەنجەڵێکی گەورەم هێناو لاشەی (بیلال)م پارچە پارچە کردو پاشان بە ئاگر سوتانم‌و خستمە ئاوەڕۆی

گەرماوەکەوە، تاوەکو ڕزگارم بێ لێی، بەڵام ئێسکەکانی لە پاش خستنە سەر ئاگر ئەم دایە سەگی سەرشەقامەکە.

دەستم کرد بە خستنە سەر ئاگری قۆڵو قاچەکانی خێزانەکەم، تا لەویش ڕزگارم بێت بەهەمان ڕێگەی پێشوو، پاشان دەستم کرد بەقۆناغی ڕزگاربوون لەو بەشانەی کەلەکاتی پارچەپارچە کردنیدا توشی نارەحەتی ئەکردم، ئەویش ناوچەی حەوزو پشتی بوون، ڕزگارم بوو لەبەشێکی حەوزوپشتی، بەڵام کە هەوڵمدا خۆم ڕزگارکەم لە کەللەی سەری، کەوتمە دەست پۆلیس، لەسەرەتادا ویستم نکوڵی لێبکەمو بڵێم خێزانەکەم بە مردنێکی ئاسایی مردووە لەترسی کەسو کارەکەی ئەمەم کردووە، بەڵام درۆکەم سەری نەگرت، لەبەر بوونی پاشماوەی تەرمەکەی لەماڵەوە.

تێکەڵاو نەبوونم بەخەڵکی دەرفەتێك بوو بۆ تەواو کردنی تاوانەکەم بەبێ ئەوەی کە کەس هەستم پێ بکات، بکوژەکە هیچ کات پەشیمانی نەنواند لەسەر تاوانەکەیو ووتی: ناتوانم لەگەڵ منداڵێکدا بژیم کە گومانم لەڕەچەڵەکی هەیەو ناشمەوێ لەوەزیاتر پیاوەکان هەڵخەڵەتێنێ.

## زینای لەگەڵ دایکیدا کرد

ڕۆژێك لە دادگا بووم، لەلای یەکێك لە هاوڕێکانم کە دادوەر بوو، ژنێکی بەتەمەن هات کە غەمبار دیار بوو، هاتە ژورەوەو پاشان ڕۆیشت...

منیش ووتم: مامۆستا چیرۆکی ئەم ئافرەتە چیە؟

ئەویش ووتی: لاحول ولا قوه إلا بالله، ئەمە کوڕێکی هەیە کە ماددە سڕکەرەکان بەکارئەهێنێت، کاتێك سەرخۆش ئەبێت ئەچێت بۆلای دایکیو داوای پارەی لێ ئەکاتو بەهەڕەشە ئەیترسێنێ! جارێك هاتووە بۆ لایو چەقۆی بەدەستەوە بووە، دایکی وای زانیوە پارەی ئەوێت، دایکی پێی ئەڵێت: ئێستا ئەت دەمێ .. ئێستا ئەت دەمێ .. زۆریش ترساوە، بەڵام ئەمجارەیان پێی ووتووە: لەسەر جێگەکە ڕاکشێو بەهەڕەشەی چەقۆ زینای لەگەڵ دایکیدا کردووە.. دادوەرەکە ئەڵێت: کوڕەکەمان هێناو لیژنەی دادگاییمان پێك هێناو بڕیارمان دابەکوشتنی کوڕەکە بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەفەرموێت: ( **من وقع**

ذات محرم فاقتلوه). (رواه الترمذي وابن ماجة). واتە: (هەرکەسێ لەگەڵ مەحرەمی خۆی تێکەڵ بوو بیکوژن).

(شیخ سعد البریك) ئەم بەسەرهاتەی گێڕاوەتەوە.

## باوکە باوکە...دەستو قاچەکانم ئەوێتەوە

خانویەکی تازە، لەگەڵ شتومەکی تازە، پیاوەکە سەروەتێکی زۆری تێدا سەرف کردبوو، لەجوانیو خۆشیدا وەکو گوڵی لێکرد بوو، هاوسەرەکەی هێناو بەبینینی زۆر دڵخۆش بوو، چەند ڕۆژێکیان پێنەچوو ماڵیان گواستەوە بۆ ئەوێ ... لەبەیانی ڕۆژی یەکەمدا، پیاوەکە ڕۆیشت بۆ ئیشو کارەکانیو ژنو منداڵەکانی لە ماڵەوە مانەوە، یەکێك لەمنداڵەکانی دەستی کرد بەهارو هاجیو تێکدانی ماڵەکەو چەقۆیەکی هەڵگرتو دەستی کرد بەیاری کردن بەشتەکانو قەنەفەیەكو کورسیەکی دڕاند...

باوکەکە کە لەکارەکەی گەڕایەوە، کاتێك ئەم کارەی منداڵەکانی بینی، زۆر توڕە بوو، گەورەکەیانی هێناو دەستو قاچی بەحەبلێك توند بەست.. منداڵەکە ئەگریاو ئەپاڕایەوە، بەڵام بێسوود بوو، باوکی خۆشەویستی دونیا کوێری کردبوو، دایکی ویستی منداڵەکە بکاتەوە، بەڵام باوکەکە ووتی: ئەگەر بیکەیتەوە ئەوا تۆ تەڵاق دراوی..

منداڵەکە بەم شێوەیە مایەوەو هەر دەگریا، هەتاوەکو لەگریان بێزار بوو، پاشان خەوێکی قوڵی لێکەوت. کتوپڕ ..ڕەنگی لاشەی گۆڕاو شین هەڵگەڕا، باوکەکە ترساو حەبلەکەی کردەوە، پاشان بەخێرایی گەیاندیە نەخۆشخانە، چونکە وەك بێ هۆش وابوو، دوای چەند پشکنینێکی خێرا، پزیشکەکان بڕیاریان دا کە ئەبێت دەستو قاچی ببڕنەوە، چونکە خوێنەکەی ژەهراوی بووە، ئەگەر بێتو خوێنەکەی بگەڕێتەوە بۆ دڵی، لەوانەیە منداڵەکە بمرێ، بڕیاریاندا دەستو قاچی ببڕنەوە، باوکیشی بەهاوارو گریانەوە ئیمزای کرد.. پەشیمانیو حەسرەتیو نەگبەتی لەوەدا بوو، کاتێك منداڵەکە لەنەشتەرگەریەکە تەواو بوو، سەیری باوکی کردو ووتی: باوکە گیان! باوکە گیان! دەستو قاچم بدەرەوە، جارێکی تر کاری واناکەم...

کاسێتی (یاأبت)محمد الدویش.

## تەلەفزیۆنەکە لەماڵەکەم دەربکە

دوو پیاو لەبەر خاتری خودا پەیوەندیەکی گەرمو گوڕیان هەبوو، یەکێکیان بەبێ ئاگاداری برادەرەکەی تەلەفزیۆنێکی کڕیو بردیەوە بۆماڵەوە، ئەمەش پاش فشارێکی زۆر لەلایەن هاوسەرو منداڵەکانیەوە.. ئەو پیاوەی تەلەفزیۆنەکەی کڕی مرد، پاش تەواو بوونی کفنو دفنو شاردنەوەی تەرمی هاوڕێکەی، ئەمیش بەدڵتەنگیەوە ڕۆیشت بۆ مزگەوتو لەوێ خەوی لێکەوت..لە خەویدا هاوڕێکەی بینی، ڕەنگی ڕەش هەڵگەڕابوو، شوێنەواری ماندوێتی پێوە دیاربوو، وەکو ئەوەی سزایەکی زۆر بدرێ، ئەمیش پرسیاری لێ کرد: چیە؟ بۆچی وایت؟

ووتی: ئەی هاوڕێم، داوات لێ ئەکەم: توخودا بچیت بۆ ماڵمانو ئەو تەلەفزیۆنە دەربهێنی لەماڵەکەم، لەو کاتەی خراومەتە گۆڕەوە، هەتا ئێستا من بەهۆی ئەوەوە سزا ئەدرێم، هاوڕێکەی لە خەو هەستاو پەنای بەخوداگرت لە شەیتانو پاشان جێگەکەی گۆڕیو خەوتەوە. جارێکی تر بەشێوەیەکی خراپتر هاوڕێکەی بینی کە ئەگریاو داوای لێدەکرد کە تەلەفزیۆنەکە دەربکات لەماڵەکەی، جارێکی ترهەستایەوەو جێگاکەی گۆڕیو خەوتەوە، چونکە زۆر ماندوو بوو، ئەمجارەیان هاوڕێکەی بینی بەتوڕەییەوە پێی ووت: هەستە، ئەوەی لەنێوانماندا بوو لەبیرت چوو؟ توخودا داوات لێ ئەکەم بڕۆ بەکەسو کارەکەم بڵێ، چونکە هەرکاتژمێرو دەقیقەیەك دوابکەوی بۆ من خراپترەو سزاکەشم زۆرترە.

هاوڕێکەی ئەڵێت: هەستامو ڕۆیشتم بۆ ماڵیان، لەنێوان دوو ئاراستەدا بووم، کە بڕوا بکەم تەلەفزیۆنیان هەیە، یان بڕوا نەکەم؟! چوومە لای خێزانو منداڵەکانیو داوام لێکردن کە لێم نزیك ببنەوە، بە جۆرێك گوێیان لەقسەکانم بێت، پاشان باسی ڕووداوەکەم بۆ کردن، کە چۆن شوێنەواری ئازارو سزا بەلاشەیەوە دیاربووە.. ژنو منداڵەکانی دەستیان کرد بەگریان. یەکێك لەمنداڵەکان کە زۆر زیر بوو، باوکیشی زۆر خۆشدەویست، هەستا ئامێری تەلەفیزیۆنەکەی هێناو لە پێش چاوی هەمووماندا دای بەزەویداو شکاندی، سوپاسی خودام کردو ڕۆیشتم، دوای ئەوە لەخەودا بینیمەوە، خۆشگوزەرانو دەم بەپێکەنین بوو، نیشانەی بەختەوەری پێوە دیاربوو، پێی ووتم: خودای گەورە ناخۆشیت لەسەر لابدات، هەروەك چۆن ئەم سزای گۆڕەی لەسەر من لابرد.

## تاوانبار باوکمە

ووتی: ڕاستە من هێزۆین‌و ماددەی سڕکەر بەکار نەهێنم، بەڵام پێم خۆش نیە هۆکاری کەوتنە ناو دونیای هۆگر بوونم بەماددە سڕکەرەکانەوە ڕوون بکەمەوە، چونکە هەرکاتێك یادی هۆکارەکەی ئەکەمەوە، هەست بەئازارو دڵتەنگی یەکی زۆر ئەکەم، کە تەنها خودا ئەزانێت، بەهەرحاڵ لەبارەی خۆمەوە بۆتان ئەدوێم:

لە ڕۆژگاری منداڵیمدا زۆر بەخۆشی‌و بەختەوەری ئەژیام، لەنێوان دایك‌و باوك‌و خوشك‌و براکانمدا، هەتا گەیشتمە تەمەنی پانزە ساڵی‌و ئەوکاتە لە قۆناغی خوێندنی ناوەندیدا بووم.. ڕۆژێکیان چوومە ژوورەکەی باوکم‌و بەشێوەیەك بینیم کەپێشتر لەو شێوەیەدا نەمبینی بوو.. شتێکی هاڕاوەی بەدەستەوە بوو، لەسەر کاغەزێکی کانزایی دایناموو، پاشان هەڵی ئەمژی‌و هەندێك هەڵس‌وکەوتی سەیری ئەنجام ئەدا، کە پێشتر نەمبینی بوو، ڕاستی ئەم کارەم نەئەزانی چیە!! چونکە ئەم هاڕاوەیەم لەژیانمدا نەبینی بوو! تەنانەت لەبارەی مادده سڕکەرەکانەوە هیچم نەئەزانی، پێش ئەوە لە سەرووی هەموو شتێکیشەوە، من ئەمەوێت پیاوێك بم وەکو باوکم، لە هەموو شتێکیشدا لە باوکم بچم، لەبەرئەوەی باوکم لە هەموو کارێکدا پێشەوام بوو، لێی چوومە پێشەوە، بە پاڵنەری خۆشەویستی‌و شت زانین‌و لاسایی کردنەوەوە داوام لێکرد کەبەشدار بم لەگەڵیدا، بەڵام لێم ڕاپەڕی‌و لەژوورەکەی دەری کردم‌و هەڕەشەی لێدانیشی لێ کردم، لە ژوورەکە دەرچووم بەڵام ئەم دیمەنە هەرگیز لەخەیاڵمدا نەئەچووە دەرەوە.

ڕۆژگار ڕۆیشت‌و جارێکی تر چوومەوە لای باوکم لە ژوورەکەیدا، بەهەمان شێوەی جاری پێشوو بینیمەوە.

سەرلەنوێ ئارەزوی لاسایی کردنەوە لە دەروونمدا سەری هەڵدایەوە، هەتا زاڵ بووم بە سەر هەڕەشەکەی پێشوویدا، هیوا بڕاو نەبووم، داوام لە باوکم کرد کە بەشدار بم لەگەڵیداو دوای زۆر لێکردن‌و پێ داگریەکی زۆر، کەمێك لەو ماددەیەی پێدام، بەڵام مەرجی بۆدانام، چونکە باوکم زۆر سوور بوو لەسەر بەرژەوەندی من، کە بەکاری نەهێنم، خۆزگە لەسەر ئەم ووشەیە بوەستایەو هیچی تری نەوتایە، بەڵام بەداخەوە... ئەو مەرجەی بۆ دانام، کەلەبەردەمیدا بەکاری نەهێنم، بەڵکو لەژوورێکی تردا بەکاری بهێنم. چوومە ژوورێکی

ترەوە ماددە هاڕراوەکەم لە لوتم نزیك کردەوە، توشی دڵتەنگیەکی زۆر بووم‌و پاشان بەرەو جیهانی خەیاڵ‌و هۆگری چووم‌و کەوتمە ناویەوە.. لە سەر ئەم هۆگریە بەردەوام بووم، یەکێك لە ئەندامەکانی خێزانەکەم هات بۆلام، خودا پاداشتی بەخێری بداتەوە، پاشان ئامۆژگاری کردم‌و ڕێی نیشاندام، دواتر چارسەری بۆ دەستەبەر کردم لە نەخۆشخانەی (ئەمەل)، پەیوەندی بەبەرپرسەکانەوە کردو ئەوانیش بەدەنگمەوە هاتن، بۆ ڕزگار بوونم لەو وێرانییەی کە تێی کەوتبووم.

ئێستا من هەناسەی خۆشی هەڵئەمژم، لە دوای ڕۆژانێکی زۆر قورس، تاوانبار دەروونی خۆم بوو، کە فەرمانی بەخراپە پێ دەکردم، قوربانیەکە خۆم بووم، ئەگەر بەزەیی خودا نەبوایە دەروونم تێك ئەشکا، ئێستا چاودێری‌و دڵنەوایی خۆم ئەکەم بۆ لە بیرکردنی ڕابردوو، بەڵام لەڕابردوودا شتێك هەیە هەرگیز لەبیرناکرێ ئەویش ئەوەیە:(من قوربانیم‌و باوکیشم تاوانبارەکەیە).

## بۆچی براژنەکەی کوشت؟

لە نیوەڕۆی یەکێك لەڕۆژەکاندا، هەواڵیان دا بەژووری بەڕێوەبردنی ئێشکگری ئاسایش، کە ئەمە پوختەکەیەتی:

ژنێك‌و دوو منداڵ لە یەکێك لەگەڕەکەکانی شاری (ڕیاز)دا کوژراون.. لێکۆڵەرەوە ڕۆیشت بۆ شوێنی ڕووداوەکەو گەیشتە جێگەی تاوانەکە، کاتێك چووە شوقەکەوە، تەرمی ئافرەتێکی بینی کە لەڕاڕەوەکە کەوتبوو، شوێنەواری چەقۆ بەپشتی ملی‌و گوێیەوە دیاربوو، پاشان چوو بۆژوورەکەی تەنیشت، تا دیمەنێکی بەئازارتر ببینێ، دوو منداڵی لێبوو، بەهەمان شێوەی دایکیان کوژرابوون، منداڵی یەکەم تەمەنی چوار ساڵ‌و ئەوی تریان تەمەنی دوو ساڵ بوو.

لێکۆڵەرەوە هەستا بەپشکنینی ماڵەکە.. هیچ شتێکی بەدی نەکرد، کە ئاماژە بۆ دزینی کەل‌وپەلی ماڵەکە بکات، لەگەڵ هەبوونی پارەو ئاڵتوون لە ماڵەکەدا، تێبینی ئەوەی کرد، کە هیچ جێگایەك نیە بۆ دەرچوون، تەنها دەرگای دەرەوە نەبێت، لە دەرگاکەشدا هیچ شوێنەوارێکی شکاوی بەدی نەکرد.

بەکۆکردنەوەی ئەم بەڵگانە، لێکۆڵەر ئەوەی بە خەیاڵدا هات کە تاوانبار کەسێکی نزیك، یان ناسیاوی ئەم ماڵەیە... لە سەرەتادا سێ کەس تۆمەتبارکران (مێردی ژنەکەو دوو شوبرای) کە بە بەردەوامی ئەهاتن بۆ ئەم ماڵە، لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کرا، بێ تاوانی مێردی ژنەکە دەرکەوت، دوای ئەوەی کە دڵنیا بوون لەکاتی ڕووداوەکە لە شوێنی خۆی بووە، هەروەها شوبرای یەکەمی ژنەکە ئازاد کرا، دوای ئەوەی دەرکەوت لەو کاتەدا لەسەر کارەکەی بووە، مایەوە شوبراکەی تریان، کە گومانی زۆر لەسەر بوو، بۆیان دەرکەوت کە ئەم گەنجە خراپەکارەو ڕەوشتی لادەری هەیە، مەی ئەخواتەوەو کابرایەکی بێ ئیش‌و کارە، گەنجەکە نەیتوانی لە کاتی ڕووداوەکەدا شوێنی خۆی دیاری بکات، ئەوەشیان بۆ ڕوون بۆوە، کەناکۆکییەکی کۆن هەیەلە نێوان گەنجەکەو ژنەکوژراوەکەدا، هۆی ناکۆکی یەکەش ئەوەیە، کاتێك ئەم ئافرەتە توشی نەخۆشی ئەبێت، پێش چەند ساڵێك پێویستی بەخوێن ئەبێت‌و ئەم گەنجەش ئەیەوێت خوێنی بداتێ، بەڵام ئەم ئافرەتە ڕەتی ئەکاتەوەو بە هاوسەرەکەی ئەڵێت: کە خوێنی شوبراکەی ناوێت چونکە خوێنەکەی پیسە، بەهۆی خواردنەوەی مەی‌و هۆگریەکەیەوە.. بەو هۆیەوە جۆرێك لەرق لەدڵی گەنجەکەدا دروست ئەبێت بەرامبەر براژنەکەی.. دوای چەند ڕۆژێك لەلێکۆڵینەوە، ئەو گەنجە دان ئەنێت بەتاوانەکەیداو دەڵێت: بەردەوام هاتوچۆی ماڵی براکەم دەکرد، بەیانان ئەچووم بۆ ماڵی براکەم‌و براژنەکەم نانی بۆ حازرنەکردم، لەڕۆژی ڕووداوەکەدا چوومە ژوورەوە بۆلای براژنم، شەیتان کرداری خراپی بۆڕازاندمەوە، ویستم کاری ناشیاوی لەگەڵ ئەنجام بدەم، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو، شوێنی کەوتم بەڵام زۆر بەتوندی ڕەتی کردەوە، کەکاری وام لەگەڵدا بکات، هەڵوێستەکە توندتر بوو، پاشان چوومە چێشتخانەکەو چەقۆیەکم هێناو دامە بەر چەقۆ، هەتا مرد، بەهۆی هاوارو دەنگەدەنگەوە یەکێك لەمنداڵەکان خەبەری بۆوەو دیمەنەکەی بینی کەدایکی ئەکوژم، ترسام کارەکەم ئاشکرابکات، بۆیە منداڵەکەشم بەچەقۆ کوشت، پاشان منداڵەکەی تریش لەخەو هەڵساو ئەویشم وەك خوشکەکەی کوشت‌و لەماڵەکە ڕام کرد.. سەیربکەن ئەنجامی تاوان چۆنە؟ هۆگری بەمەیەوە چۆنە؟ بێ ئاگایی لەڕۆژی دوایی چۆنە؟ سکاڵامان تەنها بۆ لای خودای گەورە بەرز ئەکەینەوە...

## ویستی مێردەکەی بکوژێ، بەڵام جگەر گۆشەکەی خۆی کوشت

لە پشت تەلبەندی زیندانەکەدا کەوتبوو، فرمێسك بە سەر ڕوومەتەکانیدا ئەهاتە خوارەوە، ووتی: پیاوێکی درندە ئاسام هەبوو، وەك ئاژەڵی هەڵمەت بەروا بوو، لە کۆمپانیایەك کاری ئەکرد، تەنها ڕۆژانی پێنج شەممەو هەینی ئەمان بینی، کە هاتنەوەی نزیك ئەبۆوە، وام ئەزانی مردنم لێ نزیك ئەبێتەوە، تەنها منداڵێکم لێی هەبوو، تەمەنی دە ساڵان بوو.. ژیانم زۆر بە ناخۆشی ئەرۆیشت کەوێنەی نەبوو، بۆ ساناترین شت لێی ئەدام، جارێکیان لەبەر زۆری لێدانەکەی خەریك بوو بمرم، من خۆم هەڵناکێشم، بەڵام پێتان ئەڵێم: هەرگیز کەمتەرخەم نەبووم لە هیچ شتێکدا، لەگەڵ ئەو هەموو خراپەو دڵ ڕەقیەی بەرامبەر بەمن هەیبوو، شەیتان وەسوەسەی خستە دڵمەوە، تادەرمان خواردی بکەمو ژەهری بۆبکەمە چاوە، تا ئەو ژیانە چەرمەسەرییە کۆتایی پێ بهێنم لەگەڵیدا.. ڕۆژی پێنج شەممە لە ئیش گەڕایەوە، خواردنم بۆداناو دوایی داوای چای کرد، چام بۆئامادەکردو ژەهرێکی کوشندەم بۆ تێکردو بۆم برد، لەبەردەمی خۆی دانا لەسەر سفرەکە، بۆئەوەی گومانم پێ نەبا گەڕامەوە بۆ چێشتخانە بۆ جێ بەجێ کردنی کارەکانم، دوای کاتێکی کەم گوێم لەهاواری کوڕەکەم بوو کە گوێی کەڕ ئەکرد، بەترسەوە ڕامکرد تابزانم چی ڕوویداوە، مێردەکەم بینی خەوێکی قوڵی لێ کەوتووە، کوڕەکەشم هاتۆتە ژوورەوەو باوکی بینیبوو خەوی لێ کەوتبوو، پەرداخە چاکەشی بینیبوو لەبری باوکی خوارد بووی، ئای لەم نەگبەتیە!! جگەر گۆشەکەی خۆم هاوار ئەکاتو داوای یارمەتی ئەکات، داوای یارمەتی لە بکوژەکەی ئەکات، بەڵێ، بکوژەکەی من بوومو کوڕەکەی خۆمم کوشت، ووشەو هاوارەکانی وەك هەورە بروسکەوابوو لە گوێمدا، وەکو بروسکە وابوو بۆسەر دڵم، کەئەیووت: دایکە.. باوکە.. بەڵام هیچ شتێك لەدەستی مندا نەمابوو، ژەهرەکە بکوژ بوو، هاواری کوڕەکەم هەربەرز ئەبۆوەو دەستی بەسکی یەوە گرتبوو، هەتا دەنگی نەما، چەند ساتێکی کەم گیانی سپارد بەپەروەردگار، من ئێستا لەپشت تەلبەندی زیندانەوەم.. بەڵام هەرگیزوێنەی کوڕەکەم لەبیر ناچێت، کاتێك لە بەرچاوم لە ئازاردا ئەتلایەوە، لە بیرم ناچێت بەدەستی خۆم کوڕەکەی خۆمم کوشت.

## دەردەسەری کیژۆڵەیەك

کچێك دەردەسەریەکانی خۆی ئەنوسێت، کە بە سەریدا هاتووەو بەهۆی خۆشەویستییەوە تاڵیی چەشتووە، ئەم کچە ئەڵێت: نامەوێت ناونیشان بۆدەردەسەریەکانم بنوسرێت، هەر ناونیشانێ بێ؟ بەڵکو ناونیشانی ڕووداوەکەم بنوسن (ئەسرینی پەشیمانیو حەسرەت).. بەڕاستی فرمێسکێکی زۆر، ئازارێکی زۆری لەگەڵ خۆی هێنا، لەگەڵ بە سووك سەیرکردنم بەهۆی ئەو تاوانانەی ئەنجامەدا بەرامبەر بەخۆمو کەس‌وکارم، پێش ئەمانەش بەرامبەر پەروەردگارم.. من کیژۆڵەیەکم شایەنی بەزەیی‌وسۆز نیم، بەڕاستی خراپ بووم بۆخێزانەکەمو کەس‌وکارم، بەهۆی ئەوەی من ناپاکیم کرد بەرامبەر بەو متمانەیەی کە ئەوان پێیان بەخشیبووم.. هۆکارەکەشی بەهۆی تەلەفۆنی نەفرەتی یەوە بوو، کە بووە هۆی پەیوەندی کردنم بەو مرۆڤەی کەدڵی نەبوو، بەقسەی شیرین فریوی دامو یاری بەسۆزوهەستم کرد، هەتا لەڕێگەی خراپدا لەگەڵی بڕۆم، هێدی هێدی پەیوەندیمان زیادی کرد، تا گەیشتە خراپترین هەڵدێر، هەموو ئەمانە بەهۆی خۆشەویستییەکی خەیاڵاویەوە بوو، کە چاوی کوێر کردبووم، لەکۆتایدا بووە هۆی لەدەست دانی بەنرخترین شت کە کچ شانازی پێوەئەکات، بەهەمان شێوە دایكو باوکیش شانازی پێوەئەکەن، کاتێك کچەکەیان ئەدەن بەگەنجێكو داوای دەستی کچەکەیان ئەکات بەڕێگەیەکی شەرعی..

ئەم ئابڕووەم دانا لەگەڵ مرۆڤێك کە ئابڕووی نەبوو، مرۆڤێك کە دڵو مرۆڤایەتی خۆی فرۆشتبوو، دوای ئەوەی هەموو شتێکی لێ سەندم، پاشان وازی لێهێنامو هەموو کاتو ساتێ بەهۆی ئەو کردارە نەشیاوەی لەگەڵم کردی ئازار ئەچێژم، لەو کاتەوە کە سکی پڕکردم لە مەینەتییەکی گەورەدا ئەژیم.. کەس بەم حاڵەی نەئەزانیم، تەنها خودای گەورە نەبێت، کاتێك هەوڵمدا بەدوایدا بگەڕێم ئەو ڕای ئەکردو خۆی ئەشاردەوە، بەپێچەوانەی پێشووتر، چوار مانگ لەئاگری ئازارو نارەحەتیدا دەستەو ئەژنۆ دانیشتمو مامەوە، تەنها خودا ئەزانێت چەندە ئازارو ناخۆشیم چەشتووە، بەهۆی ئەو سکەی کە دەروونی قورس‌و ماندو کردم، بیرم لەوە ئەکردەوە، بەم شێوەیە چۆن ڕووبەڕووی کەس‌وکارم ببمەوە؟! باوکم پیاوێکی کەم تواناو ماندوو و داماو بوو، تەنانەت لەوانەیە موچەکەی بەشی نەکات.. دایکم ژنێکی پاکو بێگەردەو هەموو شتێکی بۆفەراهەم کردووم تا خوێندنەکەم تەواو بکەمو

بگەمە پلەیەکی بەرز، بەڵام هیوا بڕاوم کردو زۆر خراپەم لەگەڵی کرد، کە مایەی لێخۆشبوون نیەو هەتا ئێستاش تاڵیەکەی ئەچێژم.. بێ هیوا نەبووم لە پەیوەندی کردن پێوەی بەڵکو دڵی نەرم بێتو بەزەیی بەحاڵمدا بێتەوە، هەواڵی سکپڕی یەکەمم پێدا، کاتێك بەمەی زانی، پێی ووتم: کە یارمەتیت ئەدەم بۆ لەباربردنی ئەو کۆرپەیەی کەلە هەناومدا ئەجوڵێەوە.. خەریك بوو شێت ببم.. ئەوبیر لەوە ناکاتەوە بێتە پێشەوەو داخوازیم بکات، تا شووی پێ بکەم، بۆئەوەی ئەوەی خراپ بووە چاکی بکەین، بەڵکو منی خستە بەردەم دوو هەڵبژاردنەوە، یان ئەوەتا لەو دەردەسەریەدا وازم لێ ئەهێنێت، یان سکەکەم لەبار بەرم بۆ ڕزگاربوون لە ئابڕووچوونو سوکایەتی، چەند ڕۆژێك تێپەڕیو بەبێ ئەوەی بێتە پێشەوە بۆ داواکردنم، دوای ئەمە چوومو هەواڵم دابە پۆلیس، پاشان بە دوایدا گەڕانو دۆزیانەوە، بەڵام لە دوای دوومانگ، چونکە ناوێکی تری دابوومێ لەبری ناوی خۆی.

لەکۆتاییدا کەوتە دەست پۆلیسو ڕوون بۆوە کەژنی هێناوەو چوارمنداڵیشی هەیە، پاشان خرایە زیندانەوە، منیش خرامە زیندانی ئافرەتانەوە، ئافرەتێکی نارد بۆلام کە ئەگەر بێتو لای دادوەر حاشا لەکارەکەی بکات، ئەوا هاوسەرگیری لەگەڵ ئەکات لەدوای دەرچونیان لەزیندان، بەڵام من ڕەتم کردەوە، ڕاست نیە جارێکی تر خۆم بەتەڵەوە بکەم، ئێستا من لەزیندان دەرچووم بۆ زیندانێکی گەورە تر، ئەویش ماڵەوە بوو، لەماڵەوە خۆم شاردۆتەوەو لەگەڵ کەس قسەناکەمو کەس نامبینێ، بەهۆی ئەو ئابڕوو چوونەی کەهۆکارەکەی خۆم بووم، ئێستا بە شەوو بە ڕۆژ ئەگریم، سا بەڵکو خودای گەورە لەڕۆژی دوایدا لە گوناهەکانم خۆش بێت، داواش لەئێوە ئەکەم دوعام بۆبکەن، کە خودای گەورە تەوبەکەم قبوڵ بکاتو ئازارەکانم کەم بکاتەوە.

### مردوو ئەمەی دووبارە ئەکردەوە (واز لە سەهەمەکان مەهێنن)

یەکێك ئەنوسێتو ئەڵێت: یاشێخ ئەم نامەیەتان لە جیاتی خوشکێك بۆ ئەنێرم لە سوریا، وە سوێندی داوم کەبۆتی بنێرمو لەوتاری هەینیشدا باسی بکەیتو لە سایتەکەشتدا بڵاوی بکەیتەوە، تابگاتە دڵی پیاوانو باوکانو مێردەکان.

هاوڕێکەم بە دڵێکی گرگرتووەوە باسی سەرەمەرگی مامی ئەکاتو ئەڵێت:مامم نوێژێکی بێبایەخی ئەکرد، گرنگ ئەوەبوو تەنها لە کۆڵی خۆی بکاتەوە، لە ڕەمەزانیشدا نەبێت قورئانی نەئەخوێند، هەروەها لەگەڵ بانکە سوو(ربا)خۆرەکاندا مامەڵەی ئەکرد، باوەڕی بەوەنەبوو کە ئەو زیادەیە سوو بێتو بەقازانجو بازرگانی ئەدایە قەڵەم.

ساڵێك پێش مردنی تەنها خەمی لەم دونیایەدا بریتی بوو لە بەشداری کردنی بانقە سوو خۆرەکان.. ئەم خوشکە باسی ئەوە ئەکات کە مامی توشی ڕووداوێك بووەو گوازراوەتەوە بۆ نەخۆشخانە.

کاتێك چووین بۆدیداری، لە ژوور سەریەوە دانیشتم تا شایەتمانی بیر بخەمەوە، بەڵام ئەم ووتەیەی بەسەرزاردا نەهات، بەڵکو ئەیووت: واز لە بازرگانیی سەهمەکان مەهێنن، لەدوای مردنی من، واز لە بەشداری کردن مەهێنن.. لێی بێئومێد نەبووم، بەڵکو هەر ووتەی ( **لا إله إلا الله** )م لە بەردەمیدا دووبارە ئەکردەوە، سا بەڵکو زمانی بێتە گۆو ئەم ووتەیە بڵێت.. بەڵام هەرقسەی خۆی دووبارە ئەکردەوە، واز لە بازرگانی سەهمو پشك مەهێننو بەشداری بکەن، لە دوای خۆم سەهمەکان مەفرۆشن.....

بەداخەوە بەم شێوە مردوو کۆتا ووشەی ئەمەبوو: سەهمەکان مەفرۆشن، پەنا بەخودا ڕەنگی ڕەش هەڵگەڕا، داواکارین خودای گەورە بەزەیی پێمان بێتەوەو لەگەڵ هەموو موسوڵمانانندا کۆتایمان بەخێر بگێڕێت.

## مردوو، کۆنترۆڵەکە لەدەستیدا بوو

یەکێك لە مردوو شۆرەکان ئەڵێت: یەکێك پەیوەندی پێوەکردمو پێیووتم: کوڕەکەم مردووەو ئەمەوێت بێیت بیشۆیت، ڕۆیشتم بۆ ئەوماڵەو دەرگایان لێ کردمەوەو پرسیارم لەبارەی مردووەکەوە کرد؟

ووتیان: لەنهۆمی سەرەوەی خانوەکەدایە، سەرکەوتمە سەرەوەو لەژوورێکی ئامادەکراودا بوو، هەموو جۆرە ڕابواردنێکی لێبوو، تەلەفیزیۆن... کۆمپیوتەر ...ڤیدیۆ....

کە چوومە ژووری گەنجەکەوە، شتێکی سەیرم بینی، گەنجەکە لە تەمەنی بیست ساڵیدا بوو، دەستی بەبرین پێچێك پێچرا بوو، خوێنی لەبەر ئەڕۆی، سەرم سوڕما! پرسیارم لە باوکی کرد سەبارەت بەهۆی مردنەکەی؟! زۆر دوو دڵ بوو لەوەڵام دانەوە، پاشان ووتی:

کوڕەکەم سەیری کەناڵە خراپەکانی ئەکرد، زۆر شەو بەدیاریانەوە شەو نخونی ئەکرد، شەوی ڕابردوو پێمان ووت: وەرە خوارەوە نانی ئێوارەمان لەگەڵ بخۆ، ووتی: بە خزمەت کارەکەدا نانم بۆ بنێرن، نانمان بۆ نارد، خزمەتکارەکە چووە سەرەوە لەدەرگایدا، نەی کردەوەو وەڵامیشی نەبوو، لە پەنجەرەکەوە سەیرم کرد شتێکی سەرسوڕهێنەرم بینی! کوڕەکەم وەك مردوو وابوو، دەرگاکەم شکاندو کوڕەکەم بەمردووی بینی، کۆنترۆڵی تەلەفزیۆنەکەی بەدەستەوە بوو، تەلەفیزیۆنەکەش لە سەر فلیمێکی زۆر بێ ئابڕوو بوو...

لەم کاتەدا تووشی حەسرەتو پەشیمانی بووم بۆ ئەو مردنە، یەکەم شت کەپێی هەستاین، هەوڵماندا ئامێری کۆنترۆڵەکە لە دەستی دەربکەین، بەڵام نەمان توانی، ئەت ووت کۆنترۆڵەکە بەدەستیەوە لکاوە، چارمان نەبوو ئەوەنەبێت ئامێرەکە لەدەستیدا بشکێنین، ئامێرەکە شکا، بەڵام دوگمە وتەلەکانی بەدەستیەوە نووسا، پاشان وتمان: ئەگەر دەستی ببڕینەوە بۆ ئێمەو ئەویش باشترە، مشارمان هێناو دەستیمان بڕیەوەو خوێنی لێ هات، پاشان بەبڕین پێچ پێچامان.

مردوو شۆرەکە ئەڵێت: گەنجەکەمان هێناو پاشان شۆردمانو بەباوکیم ووت: کوڕەکەت بەرە بۆمزگەوتێك نوێژی لە سەر بکەن بەڵکو خودای گەورە ڕەحمی پێ بکات...

بەڵام باوکەکە ئەمەی ڕەت کردەوەو ئەڵێت منیش ڕۆیشتمو هەر دووکیانم بەجێهێشت.

پاك‌و بێگەردی بۆخودا چۆن مرد، سەیری ئەوکەناڵە خراپانەی ئەکردو ئامێری کۆنترۆڵەکەش لە دەستیدا بوو، بەخودا ئەوە ئەگبەتی‌و بێ ئابڕووییە، ئەی ئەوکەسانەی هۆگری کەناڵەکانن ئاگاداربن لەوانەیە کۆتایتان وەك ئەم گەنجەبێت..

﴿ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ إِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَلَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾ یونس. واتە: (هەموو قەومێك کاتی دیاری کراوی خۆی هەیە بۆکۆتایی هاتنی، هەرکاتێك ئەو سات‌وکاتە هات نەدوانەکەوێت‌و نەپێش نەکەوێت)..

خودای گەورە ئێمەو هەموو موسوڵمانێك بپارێزێت لە هەموو خراپەیەك.

## من و خەسووم

چیرۆکەکەم ئەگێڕمەوە تا ببێتە پەند بۆ هەموو خوشکێك..

هونەرم بەکارئەهێنا لە ئازاردانی دایکی مێردەکەمداو چێژم لێ وەردەگرت، بەپێی توانای خۆم مێردەکەم لە دایکی دوورخستەوە، مافی خەسووم لەبیرکردبوو کەخودای گەورە فەرزی کردبوو لەسەرمان.. کاردانەوەی ئەم ستەمە تۆڵەی پەروەردگار بوو لە من، کاردانەوەکە زۆر گران بوو، بە جۆرێك ژیانمی لە بنچینەوە تێکشکاند، ئەو ئایەتەی قورئانم بیرکەوتەوە کەئەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَـٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَـٰرُ ﴿٤٢﴾ ﴾ ابراهیم. واتە: (ئەی پێغەمبەر وا گومان مەبە کە خودای گەورە بێ ئاگایە لەو کارو کردەوەیەی ستەمکاران ئەیکەن، بەڕاستی خودای گەورە سزاکەیان دوائەخات بۆ ڕۆژێك کەچاوەکانیان تێیدا ئەبڵەق ئەبێت).

فرمێسکی بەخوڕم دەریایەکی گەورەی دروست کرد، ئەوەی ڕوویدا ناکۆکیەکی بێدەنگ یان ئاشکرابوو لەنێوان ژنێكو دایکی مێردەکەیدا، دایکەکە مافی خۆی لەپێشتر ئەبینی بۆ کوڕەکەی، ژنی کوڕەکەش دانی بەومافانەدا نەدەنا، وای ئەزانی مێردەکەی موڵکی تایبەتی خۆیەتی، ڕێگەی نادا کەسی تر بایەخی هەبێت لەلای ئەگەر دایکیشی بێت.

چیرۆکەکەم لەخەیاڵەوە نزیکترە هەتا لە ڕاستی، لەوانەشە کاڵفامیو گاڵتە پێکردنی من بەدایکی مێردەکەم هۆکاری ئەم بەدبەختیە بێت کەوەسف ناکرێتو لەیەك ساتەوەختدا هەموو شتێك داڕووخا، کە بەخەیاڵی مرۆڤدا نایەت، لەبەر ئەوە چیرۆکەکەم پێشکەشی هەموو کچێك ئەکەم تاپەندو ئامۆژگاری لێوەرگرن، مێردەکەم کەکوڕی مامم بوو، هەر لەمنداڵی یەوە پەیوەست بووین بەیەکەوە، هەتا گەورەش بووین.. پاشان ژیانی هاوسەریمان پێکهێنا لەناو خۆشیەکی زۆری کەسو کارداو هیوای ژیانێکی بەختیاریان بۆخواستین، ژیانێکی پڕ لەئاسودەییو خۆشەویستی ئەژیاین کە نزیك بوو لەئەفسانەوە، تەنانەت هەندێك کەس ئێمەیان وەك نمونەی گونجاوو خۆشەویستیو تێگەیشتن لەیەکدیو پەیوەست بوون بەیەکەوە ئەهێنایەوە، خودای گەورە دوو منداڵی پێ بەخشین، کوڕەکەمان بەناوی باپیریەوە ناو ناو کچەکەش بەناوی دایکمەوە، مێردەکەم زۆری خۆشدەویستم، بەڕادەیەك کە مایەی ئیرەیی پێ بردن بێت، من بەشایەدی هەمووان زۆر جوان بوومو زۆر

گرنگیم بەخۆم ئەدا، لەوانەشە جوانیەکەم پاڵنەرم بووبێت بۆ ئەوکارە دوژمنکاریەی کەبەرامبەر خەسوم ئەنجامم دەدا، بەدڵنیاییەوە دڵخۆش دەبووم بەرەنجاندنیو ساردو سڕی نواندن لەگەڵیدا، چونکە من هەموو هێڵەکانم بەدەستەوە بوو، ئەشم زانی کە ئەوکارەی پێی هەڵدەستام بەڕاستی هەڵەیەکی گەورەیە، بەڵام ئەوەی ئەم بیستو کاری تێدەکردم ئەوە بوو کەخەسوم ڕقی لێمە، گرنگ ئەوەبوو توانیم وا لە پیاوەکەم بکەم کە کەمتر گرنگی بەدایکی بدات، ڕۆژگار بەردەوام بوو، هەر بەئارەزوو دایکی مێردەکەمم دەرەنجاند، بەم جۆرە یاریەکە بەردەوام بوو، کاتێك دەمبینی مێردەکەم بایەخ بەدایکی نادات‌و گوێ بۆ گلەییەکانی شل ناکات، من هەستم بە بلیمەتییەکی سەروو بلیمەتی یوسف دەکرد(درودی خودای لێبێت)، هەتا ئەوڕۆژە ڕەشە هات، بەلێدانێکی کوشندە لەخەسومم دا کە هەموو ژیانی لەیەك ساتدا وێران کرد، بەڵام هەرچۆنێك بێت من دۆڕاوو پەشیمانم .

خەسووم نەخۆش کەوت‌و منیش چووم بۆ لای، کاتێك لای دانیشتم، بە هەموو جوانی مەوە خۆم ڕازاندبۆوەو پێم ووت: وەسیەت نامەکەت بنووسە.

هەناسەیەکی هەڵکێشاو بەچاوی فرمێسکاویەوە پێی ووتم: ئەی کچەکەم مردن ڕاستە، بێ دەنگ بوو، هەستام بەخێرایی چوومەوە بۆماڵەوە... کاتێك مێردەکەم گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، وەك هەمیشە بانگی منداڵەکانی ئەکردو قسەی خۆشی بۆئەکردن، لەبارەی یادەوەریەکانمەوە دواین، کەیادەوەری جوان‌و خۆش بوون، پێی ووتم: چۆن بەبێ تۆ بژیم، هەموو خەڵك ئیرەیم پێ ئەبەن. پێم ووت: هەروەها منیش...

پاشان ئەوەم بۆ باس کرد کە دایکی نەخۆشەو سەردانی بکات، ئەویش ڕۆیشت، چەند دەقیقەیەکی نەبرد مێردەکەم بەڕوخسارێکەوە هاتەوە کەپێشتر نەم دیبوو، ڕووخساری گرژ بوو، پێم ووت: مرد؟ ووتی: نا، بەڵام...ووتم: بەڵام چی؟؟ لەماڵ دەرچوو بێ ئەوەی قسەم لەگەڵ بکات..

لەوساتەدا هەستم کرد کەدایکی شتێکی پێ ووتووەو هەراسانی کردووە، چووم بۆلای بەشێوەیەکی گاڵتەجاڕیو بەزمانێکی خۆ بەزل زانییەوە پرسیارم لێ کردو پێم ووت: پیرێژن چیت بەمێردەکەم ووت؟ ئەویش لەسەر خۆ بەدەنگێکی بەسۆزەوە ووتی: ڕاستە مردن حەقە، من لەمەو پێش نەمزانی بوو (حەرامە)، تۆو کوڕی مامەکەت (واتە مێردەکەت) بەیەکەوە شیرم پێداون، ئەمڕۆ لە ڕادیۆ گوێم لە شتێك بوو ئەیووت: خوشکی

شیری مارەیی لەبرای شیری نایەت، پرسیارم لە زانایان کردو پێیان ووتم: کە هاوسەرگیری کوڕەکەت نادروستو پووچە.

هاوارم کردو پێم ووت: منت تێکشکاند!! گوناهت ئەگات، تۆدڵ ڕەقی، لەو کاتەدا دونیام لێ هاتەوەیەكو کەوتم بەزەویدا، بووم بەمایەی قسەی خەڵکی، پرسیارم لەدایکم کرد لەبارەی شیرخواردنەکەوەو پێی ووتم: ئەو شیرخواردنە لەپەنجەکانی یەك دەست تێناپەڕێ، بەڵام خەسووم سوێندی خوارد کەلە پەنجەکانی هەردوو دەست زیاتر بووە، دوای بەرز بوونەوەی کێشەکەمان بۆ دادگا، بڕیار دەرچوو بەجیابوونەوەی منو مێردەکەم بەبێ تەڵاق، بێگومان هەموو شتێکی جوانی ژیانم تیا چوو.. بەڵێ.. من گوناهبار بووم، من پاڵنەر بووم تا ڕووداوی ئەو شیرخواردنەوەیە بگێڕێتەوە، تادڵم تێك بشکێنێ، وەك چۆن من دڵی ئەوم تێك شکاند، چی بچێنیت ئەوە دەدوریتەوە، لەوساتەدا فرمێسکم بەخوڕ ئەهاتە خوار، پاشان گەورەیی ئەو تاوانانەم بیرهاتەوە کە لەگەڵ ئەو ئافرەتە بەستەزمانەدا ئەنجامم دەدا، هەتا بەم شێوەیەم بەسەرهات.

## خۆشەویستی تەمەن

کاتێك باوکم مرد من منداڵ بووم، دایکم سەرپەرشتیارو چاودێری ماڵ بوو، ئیشو کاری ماڵانی ئەکرد، تا بتوانێ شت بۆ من بکڕێ، چونکە من تەنیا منداڵی ئەو بووم، خستمیە بەر خوێندنو خوێندنی زانکۆم تەواو کرد... زۆر باش بووم لەگەڵیدا، پاشان کاتی چوونم هات بۆ دەرەوەی وڵات. دایکم خوداحافیزی لێ کردمو فرمێسك لەچاوەکانی قەتیس مابوو، پێی ووتم: کوڕەکەم ئاگاداری خۆت بەو بەردەوام هەواڵم لێ مەبڕە... نامەم بۆ بنێرە تالەتەندروستیت دڵنیابم.

گەشتم کرد بۆ وڵاتانی ڕۆژئاوا تا خوێندن تەواو بکەم لەوێ .. دوای ماوەیەکی زۆر گەڕامەوە بۆ وڵاتەکەم، کاتێك گەڕامەوە کەسێکی تربووم، شارستانیەتی ڕۆژئاوا کاری تێکردبووم، وەکو دواکەوتوویی سەیری دینم دەکرد، وام لێهاتبوو تەنها باوەڕم بە ژیانی ماددی هەبوو، پەنا بەخودا!! دوای گەڕانەوەم پلەو پایەیەکی بەرزم بەدەست هێنا.. دوای ئەمە بەدوای ئافرەتێکدا دەگەڕام تا بیهێنم، لە کۆتایدا دۆزیمەوە، دایکم کچێکی دینداری بۆ

دۆزیمەوە، بەڵام ڕازی نەبووم تەنها بەو کچە جوانو دەوڵەمەندە نەبێت، چونکە خەوم بەژیانی ئۆرۆستۆقراتیەوە ئەبینی..

دوای شەش مانگ لەژن هێنانم، خێزانەکەم کەوتە پیلان گێڕان لەدایکم، تاوای لێهات ڕقم لەدایکم دەبۆوە. ڕۆژێکیان چوومەماڵەوە، خێزانەکەم ئەگریا، پرسیارم لەهۆکاری گریانەکەی کرد؟ پێی ووتم: یان من لەم ماڵەدا ئەبم یان دایکت.. لەمە زیاتر ناتوانم ئارام بگرم.. منیش شلگیر بوومو دایکم لە ماڵ دەرکرد، لەو ساتەدا کەشەیتان بەسەرمدا زاڵ بوو، دایکم ئەگریاو پێی ئەووتم: خودا باشت بۆ بکات، خودا بەختەوەرت بکات.

دوای چەند کاتژمێرێك لە دەرکردنی چوومە دەرەوەو بەدوایدا گەڕام بەڵام بێ سوود بوو، گەڕامەوە بۆماڵەوە.

هاوسەرەکەم بەفێڵو منیش بەنەزانی خۆم توانی ئەو دایکە بەنرخو باشەم لەبیر بەرێتەوە، کە هەموو تەمەنی خۆی لەپەروەردەکردنی مندا بەفیڕۆدا، شەونخونی دەکرد بۆ خۆشی من، خۆی برسی بوو، بەڵام من تێر، خۆی بێ پۆشاك بوو، منیش پۆشتە...

ماوەیەك هەواڵی دایکم نەدەزانی، لەوماوەیەشدا تووشی نەخۆشی یەکی خراپ بوومو خرامە نەخۆشخانەوە.

دایکم بەهەواڵەکەی زانیو بەگریانەوە هات، وویستی سەردانم بکات، بەڵام پێش ئەوەی بێتە ژوورەوە، گوێم لەخێزانەکەم بوو دەری کردو پێی ووت: کوڕەکەت لێرە نیە... چیت لێمان ئەوێتو لێرە بڕۆ... دایکم لەکوێوە هاتبوو بۆ ئەو شوێنە گەڕایەوە. دوای ماوەیەکی زۆر لەنەخۆشخانە دەرکرامو باری دەروونیم خراپ بوو، ئیشو کارەکەمو خانوەکەم لەدەست دا، قەرزارێکی زۆر بووم، هەموو ئەمانە بەهۆی هاوسەرە خراپەکەمەوە بوو، بەڕاستی بەداواکاریە زۆرەکانی ماندووی کردبووم، لە کۆتایدا خێزانە جوانەکەم پێی ووتم: لەبەرئەوەی ئیشو کارو ماڵەکەت لەدەست داوەو هیچ پلەوپایەیەکت نەماوە لەکۆمەڵگەدا، من بەئاشکراو بەڕاشکاوانە پێت ئەڵێم: تۆم ناوێ تەڵاقم بدە.. تەڵاقم بدە..

ئەم هەواڵە وەك هەورە بروسکە دابەزیە سەرسەرم، لەژێر کەللەڕەقیو سووربونیدا تەڵاقم دا، تالەوخەوە بەئاگابێم کەمن تێیدا بوومو لەماڵ دەرچووم، بەڕوخساری خۆمدا ئەکێشاو بەدوای دایکمدا ئەگەڕام.. بەهەموو دەنگم بانگم ئەکردو ئەم ووت: دایکە تۆ

لەکوێی؟ بەڕاستی ستەمم لەتۆ کرد، بەڕاستی خراپەم ئەنجامدا بەرامبەر ئەوچاکانەی کەبەرامبەر من کردت.

لەکۆتایدا بینیمەوە، بەڵام لە کوێدا!! لە شوێنێك بینیمەوە کە کەوتبوو خەڵکی باش خێروخێراتیان پێ ئەکرد.. چوومە پێشەوە لێی، گریان زۆر کاری تێ کردبوو، دڵتەنگ‌و غەمبار دیاربوو، هەر کەبینیم خۆمدا بەسەر قاچیداو زۆر گریام، ئەویش بەشدار بوو لەگرییانەکەمدا، ماوەی کاتژمێرێك بەم شێوەیە ماینەوە، پاشان فرمێسکەکانیم سڕی‌و هێنامەوە بۆ ماڵەوەو بڕیارمدا لەمەولا گوێ ڕایەڵی بم، پێش ئەوەش شوێن کەوتەی فرمانەکانی خودای گەورە بەو دوور کەومەوە لەوشتانەی کە خودا قەدەغەی کردووە، ئێستا من لە خۆشترین‌و جوانترین کاتەکانی ژیانمدا ئەژیم‌و لەگەڵ خۆشەویستی تەمەنمدا کە (دایکمە).

## لەقوربانیەکانی شۆفێرو خزمەتکارەکان

ئەی باوکی بێ ئاگا، ئەی دایکی سەرقاڵ، خزمەتکارو شۆفێرەکان تیرۆری جگەر گۆشەکانمان ئەکەن بەئابڕو بردنیان، کوڕو کچەکانمان چیرۆکی دژوار لەبارەی شۆفێرو خزمەتکارەکانەوە ئەگێڕنەوە.. شوێنەواری خراپی بەکارهێنانی خزمەت کارەکان بەردەوام لەکەنداوو وڵاتانی ئیسلامیدا دیارو بەرچاوە.. ئەمەش کێشەیەکە، کە ورووژێنەری گفتوگۆو باس‌و خواسی بەردەوامە لەنێوان پسپۆڕە کۆمەڵایەتی‌و پەروەردەییەکاندا، یان لەنێوان خەڵکیدا بەشێوەیەکی گشتی، ئەمە لێکۆڵینەوە نیە، بەڵکو دەرخستنی خراپەی کارەکەری ماڵان‌و شۆفێرەکانیانە، لەگەڵماندا بن بۆ چیرۆکی ئەم منداڵە بەستەزمانانە(هند، أحمد، هیفاء، محمد، نور، هتان، ولید، سارەو خوشکەکەی، سماهیر، عبیر ).

## هـــندو دایەنەكەی

كاتێك گوێتان لەم چیرۆكە دەبێت، چاوتان بەفرمێسك تەڕ نەبێت، لەو فەرامۆشیەی كەتیایدایەو لەو تاوانەش كەتیایدایە لەلایەكی ترەوە.. باوكەكە، پێویست بوو هەموو بەیانیەك لەماڵ دەربچوایە بۆ ئیش‌و كارەكانی، پاشان لەكاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆ بەشەكەتی‌و ماندویەتی ئەهاتەوە، لەدوای ڕۆژێكی پڕ هەوڵ‌و عەرەق ڕشتن، بۆ بەدەست هێنانی بژێوی ژیانی خێزانە بچوكەكەی، دایكەكەش دوای كەمێك لەڕۆیشتنی مێردەكەی ئەچوو بۆ شوێنی ئیشەكەی خۆی.

بەپێی ئەم هاوكێشەیەی ژیان، پێویستە دایەنێكی دەرەكی هەبێت بۆ بەخێوكردنی منداڵە بچوكەكەیان، كە پێنج ساڵی تەواو نەكردبوو. منداڵێكی ڕوخسار جوان بوو، لەچاوە شینەكانیدا بریسكەی زیرەكیەكی كەموێنە دەدرەوشایەوە، تێكەڵ بەپاكی‌و بێگەردی منالآنە.. باوكەكە دایەنێكی پەیدا كرد، بۆچاودێری كردنی منداڵە بچوكەكەیان، هەردوو هاوسەرەكە پێش بڕكێیان ئەكرد بۆ ئەوەی زوو بگەڕێنەوە بۆ ماڵەوەو منداڵەكەیان بگرنە باوەش‌و دەست بكەنە ملی.

دایەنەكە كاتێك ئەوان لەماڵ نەبوونایە ئیش‌و كارەكانی ماڵەوەی ئەنجام ئەدا، ڕۆژێكیان دایەنەكە هەڵەیەكی گەورەی ئەنجامدا، كە شیاوی لێپرسینەوە بوو، لەلایەن دایكی هندەوە شتەكە كۆتایی پێهات، دایكی هند ئەم ڕووداوەی بەهەموو شتەكانەوە لەبیر چوو بۆوە هەر لەیەكەم ساتی ڕووداوەكەوە، بەڵام دایەنەكە ئەمەی لەبیر نەچوو بوو! كارێكی شەیتانانەی لەدڵیدا شاردبۆوە..

لەبەیانی ڕۆژی دووەمدا ویستی تۆڵەی خۆی دووقات بكاتەوە، بەڕێگەیەكی شەیتانی، هەستا بەجێ بەجێ كردنی پلانەكەی، پارچەیەك گۆشتی لەبەفرگرەكە دەرهێناو پاشان لەسوچێكی چێشتخانەكەدا داینا بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك، تابەتەواوی بۆگەن بوو، پاشان كرم بەناویدا هات‌وچۆی ئەكردو لەناویدا ئەجوڵایەوە، كاتێك باوك‌و دایكەكە ماڵیان بەجێ ئەهێشت، خزمەتكارەكە ئەم منداڵە بێ تاوانەی ئەكردە باوەش‌و پاشان كرمێكی ئەهێناو ئەیخستە كونە لوتیەوەو كرمێكی تریشی ئەخستە كونە لوتەكەی تریەوەو هەموو ڕۆژێك ئەمەی دووبارە ئەكردەوە.. دایكەكە هەستی كرد منداڵەكەی وەكو جاران نیە، سست‌و لاواز

بوو بوو، هەروەها ئارەزووی یاری کردنو پێکەنینی نەبوو، زۆر حەزی لەخەو بوو، کاتێك لەخەو هەڵ دەستا، جارێکی تر ئەخەوتەوە، دایکی گومانی وابوو کەکچەکەی لەبەر ئەوە ماندوو خەواڵووە، چونکە بەڕۆژ لەگەڵ خزمەت کارەکەدا زۆر یاری ئەکات، بەڵام سستیو تەمبەڵی بوو بە سیفەتێکی هەمیشەیی، ڕۆژێك دایکەکە گوێی لەمنداڵەکە بوو لەخزمەتکارەکە ئەپاڕایەوەو ئەیووت: تکا ئەکەم بەیانی یەك دانەی تێ بکەو بەس، مەیکە کونە لوتەکەی ترەوە، دایکی نەیزانی خزمەتکارەکە چی ئەکاتە کونە لوتیەوە؟! بڕیاری دا ئەم شتە ئاشکرا بکات، کە ڕوونەدات لەوکاتەی ئەمان لەماڵ نین، توشی دڵەڕاوکێ بوو، گومانی لەلا دروست بوو، لەبەیانی ڕۆژی دوایدا، وای دەرخست کە ئەچێتە دەرەوە بۆ ئیشو کارەکانی وەکو هەمیشە، پاشان دوای کەمێك گەڕایەوە، بەبێ دەنگی یەکی تەواو، لەسەر سنگی پێ ئەڕۆیشت، وەستاو جوان گوێی لێگرت، گوێی لەدەنگی هند بوو لەچێشتخانەکەدا ئەپاڕایەوە، کە کرم نەخاتە لوتیەوەو بە پاڕانەوەوە ئەیووت: کە ئەم کارە ئازارم ئەدات.. بەڵام خزمەتکارە دڵڕەقەکە گوێی نەئەدایە پاڕانەوەکانی، لەباوەشیدا دایناو وویستی کرمەکە بکاتە لوتیەوە، هەروەك چۆن هەموو ڕۆژێك ئەمەی دەکردو ئیتر دایکەکە هەورە تریشقە ئاسا شیوەنو هاواری کردو کێشای بەسەر خزمەتکارەکەدا، تامنداڵەکە لەدەستی بسەنێو پێی بڵێ: ئەم منداڵە هیچ شتێك نازانێ لەژیان، چی لێکردووی؟ ئایا من ستەمێکم لێکردووی، هەتا ئەم کارە بکەی؟ بێ گومان کاتی لێپرسینەوەو بەزەیی نیە بەرامبەر تاوانبار، (هند) بێهێزو ڕەنگ زەردو لاواز بوو، بەدەنگێکی نزم قسەی ئەکرد کە نەئەبیسترا، دایکی وەك شێت دەرپەڕیو جگەر گۆشەکەی هەڵگرتو بەئۆتۆمبیلەکەی خێرا دەرچوو بۆ نەخۆشخانە، حەسرەتو پەشیمانی دڵی داگرتبوو، یەکسەر وێنەی تیشکیی بۆ دەماغە بچوکەکەی گیرا، کاتێك پزیشکەکە وێنەکەی بەرز کردەوە بۆلای ڕووناکی یەکە، کێشای بەسەری خۆیدا، چونکە کرم بەناو دەماغیدا هاتوچۆی ئەکرد، فرمێسك ڕوومەتی پزیشکەکەی تەڕکردبوو بەدایکی ووت: بەڕاستی بێ سوودە (هند) ئێستا وادەی مەرگی هاتووە!

دایکەکە گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو کچە بچوکەکەی بەباوەشەوە بوو، تادوایین هەناسەکانی ژیانی کۆتایی پێ بێت، بێ گومان (هند) مرد، ئەمە چ فەرامۆش کردنێکە؟! ڕاستە خزمەتکارەکە سزای خۆی وەرگرت... بەڵام (هند) تازە ناگەڕێتەوە بۆ لای دایكو باوکی...

## ئەحمەد

دایکی ئەحمەد، خانمێکە بەئەزموونێکی تاڵو بێ بەزمییانەدا تێپەڕیوە، لەگەڵ شۆفێرێکی داماڵراو لە مرۆڤایەتی، زۆر بەئاسانی پاکێتی ئەو منداڵەی لەناوبردو بووە هۆی کوشتنی، ئەحمەدی تەمەن چوار ساڵ، بەهاوەڵی شۆفێرێك ئەڕۆیشت بۆ ڕەوزە تایبەتیەکەی، شۆفێرەکە سوودی لەمە وەرگرتو هەستا بەدەست درێژی کردنە سەری‌و چەندان جار دووبارەی کردەوە، ڕۆژێك ئەحمەد لەهۆش خۆی ئەچێت، کاتێك ئەیگوازنەوە بۆ نەخۆشخانە، تەنها یەك هەفتە ئەمێنێتەوەو پاشان دەمرێت، هۆی مردنەکەشی ئەوەبوو شۆفێرەکە چەندان جار دەست درێژی کردبۆ سەر، هەرچەندە شۆفێرەکە بەسزای خۆی گەیشت بەڵام ئەحمەدیش ناگەڕێتەوە.

## هەیفا

لەرابردوودا بچوك بوو، بەڵام ئێستاکە گەنجەو تەمەنی بیست ساڵە، ئەویش هەیفایە، بەڵام گەنجێکە بەبێ ئاسودەیی، ئارەزووی لاوێتی لەچاوەکانیدا نیە، گەنجێکی خامۆش بەبێ داهاتوو، تەمەن شەش ساڵ بوو، لەخانویەکی گەورەدا ئەژیا لەگەڵ شۆفێرێك‌و خزمەتکارێك‌و باوکێکی سەرقاڵ‌و دایکێك کە فەرامۆشی کردبوو، لەتەمەنی شەش ساڵیدا شۆفێرەکەی بینی لەگەڵ خزمەتکارەکەدا لە حاڵەتێکی بەدو خراپدا، کاتێك بەمەیان زانی بڕیاریاندا تۆڵەی لێبکەنەوەو بۆی چوونە ژوورەوەو لە چەند دەقیقەیەکدا شۆفێرەکە بەیارمەتی خزمەتکارەکە، کارە قێزەونەکەی ئەنجامدا، تۆڵەیان لەم منداڵە کردەوەو پاشان ڕایان کرد، ئەمە ئەوە بەبیری هەموو دایك‌و باوکێکدا ئەهێنێتەوە کە هەیفا بچووك بوو، تەمەنی تەنها شەش ساڵ بوو، هەروەها بەتەنهاش بوو...

## موحەمەد

ئازارەکان بەردەوامە، ئەم منداڵە سێ ڕۆژی بەسەر برد، لەخانوویەکی کۆنی خراپدا، لە یەکێك لەگەڕەکە هەژار نشینەکاندا بەبێ نان‌و ئاو، لە حاڵەتێکی نێوان ژیان‌و مەرگ، دوای ئەوەی شۆفێرەکەیان‌و هاوڕێیەکی لاقەیان کردبوو، موحەمەد منداڵێکی وەرزشەوان بوو، وەرزشی مەلەی ئەکرد، ڕۆژانە لەگەڵ شۆفێرەکەیاندا ئەچوو بۆ یانەی وەرزشی،

تەندروستی وچالاکیەکی باشی هەبوو، ڕۆژێك لەکاتی گەڕانەوەی بۆماڵەوە، شۆفێرەکە بەموحەمەد دەڵێت: کە بچین بۆ سەردانی هاوڕێیەکی چونکە نەخۆشەو تەنها پێنج دەقیقە لای دائەنیشن و پاشان ئەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە.. موحەمەد ڕازی بوو، لە گەڵیدا ڕۆیشت، لەناو ئۆتۆمبیلەکەداو لەبەردەم ماڵەکە چاوەڕوانی ئەکرد، پاش کەمێك شۆفێرەکە گەڕایەوەو بەموحەمەدی ووت: هاوڕێکەم لەهۆش خۆی چووەو داوای لێ کرد لەگەڵیدا بیبەن بۆ نەخۆشخانە، موحەمەد باوەڕی کردو لەگەڵیدا چووە ژوورەوە بۆناو خانوەکە، بەڵام بەداخەوە تاسێ ڕۆژ لەو خانوەدا مایەوە، کاتێك دەرچوو لەڕووی دەروونی یەوە ڕوخابوو، هەروەها لەڕووی تەندروستیشەوە، بێگومان شۆفێرەکەو هاوڕێکەی دەست درێژیان کردبووە سەرو پاشان لەحاڵەتێکی زۆر خراپدا بەجێیان هێشتبوو، ئایا پەند وەرئەگرین...!

## نـــورا

دایە گەورەی زۆر پێدا گری ئەکرد کەبەتەنها لەگەڵ شۆفێرەکەدا نەڕوات بۆ قوتابخانە، تەمەنی شەش ساڵ بوو، بەڵام ستەم بەزەیی بەنورای بچوکیشدا نەهاتەوە.

ڕۆژێك دایکی نورا نەخۆش ئەبێت، بۆیە بەناچاری ڕازی ئەبێت ئەم منداڵە بەتەنها لەگەڵ شۆفێرەکەدا بچێت بۆ قوتابخانە، ئەم دەرفەتە ئەوە بوو، کەشۆفێرەکە چاوەڕێی ئەکرد، بۆئەوەی ئەم هەلەی لەدەست دەرنەچێت، نورا بۆ شوێنێکی چۆڵ دوور ئەخاتەوە، کەخەڵکی لێ نەبێت و ئارەزووی خۆی پێ بەتاڵ ئەکاتەوە بەشێوەیەکی هیچ و پوچ و دڕندانە، پاشان لەنزیك قوتابخانەکەی دای ئەنێ.

دوای ئەمە تەلەفۆنێك بۆ دایکی کراو داوایان لێ کرد یەکسەر ئامادەبێت، دایکەکە ڕۆیشت تامنداڵەکەی ببینێ، نورا خەڵتانی خوێن بوو بوو، بەهۆی دەست درێژیەکی دڕندانەوە، لەلایەن شۆفێرێکی ڕاکردووەوە.

## هـــەتان

لەوانەیە دیمەنێکی سەر سوڕهێنەر بێت، کاتێك باوك هەڵس و کەوتی سەیری منداڵەکەی ئەبینێ، وەکو ئەوەی لای باوکی هەتان ڕوویدا، کاتێك سەیری منداڵە سێ

ساڵەکەی ئەکرد، هەڵس‌وکەوتی نامۆ لەگەڵ دایکیدا ئەنجام ئەدات، ئەگەر لەسەرەتاشدا پێ کەنینی بەم هەڵس‌وکەوتانە هاتبێت، بەلام دوای ماوەیەك گومانی بۆ دروست ئەبێت‌وچاودێری منداڵەکەی ئەکات، لەکاتی لەماڵ نەبوونیدا، کاتێك ئەبینێ خزمەتکارەکە ئەم منداڵە بۆکاری سێکسی بەکارئەهێنێت‌و بەزمیی بەتەمەنەکەیدا نایەتەوە، ئەو خزمەتکارە هەڵئەسێت بەفێرکردنی بنەمای پەیوەندی نەشیاو، پەنا بەخودا لەم کارانە!!

## وەلـــــید

ئەمەش خزمەتکارێکی ترە توانیویەتی وەلید مل کەچ بکات بۆئارەزووەکانی، کە تەمەنی پانزە ساڵ بوو، توانی‌وەلید دیلی ئارەزووەکانی خۆی بکات، ئەم منداڵە سەرکەوتوو بوو، لەڕووی کۆمەلایەتییەوە، ژیان‌و خەڵکی خۆش ئەویست‌و ئەچووە دەرەوەو سەردانی کەس‌وکاری ئەکرد، بەلام لەدوای هاتنی ئەم خزمەتکارە، ڕەتی ئەکردەوە کەماڵەوە بەجێ بهێڵێت، لەگەڵ ماڵەوەیاندا وەکو جاران بۆ بۆنەو ئاهەنگەکان نەئەچووە دەرەوە، هەروەها ئەنجامەکانی خوێندنی بەرەو دواکەوتن ئەچوو، کەس‌وکاری ئاگایان لەهۆکاری ئەمە نەبوو، قەدەرەوای کرد کەباوکەکە بەم شتە بزانێت، کاتێك‌وەکو هەمیشە لەگەڵ خێزانەکەیدا ئەڕۆیشتن بۆ ئاهەنگێك، وەلید ڕەتی کردەوە لەگەڵیاندا بڕوات، بەبیانووی خوێندنەوە. باوکەکە شتێکی لەبیر چوو، پاش کەمێك گەڕایەوە، لەژووری خزمەتکارەکەدا ڕاستی کارەکەی بینی، کاتێك کوڕەکەی‌وخزمەتکارەکەی بینی کە سێیەمیان شەیتان بوو، وەلید لێدانێکی باشی بەدەستی باوکی بەرکەوت‌و خزمەتکارەکەش گەڕایەوە بۆ شارەکەی خۆی، بەلام ئایا کێشەکە کۆتایی پێ هات؟!

## ساراو سەماهیر

دایکەکەی تێبینی ئەوەی کرد، کاتێك کە خزمەتکارەکەی بانگ ئەکات دووکچە دوانەکەی ئەترسن، زۆر گرنگی بەم ترسە نەدا، چونکە ئەمان هێشتا منداڵن‌و تەمەنیان تەنها چوار ساڵە، بەلام ڕۆژێکیان دایکەکە لەهاواری یەکێکیان بەخەبەر هات، کەلە ژووری خزمەتکارەکە بوون بەخێرایی ڕۆیشت تابزانێت چی ڕوویداوە، یەکێك لەکچەکانی بینی

بەڕووتی لەبەردەم خزمەتکارەکەدا، کە ناچاری کردووە خراپە بکات، ئەوەی کەشیان چاوەڕێ ئەکات . ئەمە چ بەڵایەکە.....؟!

## عەبیر

دایکێکی تر قسە لەگەڵ کچەکەیدا ئەکاتوسۆزی بۆی هەیە، گفتوگۆکە بەئازارە، منداڵەکە تەمەنی پێنج ساڵانەوهەندێ شتی ئابڕوو بەر بۆدایکی ئەگێڕێتەوەکە خزمەتکارەکە لەگەڵیدا ئەنجامی داوەو داوای لەئەمیش کردووە کە لەگەڵیدا ئەنجامی بدات، دایکەکە کاتێك گوێی لەم قسانە بوو هاواری لێ بەرزبووەوە، خزمەتکارەکەی دەرکردوخۆی تەرخانکرد بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکەی.

## ئافرەتێکی سافیرەی نوێژنەکەر

یەکێك لەوئافرەتانەی کەهەڵئەستن بەشۆردنی مردوو ئەم چیرۆکە ڕاستەقینەیەمان بۆ ئەگێڕێتەوە وئەڵێت: لە یەکێك لەڕۆژەکاندا خێزانێك پەیوەندیان پێوەکردم، کە ئامادەبم بۆ شۆرینی ئافرەتێکی مردوو، ڕۆیشتم بۆلایان، چوومە ئەو ژوورەی کەمردووەکەی لێ بوو...

کەسوکارەکەی دەرگاکەیان لە سەرم داخستو کلیلیانداو بە تەنها لەژوورەکەدا مامەوە، کەوتمە گومانەوە، کە ئەم ئافرەتە لەوانەیە کوژرا بێت، لەدەرگاکەمدا بەڵام کەس لێی نەکردمەوە، ترسێکی زۆرم لێ نیشت، بۆئەوەی ئارام ببمەوە دەستم کرد بەخوێندنەوەی قورئانو دوعام ئەکرد، پاشان پشتم بەست بەخوداو دەستم کرد بەشۆرینی مردووەکەو هەموو شت ئامادە بوو، کاتێك ڕووخساری ئافرەتەکەم بەدەرخست، وەك خەڵوز ڕەش هەڵگەڕابوو، بۆ جارێکی تر ترس دایگرتمەوە، بەڵام بڕیارمدا بیشۆرم، لەبەر بەدەست هێنانی پاداشت، کاتێك دەستم کرد بەشۆرینی گۆشتی لاشەکەی پارچەپارچە ئەبووو هەڵئەوەری بەدەستمەوەو وەکو لۆکەوابوو، زۆر بەپەلە شۆریمو کفنم کردو تەواو بووم، بەڵام چۆن تەواو بوونێك؟!

پاشان لەدەرگاکەم دا بۆئەوەی لێمی بکەنەوە، باوەڕیان نەکرد کەشۆریبێتم، دڵنیام کردنەوە کەتەواو بووم لەشۆرینی، کاتێك دەرگاکەیان لێم کردەوە، زۆر بەپەلە دەرچووم و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، ماوەی سێ ڕۆژ خەوم لێ نەکەوتو ئەگریام، پاشان پەیوەندیم بەیەکێك لەزانایانەوە کردو ئەوەی بینیبووم بۆم باس کرد.

پێی‌ووتم: ڕەشیەکەی بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە نوێژنەکەر بوومو نوێژی نەکردووە، هەڵومرینی گۆشتەکەشی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بالاپۆش نەبووەو سفور بووە، پاش تەواو بوونی پرسەکە چوومەوە بۆ ماڵیانو پێم ووتن: ئەمەوێت بزانم بۆچی دەرگاکەتان لەسەر کلیلدام؟

ووتیان: پێش تۆ سێ ئافرەتی ترمان هێنا، کاتێك ڕووخساریان ئەبینی پەشیمان ئەبوونەوە لە شۆرینی، بۆیە دەرگاکەمان لە سەرداخستی بۆ ئەوەی بیشۆی.

پاشان پرسیارم لە حاڵی ئافرەتەکە کردو ووتیان:نوێژی نەئەکردو هەروەها بالاپۆشیش نەبوو.

خودایە کچانو ئافرەتانی موسوڵمان بپارێزی، خودایە پاشەڕۆژمان بەخێر بگێڕی.

## من لەسەقەر

لەیەکێك لەڕێگا خێراکانی شاری ڕیاز ئەم ڕووداوە ڕووی دا، سێ گەنج لەسەیارەیەکدا ئەبنو سەیارەکەیان وەردەگەڕێت، یەکسەر دووانیان گیان لەدەست ئەدەن، سێیەمیشیان لەکۆتای ژیانیدا ئەبێت، پۆلیسێکی هاتوچۆ کەئامادەی ڕووداوەکە ئەبێت ڕائەکات بۆلای‌و پێی ئەڵێت: کەبڵێ (لا إله إلا الله).. بەڵام بریندارەکە ئەڵێت من لەسەقەرم .. من لەسەقەرم، هەتا بەوحاڵەوە ئەمرێت، پەنا بەخودا، پۆلیسەکە پێی ئەڵێت: سەقەر چییە؟وەڵامی ئەداتەوە بەم ئایەتە:﴿ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبْقِي وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾ لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ ﴿٢٩﴾ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ ﴾المدثر. واتە: (ئەبێت بیگەیەنمە ناودۆزەخ، تۆ نازانیت دۆزەخ چیە، ؟ هیچ ئەندامێکت بەساغی ناهێڵێتەوەو دەست هەڵناگرێت، پێستیان هەڵئەقرچێنێ‌و دەری ئەخاتو ڕەشی ئەکات، نۆزدە فریشتە سەرپەرشتی دۆزەخ ئەکەن).

## جنێوی بەدین دا

لەسەر ڕێگای مەککە بۆ جدە ڕووداوێکی سەیر ڕووی دا، گێڕەرەوەی ڕووداوەکە ئەڵێت: کاتێك سەیارەیەکمان بینی‌و ووتمان با دابەزینو بزانین ئەو مرۆڤە حاڵی چۆنەو چی بەسەر دێت، کاتێك نزیك بوینەوە لێی لە کۆتایی ژیانیدا بوو، تەسجیلەکەی ئیشی ئەکرد

بەگۆرانی رۆژئاوایی پڕوپوچ، کوژاندمانەوەو سەرمان کرد خەریکە گیان ئەدات، وتمان فرسەتە بەڵکو خودای گەورە لەسەر دەستی ئێمە سەرفرازی دنیاو قیامەتی بکات.وتمان: بڵێ (لا إله إلا الله)، ئایائەزانی لەکۆتا ساتی تەمەنیدا چیووت؟! خۆزگە هەر قسەی نەکردایە، ووشەیەکی گەورەی ترسێنەری بەدەمدا هات، جنێوی بەدینی خودای گەورەدا.!! پەنا بەخودا لەسەر شۆڕیو کۆتا خراپی..

## لە بانکۆك*

ئەمەش گەنجێکە لەوگەنجە لادەرانەی کە سەفەر ئەکەن بۆ بانکۆك بەنیازی داوێن پیسیو خراپە.

بەسەرخۆشی چاوەڕێی ئافرەتە دۆستەکەی ئەکرد، سەعاتێك لەوادەی خۆی دواکەوت، پاشان هاتو دەرکەوت، کاتێك بینی کڕنوشی بۆ ئافرەتەکە برد، بەڵام هەرگیز هەڵنەسایەوەو ژیانی کۆتایی پێ هات.. پەنا بەخودا..

## پاشکـــــۆ

ئەو ئایەتانەی لە چارەسەری سیحردا ئەخوێنرێت:

پێویستە دەست بخەیتە سەرسەری ئەو کەسەی سیحرو جادووی لێکراوەو بەدەنگەوەو بەجوانی (ترتیل) بە گوێیدا سێ جار بڵێی: ﴿ أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾ من همزه ونفخه ونفثه ﴾ پاشان ئەم ئایەتانە بخوێنیت، ئومێدەوارین خودای گەورە بیان کات بە شیفا، بۆ ئەوانەش کە نەخۆشن یان دڵ تەنگن یاخود نەخۆشی دەروونیان هەیە ـ آمین ـ

---

* لە کتێبی (أهل النار)ی نووسەرەوە وەرگیراوە.

١- ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿١﴾ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤﴾ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧﴾ ﴾ الفاتحة. !!

٢- ﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ۛ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ ۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥﴾ ﴾ البقرة.

٣- ﴿ وَٱتَّبَعُوا۟ مَا تَتْلُوا۟ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَٰنَ ۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُوا۟ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَ ۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ۚ وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ۚ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ البقرة.

٤- ﴿ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾ إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِى تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿١٦٤﴾ ﴾ البقرة.

٥- ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ۚ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ۚ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَىْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ ۚ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا ۚ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾ ﴾ البقرة.

٦ـ ﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَعَلَيۡهَا مَا ٱكۡتَسَبَتۡۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذۡنَآ إِن نَّسِينَآ أَوۡ أَخۡطَأۡنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرًا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلۡنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦۖ وَٱعۡفُ عَنَّا وَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَآۚ أَنتَ مَوۡلَىٰنَا فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَـٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾ ﴾ البقرة.

٧ ـ ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِۚ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٨﴾ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَـٰمُۗ وَمَا ٱخۡتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَـٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿١٩﴾ ﴾ آل عمران.

٨ ـ ﴿ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعًا وَخُفۡيَةًۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿٥٥﴾ وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَـٰحِهَا وَٱدۡعُوهُ خَوۡفًا وَطَمَعًاۚ إِنَّ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾ الاعراف.

٩ ـ ﴿ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَلۡقِ عَصَاكَۖ فَإِذَا هِيَ تَلۡقَفُ مَا يَأۡفِكُونَ ﴿١١٧﴾ فَوَقَعَ ٱلۡحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١١٨﴾ فَغُلِبُواْ هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُواْ صَـٰغِرِينَ ﴿١١٩﴾ وَأُلۡقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَـٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلۡعَـٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَـٰرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾ الاعراف. حەوت جار .

١٠ـ ﴿ وَأُلۡقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَـٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾ ﴾ الاعراف . (٣٠) جار .

١١ ـ ﴿ فَلَمَّآ أَلۡقَوۡاْ قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئۡتُم بِهِ ٱلسِّحۡرُۖ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبۡطِلُهُۥٓۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصۡلِحُ عَمَلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٨١﴾ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَـٰتِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٨٢﴾ فَمَآ ءَامَنَ لِمُوسَىٰٓ إِلَّا ذُرِّيَّةٌ مِّن قَوۡمِهِۦ عَلَىٰ خَوۡفٍ مِّن فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِمۡ أَن يَفۡتِنَهُمۡۚ وَإِنَّ فِرۡعَوۡنَ لَعَالٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿٨٣﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ يَـٰقَوۡمِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيۡهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسۡلِمِينَ ﴿٨٤﴾ ﴾ يونس. (٧) جار بەلاّم ووشەی ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبۡطِلُهُۥٓ ﴾ (٧٠) جار دووبارە بکرێتەوە .

١٢ ـ ﴿ وَأَلۡقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلۡقَفۡ مَا صَنَعُوٓاْۖ إِنَّمَا صَنَعُواْ كَيۡدُ سَـٰحِرٖۖ وَلَا يُفۡلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيۡثُ أَتَىٰ ﴿٦٩﴾ ﴾ طه . (٧) جار.

١٣ ـ ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١١٧﴾ وَقُل رَّبِّ ٱغْفِرْ وَٱرْحَمْ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١١٨﴾ ﴾ المؤمنون.

١٤ ـ ﴿ وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفًّا ﴿١﴾ فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجْرًا ﴿٢﴾ فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكْرًا ﴿٣﴾ إِنَّ إِلَٰهَكُمْ لَوَٰحِدٌ ﴿٤﴾ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ ٱلْمَشَٰرِقِ ﴿٥﴾ إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ ﴿٦﴾ وَحِفْظًا مِّن كُلِّ شَيْطَٰنٍ مَّارِدٍ ﴿٧﴾ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰ وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ﴿٨﴾ دُحُورًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ ﴿٩﴾ إِلَّا مَنْ خَطِفَ ٱلْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ ثَاقِبٌ ﴿١٠﴾ ﴾ الصافات.

١٥ ـ ﴿ وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟ ۖ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُوا۟ دَاعِىَ ٱللَّهِ وَءَامِنُوا۟ بِهِۦ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِىَ ٱللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٢﴾ ﴾ الاحقاف.

١٦ ـ ﴿ يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا۟ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ فَٱنفُذُوا۟ ۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَٰنٍ ﴿٣٣﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٤﴾ يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴿٣٥﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٦﴾ ﴾ الرحمن.

١٧ ـ ﴿ لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ۖ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ ٱلْمُهَيْمِنُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٢٣﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ٱلْمُصَوِّرُ ۖ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٤﴾ ﴾ الحشر.

١٨ - ﴿ قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَقَالُوٓا۟ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ۝١ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا ۝٢ وَأَنَّهُۥ تَعَٰلَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا ٱتَّخَذَ صَٰحِبَةً وَلَا وَلَدًا ۝٣ وَأَنَّهُۥ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى ٱللَّهِ شَطَطًا ۝٤ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن تَقُولَ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ۝٥ وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ۝٦ وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا۟ كَمَا ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَبْعَثَ ٱللَّهُ أَحَدًا ۝٧ وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدْنَٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ۝٨ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمْعِ ۖ فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْـَٔانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا ۝٩ ﴾ الجن.

١٩ - ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ۝٤ ﴾ الإخلاص.

٢٠ - ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ۝١ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ۝٢ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ۝٣ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ۝٤ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ۝٥ ﴾ الفلق.

٢١ - ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ۝١ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ۝٢ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ۝٣ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ۝٤ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ۝٥ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ۝٦ ﴾ الناس.

**هەروەها ئەشتوانرێت ئەم چوار سورەتە بخوێنرێت، یان لەبەر کاسێت گوێی لێ بگیرێت (الصافات - يس - الدخان - الجن)**

**شەش ئایەتیش هەیە لە قورئانی پیرۆزدا کەووشەی (شفاء )یان تێدایە، (إن شاء الله) ئەبێتە شیفا بۆ نەخۆشەکانمان:**

١- ﴿ قَٰتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ ۝١٤ ﴾ التوبة.

٢ - ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۝٥٧ ﴾ يونس.

٣- ﴿ ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًاۚ يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٦٩﴾ ﴾ النحل.

٤- ﴿ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ ﴾ الشعراء.

٥- ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَۙ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ ﴾ الإسراء.

٦- ﴿ وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓۖ ءَا۬عْجَمِيٌّ وَعَرَبِيٌّۗ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌۖ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِيٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًىۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٤٤﴾ ﴾ فصلت.

# ناوەرۆک

# تصريح

نحن دار ابن حجر بدمشق:

نسمح بطباعة كتاب «ضحايا الشيطان»

باللغة الكردية فقط لصالح مكتبة «محوي» في العراق

لصاحبها الأستاذ حكيم سليم أحمد.

وهو وكيلنا الوحيد في العراق

ولا يحق لدارٍ أخرى في العراق وغيرها أن تطبع

هذا الكتاب أو جزءًا منه بأي وسيلة كانت

لذا فإن هذه النسخة هي النسخة الشرعية فقط

وباقي النسخ غير شرعية إن وجدت.

٥/ رمضان/ ١٤٣٠ هجرية

صاحب دار ابن حجر

يوسف الحاج أحمد

# قوربانیەکانی شەیتان

## برای بەڕێز، خوشکی ئازیز:

* ئەم کتێبە بخوێنەرەوە پێش ئەوەی ببیت بە قوربانی.
* بیخوێنەرەوە، بەختەوەر ئەو کەسەیە پەند لە کەسانی تر وەربگرێت.

ئەوە شەیتانەو زۆر بە بێ شەرمو بە بێ ترس بەرامبەر بە خودای گەورە پیلانە پیسو گلاوەکانی بۆ گومڕاکردنی نەوەکانی ئادەم خستەڕوو، هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت:

(قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٤٠﴾) الحجر.

دڵنیاش بە دوژمنایەتیەکەی بەردەوام دەبێت تا ڕۆژی دوایی، هەر لە یەکەم ڕۆژەوە کاتێك باوکە ئادەمی بینی، ڕقو کینەو دوژمنایەتیەکەی دەستی پێکرد، کاتێکیش هاتنە سەر زەوی دەستی کرد بە دارشتنی پیلانەکانیو بەردەوام لە هەوڵدا بوو بۆ خراپکردنی نەوەکانی ئادەم.
شەیتان بوو باوکە ئادەمی بە دەرکردن دا، هەروەها هابیلی بە قابیل بە کوشتدا، بتپەرستی لەلای قەومی نوح جوانکردو بۆی ڕازاندنەوە.
هەر شەیتانە هەوڵ دەدات موسڵمانان لە ڕێگەی ڕاستی ئیسلام لابداتو بیانکات بە هاوەڵی ئاگر (إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمۡ عَدُوّٞ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدۡعُواْ حِزۡبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾) فاطر.
براو خوشکی موسڵمان ئاگاداربە لە کۆمەڵو گرۆهی شەیتان نەبیت، چونکە خەسارەتمەندی دونیاو دوارۆژ دەبیت.
هیواخوازین ئەم کتێبە چەكو قەڵغانێك بێت بۆ ئەوەی خۆت لە پیلانو فێڵەکانی شەیتان پێ بپارێزیت.

لەسەر ئەرکی کتێبخانەی مەحوی چاپکراوە